# مێژووی هزری سیاسی
# لە رۆژئاوا

(( سەدەی بیستەم ))

## بەرگی سێیەم

نووسینی

د. کەمال پوولادی

وەرگێڕانی

ئازاد وەڵەدبەگی        سیروان جەبار زەندی

کوردستان - هەولێر
٢٠٠٥



**ناوی کتێب: مێژووی هزری سیاسی لە رۆژئاوا**

– نووسینی: د. کەمال پوولادی
– وەرگێڕانی: ئازاد وەڵەدبەگی – سیروان جەبار زەندی
– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
– بەرگ: هۆگر سدیق
– پیتچنین: محمد مامند
– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
– بەرگی سێیەم
– تیراژ: ١٥٠٠ دانە
– ژمارەی سپاردن: ٦٧٦
– چاپی یەکەم ٢٠٠٥
– نرخ: ٣٠٠٠ دینار
– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە



زنجیرەی کتێب – ٤٣ – (١٤٦)

**ناونیشان**
**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: 2260311
www.mukiryani.com





# ناوەڕۆك

# پێشەکی

## د. کەمال پوولادی نووسەری کتێب بۆ وەرگێڕەکان   ٨٤/١/٢٧

**بەڕێز کاك ئازاد وەڵەدبەگی**

بۆ من ئەمە هەستێکی زۆرباشە کە کتێبەکەم وەرگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی و برایانی کوردم دەتوانن ئەم کتێبە بە زمانی خۆیان بخوێننەوە بە تایبەت زۆرخۆشحاڵم کە ئەم کتێبە لە کاتێکدا دەکرێت بە کوردی کە هەوڵەکانی گەلی کورد بۆ بەدیهێنانی مافە دیموکراتییەکانی خۆیان بەرهەمێکی نوێی هەیە و پێی ناوەتە قۆناغێکی نوێوە. هیوادارم گەلی کورد لە پاڵ برایانی دیکەی خۆیاندا وەك ئێرانی، عەرەب و تورك بە ئاشتیانە ڕێگای پێشکەوتنی نەتەوەیی بڕن و ببنە مۆدیلێك لە ژیانی نوێی دیموکراتی بۆ هەموو گەل و نەتەوەکانی دەڤەرەکە.

من کتێبی هزری سیاسیم وەك پرۆگرامێکی خوێندن بۆ بەشی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆکانی ئێران نوسیوە ئەم پرۆگرامی خوێندنە بریتییە لە سێ وانەی دوو بەشی بۆ سێ کۆرسی (تێرم) یەك لە دوای یەك کەتێیدا هزری سیاسی ڕۆژئاوا لە چوارچێوەی گشتێتی خۆیدا و لە ڕێڕەوی مێژووییدا بە قوتابیانی قۆناغی بەکالۆریۆس دەناسێندرێ. پرۆژەی سێ بەرگ بوونی کتێبەکە پێوەندی بەم مەبەستەوە هەیە.

لە نووسینی کتێبەکەدا هەوڵم ئەوە بووە کە وێڕای خستنەڕووی پرسەکان چەند خاڵێك لەبەرچاوبگرم، یەکێك لەم خاڵانە بریتییە لە ڕەنگدانەوەی پێکەوەلکاویی هزری سیاسی ڕۆژئاوا کە وێڕای کامڵبوونی بە درێژایی قۆناغەیەك لە دوای یەکەکان کاریگەری لە فاکتەرە جۆراوجۆرە مێژووییەکان وەرگرتووە. خاڵێکی تر هەوڵدانە بۆ ڕەنگدانەوەی هزری تیۆردارێژان وەك دەزگایەکی هزریی هاوئاهەنگ.



هەرچەندە ئەو دەرفەتەی کە بۆ ئەم کارە لە بەردەممدا بوو زۆر بەربڵاو نەبوو بەڵام ئەو پەڕی هەوڵی من ئەوە بوو کە گرنگترین بەشەکانی هزری ئەم بیرمەندانە وەکوو دەزگایەکی هزری کەم و زۆر هاوئاهەنگ بناسێنم و بە پێچەوانەی شێوازی باو قەناعەت بە ئاماژەکردنی پەراکەندە دەربارەی هزرەکانی ئەم و ئەو نەکەم.

لە کۆتاییدا پێویستە لە هەندێ خاڵ لە لایەن پەخشی مەرکەزەوە ئاگادارتان بکەم کە پێوەندی بە کاروباری پیشەیی پەخشەوە هەیە.

یەکەم ئەوەیە کە داوا دەکەم نامەیەکیش بۆ پەخشی مەرکەز بنووسن و مۆڵەتی ئەوان وەکوو بڵاوکەرەوەی ئەم کتێبە وەربگرن. خۆشحاڵم لەوە ئاگادارتان بکەمەوە کە ئەم بەڕێزانە لە هاوکاری کردنی ئێوە درێخی ناکەن.

ئەویتر ئەوەیە کە پەخشی مەرکەز تەنها مۆڵەتی وەرگێڕانی ئەم کتێبەی بۆ زمانی کوردی و بڵاوکردنەوەی لە کوردستان لەبەرچاو گرتووە و هەروەرگێڕان و بڵاوکردنەوەیەکی تر پێویستی بە مۆڵەتی ئەم ناوەندە هەیە.

هەروا هیوادارم کە پاش چاپ بوونی کتێبەکە بە زمانی کوردی چەند نوسخەیەکیش بۆ من و پەخشی مەرکەز بنێرن تابێتە هۆی خۆشحاڵی و ڕێزگرتن لە زەحمەتەکانی ئێوە.

بە ئومێدی سەرکەوتن بۆ ئێوە

**کەمال پوولادی**

**٨٤/١/٢٧**

**٢٠٠٥/٤/١٧**

# بەرایی

**خوێنەری هێژا.....**

ئەم کتێبەی کە لەبەر دەستتدایە بەرگی سێهەم و دوا بەرگی کتێبی ((مێژووی هزری سیاسی لە رۆژئاوا))یە. خۆشحاڵین بەوەی کە بە ئەنجامدانی ئەم کارە بچووکە توانیبێتمان رەزامەندی خوێنەرانی تامەزرۆی بابەتە هزرییەکان بە دەستبهێنین و خزمەتی کتێبخانەی کوردی بکەین.
ئاشکرایە کە ئێمە بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی کوردی وەك ئەرکێکی رۆشنبیری و بۆ رێزگرتنی لە مافی نووسەری بەرێز د. کەماڵ پوولادی و پەخشی مەرکەز کە کتێبەکەی بلاوکردۆتەوە پێوەندیمان بە پەخشی مەرکەزەوە کرد لە تاران. خۆش بەختانە نووسەری کتێب جەنابی د. پوولادی و بەرپرسی پەخشی مەرکەز بە دوو نامەی جوان و پڕ لە میهر جگە لە دەربڕینی خۆشحالّی خۆیان بۆ وەرگێرانی کتێبەکە بۆ زمانی کوردی، مۆڵەتی وەرگێڕان و بلاوکردنەوەشیان وەك دیاری پێ بەخشیون کە جێی خۆیەتی لێرەدا سوپاسی خۆمانیان ئاراستەبکەین و دەست خۆشانەیان لێبکەین. پێویستە ئەوەش بلێم کە جەنابی کاك بارام وەڵەدبەگی بۆ وەرگرتنی ئەم مۆڵەتە و رەخساندنی هەلی پێوەندی بەوپەڕی دلسۆزییەوە هاوکاری کردین و پێمانەوە ماندووبوو کە ئەوپەڕی سوپاسیان ئاراستەدەکەین.
شیاوی ئاماژە پێکردنە کە دەبوایە ئەم پێشەکییەی د. پوولادی و مۆڵەتی پەخشی مەرکەز هەر لەگەڵ بلاوبوونەوەی بەرگی یەکەمی کتێبەکە بلاو بکرێتەوە بەلام لە بەرەدرەنگ گەیشتنی نامەکان لەگەڵ ئەم بەرگەدا دایدەگرین و داوای لێبوردنیش لە د. پوولادی و پەخشی مەرکەز و خوێنەران دەکەین.
لە کۆتاییدا دەرگای دڵمان ئاوەڵایە بۆ پێشوازی کردن لە هەر رەخنەو پێشنارێکی بە سوودی دۆستان و خوێنەرانی هێژا و داوای لێبوردنیش دەکەین لە هەر کەموکورییەك کە روویدابێت لەم کتێبەدا.

**ئازاد وەڵەدبەگی – سیروان جەببار زەندی**
**٢٠٠٥/٧/١٣**
**awaladbagi2002@yahoo.com**



# جناب اقای ازاد ولدبیگی

برای من این احساس بسیار خوبی است که کتابم به زبانی کردی ترجمه‌ی شود و برادران کردم می‌توننداین کتابرا به زبان خودشان بخوانند. بەویژه بسیار خوشحالم که‌این کتاب درزمانی به کردی ترجمه‌می شود که تلاش های مردم کرد برای حقاق حقوق دموکراتیك خود ثمرات تازه ای داده است ووارد مرحله تازه‌ی می‌شود. امیدوارم مردم کرد درکنار سایر برادران خود اعم ازایرانی، عرب و ترك بامسالمت راه اعتلای قومی راطی کنند و الگویی از زندگی نوین دموکراتیك برای تمام اقوام و ملتهای منطقه باشند.

کتاب اندیشه سیاسی رامن برای یك برنامه‌درسی در رشته علوم سیاسی در دانشگاه‌های ایران نوشنه‌ام این برنامه درسی شامل سه‌درس دو واحدی برای سه‌ترم متوالی است که‌طی‌ان اندشه‌های سیاسی غرب درکلیت ان و درسیر تاریخی ان برای دانشجویان دوره کارشناسی معرفی می‌شود. طرح سله جلدی کتاب با این منظور ارتباط دارد.

درتدوین کتاب تلاشم این بوده‌است که ضمن طرح ساده مسایل چندنکته رامد نظردانشه باشم یکی ازاین نکات انعکاس پیوستگی اندیشه سیاسی غرب ضمن تکامل ان طی دوره های متوالی و تاثیربذیری ان ازعوامل گوناگون تاریخی است. نکته دیگر تلاش درانعکاس اندیشه نظریه پردازان به صورت یك دستگاه فکری هماهنگ است. گرچه مجالی که برای این کارد اشتم چندان گسترده نبود امانهایت تلاش من ان بوده که مهترین اجزاء اندیشه این اندیشمندان را صورت یك دستگاه فکری کم و بیش منسجم معرفی کنم و برخلاف شیوه معمول به ابه‌شارات پراکنده درباره اندیشه‌های این وان اکتفانکنم.





دراخر لازم است نکاتی  را ازجانب نشر مرکز به اطلاعتان برسانم که به مسایل حرفه‌ای نشر مربوط می شود. نخت انکه خواهشمندم نامه‌ای نیزبرای نشر مرکز بنویسید واجازه انها رابه عنوان ناشر کتاب مذکور دریافت دارید. خرسندم به اطلاعتان برسانم که این عزیران در همکاری باشما هیچ دریغی ندارند.

دیگراینکه نشر مرکز اجازه ترجمه کتاب مذکور رافقط برای زبان کردی و انتشار در کردستان درنظر گرفته و هرترجمه دیگر نیاز به اجازه این ناشردارد.

درضمن امیدوارم به محض نشر کتاب به زبان کردی نسخ هایی را برای من و نشر مرکز بفرستید تاموجب خوشحالی وامتنان از زحمت های شماشود.

**باارزوی موفقیت برای شما**

**کمال پولادی**

**۸٤/۱/۲۷**

# پاژی یەکەم

## چۆنیەتی دروستبوونی ڕێچکە مارکسیستییەکان

### پێشەکی

لە دوایین پاژی بەرگی دووەمدا چەند باسێکمان تایبەت کرد بە هزری سیاسی مارکس. لەوێدا ئاشنابووین بە بەشێکی گرنگی بنەما هزرییەکانی مارکس. لە سەدەی بیستەمدا هزری مارکس شەپۆلێکی گەورەی بیرکردنەوە و تیۆرداڕێژیی بە دەوری خۆیدا دروستکرد. بەشێکی زۆری بیرمەندان لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانستی سیاسیدا سوودیان لە بنەما هزرییەکانی مارکس وەرگرت و کەوتنە فراوانکردن و لێکدانەوە و نوێکردنەوەی هزرەکانی ئەو بەپێی وەرچەرخانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و پێشکەوتنەکانی مەعریفەی کۆمەڵایەتی و بۆچوونە هزری و ئایدیۆلۆژییەکان بەرەو قۆناغێکی نوێیان برد. بەم جۆرە بوو کە مارکسیزم گۆڕا بۆ تەوژمێکی گەورەی هزری کە سنووری هزرەکانی خودی مارکسیشی تێپەڕاند. بۆیە مارکسیزم بۆ خۆی تەوژمێکی هزری تایبەتە و هەرچەند پەیوەستە بە هزری مارکسەوە بەڵام مەرج نییە لەگەڵ ئەودا یەکسان بێت. بیرمەندانی پەیوەست بە بنەماکانی فەلسەفەی مارکس لە بواری داهێنانە هزریەکاندا هەستاون بە نوێکاری و پیاچوونەوە و نوێکردنەوەی بەرچاو لەم بوارەدا، تا ئەو جێیەی کە لە چەند بارێکدا زۆر لە هەندێك لە بنەماکانی دووركەوتوونەتەوە. بە هەرحاڵ سەدی بیستەم گەشانەوەیەکی بەرچاوی لە بوارێکی هزریدا بە خۆیەوە دیوە کە بە ناوی مارکسەوە ناسراوە و بە «مارکسیزم» ناو دەبرێت. لە باسەکانی دواتردا ئاشنا دەبین بە هەندێك لە سەرەکی ترین ڕێچکە و بۆچوونەکانی مارکسیزم.



## هۆکارەکانی گەشەکردنی مارکسیزم

## بۆ چەند لق و ڕێچکەیەکی جیاواز

ئەوەی کە بە ناوی مارکسیزمەوە دەناسرێ لە سەدەی بیستەمدا دابەشدەبێت بۆ چەند لق و ڕێچکەیەکی جیاواز. هەندێ کات ئەم ڕێچکانە لەگەڵ یەك و هەندێکیان لە بنەما هزرییەکانی خودی مارکسیش دووردەکەونەوە. ئێمە لێرەدا بە کورتی هەندێك لە گرنگترین ئەو ڕێچکانەی کە پەیوەستن بە تەوژمی ناسراو بە مارکسیزمەوە دەخەینە ڕوو. سەرەتا لەم باسەدا ئاماژەیەك دەکەین بەو هۆکارانەی کە ڕۆڵیان هەبووە لە گەشەکردنی مارکسیزم بۆ چەند لق و دەستەیەکی جۆرا و جۆر. دەتوانین ئەم بەڵگانەی خوارەوە بە گرنگترین بەڵگەکانی گەشەکردنی مارکسیزم دابنێین بۆ چەند ڕێچکەیەکی جیاواز:

١- وەرچەرخانە مێژووی و کۆمەڵایەتییەکان کە بابەتگەلێکی نوێیان خستە بەردەم بیرمەندان و تیۆریداڕێژان و بزووتنەوەکانی سەر بە مارکسیزم. یەکێك لە لایەنە گرنگەکانی وەرچەرخانە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانی پاش مەرگی مارکس بریتی بوو لە بەردەوامی سیستەمی سەرمایەداری و دروستبوونی چەند گۆڕانێکاریەکی گرنگ لە تایبەتمەندییەکانی سەرمایەداری ماوەی سەدەی بیستەم کە چاوەڕوانییەکانی مارکس و مارکسیزمەکانی لە سەرەو ژێرکردنی سیستەمی سەرمایەداری بە نائومێدی هێشتەوە. هەروەکو وتمان مارکس بەپێی یاسامەندیی ڕەوتی مێژوو بەو جۆرەی کە خۆی خستبوویەڕوو و بە لەبەرچاوگرتنی دیارخەرەکانی سەرمایەداری نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم لە ناوبردنی سیستەمی سەرمایەداری و دروستبوونی سیستەمی سۆسیالیستی لە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیدا بەڕابەری چینی کرێکاری بە دوورنەدەزانی، بەڵام سەدەی بیستەم شتێکی دیکەی جیاواز لە پێشبینییەکانی مارکسی خستەڕوو.





٢- بێ توانایی مارکسیزمی کلاسیك یاخود ئەوەی کە بە مارکسیزمی «ئۆرتۆدۆکس» ناسراوە لە لایەن دیارترین هاوەڵان و هاوبیرانی مارکسەوە لە روونکردنەوەی وەرچەرخانە مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسییە نوێیەکاندا تەشەنەی کرد. جگە لە بەردەوامی سیستەمی سەرمایەداری، یەکێکی تر لەو وەرچەرخانانە بریتی بوو لە گۆڕانکارییە بەر چاوەکانی رۆڵی دەوڵەت یاخود هەروەکو مارکسیستەکان دەڵێن دەوڵەتی بۆرژوازی. دەوڵەتی بۆرژوازی چەند رۆڵێکی نوێی گرتە ئەستۆ و پێگەیەکی نوێی بەدەست هێنا لە سیستەمی کاروبارەکاندا کە زۆر نەدەگونجا لەگەڵ بۆچوونە ساکارەکانی مارکسیستە کلاسیکییەکاندا.

٣- گۆڕانی بارودۆخ و وەرەی چینی کرێکار کە مارکس بە بکەری شۆڕش و بکەری مێژووی نوێ ناوی بردبوو. چینی کرێکار تائاستێکی زۆر گونجانی خۆی نیشاندا لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری لە فۆرمە نوێیەکانیدا و بە نسبەت سەدەی نۆزدەهەمەوە گیانی شۆڕشی ئەم چینە بەرەو ئاوابوون هەنگاوی نا.

٤- توانای ئایدۆلۆژیایی هزری مارکس و راکێشانی بەرەو بوارە جۆرا و جۆرەکانی بۆچوونە شۆڕشگێڕییەکانی و سوود لێوەرگرتنی بۆ بزووتنەوە شۆڕشگێڕ و جموجۆڵە نوێسازییەکان، بوونە هۆی ئەوە کە بزووتنەوە گەلێکی کۆمەڵایەتی زۆر هەر لە روسیاوە بگرە هەتا چین و کوبایش لێکدانەوە گەلێکی مارکسیزم وەکو ئاراستەی ئایدیۆلۆژی کاری خۆیان ستراتیژی ململانێی خۆیان دەستنیشانبکەن.

٥- کورتی و ناڕوونی هەندێك لە فۆرمولبەندییە کلیلییەکانی مارکس. داهێنانە تیۆرییەکەی مارکس لە شیکردنەوەی مێژوو و کۆمەڵگاو کامڵبوونی کۆمەڵایەتی و رەوت و سروشتی ژیانی مرۆیی وەکو هەموو داهێنانێکی تری مێژووی زانست و هزر هێشتا تۆزی ناڕوونی و کورتی بەروخسارییەوە مابوو و دەبوو لە لایەن بیرمەندانی دواترەوە روون بکرێتەوە و چاکسازی تیادابکرێت. خودی مارکسیش





تەنها لە کتێبی سەرمایەدا و لەکاتی توێکاریکردنی سیستەمی سەرمایەداریدا توانیی فۆرمۆلبەندیە ماتریالیستەکانی خۆی بەکاربهێنێ، بەڵام تەمەنی بەشی بەرەوپێشبردنی هەموو پرۆژەکانی نەکرد. رەخنەگەلێکی جیاواز چ لە ناوەوەی تەوژمی مارکسیستی و چ لە دەرەوەیدا ئاراستەی تیۆرییەکانی مارکس و یەکەم مارکسیستەکان کراوەکە رۆڵێکی باشیان هەبوو لە کامڵبوونی ئەم تەوژمە هزرییە. جگە لەمە ناڕوونییەکانی هەندێك لە دوکترینە سەرەکییەکانی مارکسیش بەش بە حاڵی خۆیان زەمینەیەکیان دروستکرد بۆ لێکدانەوە جۆراو جۆرەکان.

## تەوەرە سەرەکییەکانی ناکۆکی بۆچوون و لێکجیابوونەوەی مارکسیزم

سەرهەڵدانی لقی و رێچکە جیاوازەکانی مارکسیزم لە لایەکەوە رەنگدانەوەی وەچەرخانە کۆمەڵایەتی و بۆچوونە ئایدۆلوژییەکانی قۆناغە جیاوازەکانە و لە لایەکی ترەوە دەگەڕێتەوە بۆ لێکدانەوە و تێگەیشتنە جیاوازەکانی هەندێك لە دوکترینە سەرەکییەکانی تیۆرییەکەی مارکس. تائەو جێیەی کە پەیوەستە بە لێکدانەوەی تێگەیشتنە جیاوازەکانەوە دەتوانین بڵێین ئەو شتەی کە وەکو پەیوەندی ژێرخان و سەرخان، بە یەکێك لە پایەکانی ماتریالیزمی مێژووی و کۆمەڵناسی سیاسی مارکس ناسراوە چەقی زۆربەی بۆچوونە ناکۆکەکانە. لە بۆچوونی ناکۆکی لێکدانەوەی ئەم دوکترینە بۆچوونگەلێکی ناکۆکی تر دروستدەبێت کە بەش بەحاڵی خۆیان لە دوکترینە سەرەکییەکانی تیۆری مارکسن. گرنگترینیان بریتین لە:

١- رۆڵی ململانێی چینایەتی لەوەرچەرخانی مێژوو و لە پەڕینەوە لە سەرمایەدارێتییەوە بەرەو سۆسیالیزم. هەروەکو باسمانکرد لایەنێك لە ماتریالیزمی مێژوویی مارکس ئاماژە بەرۆڵی چینە کۆمەڵایەتییەکان و ململانێی چینایەتی

دەکات لە وەرچەرخانی سیستەمە مێژووییەکان و تێپەڕین لە سیستەمێکەوە بەرەو سیستەمێکی تر. بۆ نموونە سیستەمی فیۆدالی بە هۆی ململانێی بۆرژوازی و جوتیارەکان لەگەڵ فیۆدالەکان و سیستەمی موڵکداری و ئیمتیازە فیۆدالییەکان گۆڕانی بەسەردا هات و لە کۆتاییشدا لەناوچوو، دەبێت سیستەمی سەرمایەداریش لە ڕێگەی ململانێی چینی کرێکار لەگەڵ موڵکداری سەرمایەداری و بەهرەکێشی سەرمایەدارانە بە لاوەبنرێت. ئەزموونە مێژووییەکانی سەدەی بیستەم و لەوانە لەناوچوونی ڕۆڵی چینی کرێکار پرسیارگەلێکی گرنگی سەبارەت بە ڕۆڵی چینی کرێکارو دوکترینی ململانێی چینایەتی دروستکرد.

٢- بابەتی پەڕینەوە بەرەو سۆسیالیزم و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و تێڕوانینی دیموکراتی یاخود بە وتەی مارکسیستەکان دیموکراسی بۆرژوازی. ئەو بابەتی کە لێرەدا خۆی وەدیاردەخات ئەوەیەکە ئایا پەڕینەوە بەرەو سۆسیالیزم وەکو پێویست هاوکات دەبێت لەگەڵ شۆڕشدا بە تایبەتی شۆڕشی پڕ لە توند و تیژی؟ ئایا پەڕینەوە بەرەو سۆسیالیزم بەبێ دیموکراسی دێتە دی؟ دەبێ هەڵوێستی مارکسیستەکان سەبارەت بە دیموکراسی بۆرژوازی چۆن بێت؟ ئایا وەکو پێویست سەقامگیری سۆسالیزم هاوکات دەبێت لەگەڵ دیکتاتۆری (بەواتای حکوومەتی چینایەتی پرۆلیتاریا) دا؟

٣- ڕۆڵ و پێگەی دەوڵەتی سەرمایەداری. لە بەرهەمەکانی مارکس و گوزارشتەکانی مارکسیستەکاندا دوو ڕوانگە هەیە سەربارەت بە ناوەڕۆک و کارە تایبەتەکانی دەوڵەت: یەکەم ڕوانگەی ئامرازیی. دووەم ڕوانگەی پێکهاتەیی. بەپێی ڕوانگەی ئامرازی دەوڵەت ئامرازی چینی دەسەڵاتدارە. چینی دەسەڵاتدار بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەیان و کۆنترۆڵکردنی چینی خاوەن بەهرە سوود لەم ئامرازە وەردەگرێت. بەڵام بەپێی ڕوانگە پێکهاتەیی دەوڵەت بە هۆی ئەو پێگەیەی کە هەیەتی لە پێکهاتەی سیستەم و کۆمەڵگادا چەند ڕۆڵێکی هەیە و لەوانە ڕۆڵی



پاراستنی سیستەمی بەهرەکێشی و قازانجەکانی بەهرەکێشان. پاشتر ڕوون کردنەوەیەکی زیاتر دەخەینەڕوو لەم بارەیەوە.

٤- ماتریالیزمی مێژووی وەکو زانستی یاسامەندی مێژوو یاخود زانستی کۆمەڵگای سەرمایەداری. زۆربەی مارکسیستەکان بڕوایان وایەکە ماتریالیزمی مێژووی مارکس زانستی یاسامەندی گشتی مێژووە و (بەو جۆرەی کە لە باسکردنی هزری مارکسدا باس لێوەکرا). هێزی داینەمیکی یاخود جووڵەی مێژوو و شێوەی وەرچەرخانی سیستەمە مێژووییەکان لە سیستەمە نزمەکانەوە بەرەو سیستەمەکانی سەرووتر (لە سیستەمی هاوبەشی خێڵەکییەوە بۆ کۆیلایەتی و لە کۆیلایەتییەوە بۆ فیۆلدالیزم و لە فیۆدالیزمەوە بۆ سەرمایەداری و لە سەرمایەدارییەوە بۆ سۆسیالیزم) ڕوون دەکاتەوە. بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا لقێک لە تەوژمە مارکسیستەکان کە بە قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسراوە تەنها سەبارەت بە سیستەمی سەرمایەداری زانستی ماتریالیزمی مێژوویی (بەو جۆرەی کە پاشتر باسی دەکەین) بە دروست دەزانی.

٥- تێگەیشتن لە هەندێ چەمک و بۆچوونی وەکو «نامۆبوون» و «بەشت بوون».

هەروەک دواتر دێبینەسەری هەندێک لە بۆچوونەکانی تیۆرە مارکسیستییەکان بەواتایەکی جیاواز لە مەبەستەکەی مارکس ئەم دوکترینەیان بەکارهێنا و گۆڕییان بۆ چەقی تیۆرگەلێکی نوێ لە شیکردنەوەی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا.





## بابەتی ژێرخان و سەرخان و ڕێچکە مارکسیستییەکان

وتمان سەرچاوەی دابەشبوونی مارکسیزم بۆ چەند ڕێچکەیەکی جیاواز لە ڕووی تیۆرییەوە پەیوەستە بەشێوەی لێکدانەوەی گرنگترین دوکترین ماتریالیزمی مێژوویی واتە فۆرمۆلبەندی ژێرخان و سەرخان. لە بەرگی دووەمدا بە کورتی باسمان لە ماتریالیزمی مێژووی مارکس کرد. بە لەبەر چاوگرتنی ئەو گرنگییەی کە شێوەی لێکدانەوەی ئەم فۆرمۆلبەندییە هەیەتی لە ڕێچکە جیاوازە مارکسیستییەکاندا، جارێکی تر لێرەدا دەیخەینەوە ڕوو جگە لە ڕوون کردنەوەی زیاتری باس لە چۆنیەتی تێگەیشتنە جۆرا و جۆرەکانیشی دەکەین.

مارکس بۆ شیکردنەوە و لێکجیاکردنەوەی بەشەکانی سیستەمێك یاخود کۆمەڵگایەك و پەیوەندی ئەم بەشانە لەگەڵ یەکتردا خوازەگەلێکی جیاوازی بەکارهێناوە. یەکێك لە ناسراوترینی ئەو خوازانە بریتییە لە چەمکی ژێرخان و سەرخان. هەروەك باسکرا مارکس ئەم بۆچوونەی هێنایە پێشەوە کە فۆرمبەندی کۆمەڵگا وەکو بینایەك لە دوو بەشی گەورەی ژێرخان و سەرخان دروستبووە. لەم دوو بەشەدا ژێرخان کە شێوەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگا لە خۆدەگرێت بەشی گرنگترە و لە ڕاستیدا بناغەی بەشی دووەمیشەکە بە سەرخان ناودەبرێت. شێوەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگاکە لە پەیوەندی لەگەڵ سەرخاندا بە ژێرخان دادەنرێت هەر دوو بەشی هێزەکانی بەرهەم هێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە خۆدەگرێت. هێزەکان بەرهەمهێنانیش لە شوێنی خۆیدا هۆکارەکانی بەرهەمهێنان و هێزی کار لە خۆدەگرێت. ئەمانە بەیەکەوە هەلومەرجی ماددی بەرهەمهێنانی دروستدەکەن. بەشتێکی ژێرخان بە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ناودەبرێت. پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان بریتییە لەو پەیوەندیانەی کە لە پرۆسەی کردەیی و بەرهەمهێناندا لە نێوان مرۆڤدا دروستدەبێت و پەیوەندییەکانی خاوەنێتی و موڵکداری لەوانە موڵکداری تایبەتی کەرەستەکانی بەرهەمهێنان لە گرنگترین لایەنەکانیەتی. بۆ



نموونە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا موڵکداری بۆرژوازی بنەمای پەیوەندییەکانی خاوەنێتییە. ئەم خاوەنێتیە لە سروشتی دەسەڵاتی سیاسیشدا ڕەنگدەداتەوە. ئەگەر ئەمانە واتە شێوەی بەرهەمهێنان بەژێرخانی فۆرمبەندی کۆمەڵگا دابنێین لەسەر بناغەی ئەو سەرخانێك دروستدەبێت کە سیاسەت و ماف و ئایدۆلۆژیا لە خۆدەگرێت. پەیوەندی نێوان ئەم دووە بەم جۆرەیە کە ژێرخان زیاتر ڕۆڵێکی سەربەخۆ و سەرخان زیاتر ڕۆڵێکی شوێنکەوتووی هەیە.

## دوو تێگەیشتنی گشتی لە ماتریالیزم و یاساکانی

### تێڕوانینی کلاسیکی و تێڕوانینی مرۆڤگەرایی

سەرەتا بەپێی پۆلینکردنێك دەتوانین دوو لێکدانەوەی جیاواز بۆ ماتریالیزمی مێژووی و یاساکانی لە نەریتی مارکسیستیدا لێك جیابکەینەوە. لە لێکدانەوەی یەکەمدا کە لێکدانەوەیەکی باویشە خوازەی ژێرخان و سەرخان بە جەوهەری تێگەیشتنی ماتریالیزمی مێژووی دادەنرێت و بەم جۆرە ئەو ماتریالیزمەی کە مارکس باسی لێوەدەکات زانستی مێژووی تەواوی چاخەکانی شارستانیەتی مرۆڤە. لە لێکدانەوەی دووەمدا خوازەی ژێرخان و سەرخان بە تەواوی ئەبستراکتێکە بۆ ڕەت کردنەوەی ئایدیالیزمی فەلسەفی بۆیە نابێت لە ڕووی شیکارییەوە گرنگییەکی زۆری پێبدرێت و وەکو ڕێسایەك کاری پێبکرێت بۆ لێکۆڵینەوەی تەواوی مێژوو.

لێکدانەوەی یەکەم  تێگەیشتنێکی هەیە بۆ مێژوو کە دەکرێت بەم چوار تایبەتمەندییە بناسرێتەوە: ڕەسەنایەتی ماددە، ڕەسەنایەتی ئابووری، ڕەسەنایەتی هۆکارێتی و ڕەسەنایەتی پێکهاتە. باسکردنی ئەم لێکدانەوەیە بە زاراوەگەلی ماددەگەرایی و ئابووریگەرایی و جەبرگەرایی و پێکهاتەگەرایی دەربڕینێکی دیکەی هەمان واتایە. بەم جۆرە لێکدانەی یەکەمی یاساکانی ماتریالیزی مارکس





تێڕوانینێکی نەریتی مارکسیستی دروستدەکات کە بە پشتبەستن بە ئابووری و پێکهاتە و هۆکارێتی دیاری دەبێت. بۆیە تێڕوانینی چەمکی ژێرخان و سەرخان لە تیۆری ماتریلیازمی مێژوویيدا پەیوەستە بەو واتایەوە کە وەرچەرخانی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان (کە بۆ خۆی رەنگدانەوەی وەرچەرخانی هێزەکانی بەرهەمهێنانە) دروستکەری فۆرمگەلێکی نوێ و گۆنجاوە لە سیاسەت و یاساو ئایدۆلۆژیادا. ئەنگڵسی دۆست و هاوکاری مارکس کە بۆخۆی بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی تێڕوانینی ئابووریگەرایی و هۆکارێتی دادەنرێت لە لێکدانەوەی ماترلیازمی مارکسدا، پاشتر هەوڵیدا بە هێنانی ئەو کۆتە گرنگەی کە ژێرخان لە دواین شیکردنەوەدا سەرخان دیاریدەکات چاکسازی لە تێگەیشتنی ئابووریگەرای و وێنای جەبری و پێکهاتەگەراییدا بکات لە لێکدانەوەی ماترلیازمی مارکسدا. بەڵام زۆربەی مارکسیستەکان و بە تایبەتی مارکسیستە رووسەکانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم گرنگیان بەم کۆتە ((لە دواین شیکرنەوەدا)) نەداو بە ئاراستەی بەرەشۆکی کردنی ماتریالیزمی مێژووی مارکس بەرەو پێشەوە چوون. ئەم گرووپەی مارکسیستەکان تائەو جێیە بەرەو پێشەوە هەنگاویان نا کە ئابوورییان بە تەنها هۆکاری وەرچەرخانی مێژوویی دادەنا. ئەم تێگەیشتنەی تیۆری مارکس بە مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکسیش ناودەبرێت.

لە لێدانەوەی دووەمدا پشت بە چەمکی دیالێکتیك دەبەسترێت بۆ تێگەیشتنە تیۆری مارکس. بەم تێڕوانینەدا دەوترێت کە پەیوەندییە ئابووری و سیاسی و یاساییەکان وەکو کۆمەڵەیەك دروستکەری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمهێنانن. بەپێی ئەم تێڕوانینە باسەکە ئەوەنییە کە کام یەك لەم پەیوەندیانە واتە پەیوەندییە ئابووری و یاسایی و سیاسییەکان سەبارەت بە یەکتر رۆڵی هۆکاریان هەیەو هۆکاری دروستبوونی ئەوەی ترن. چەندە ئابووری لەسەر بناغەی سیاسەت و یاسا دامەزراوە هێندەیش سیاسەت و یاسا لەسەر بنەغای ئابووری



دامەزراون. لە رێکچەیەکی بیرکردنەوەی مارکسیستدا کە بە مارکسیزمی مرۆڤگەرایی ناسراوە و لە لۆکاشەوە تاگراوشی و لەوێشەوە تا لایەنگرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت درێژبووەتەوە ئەم تێڕوانینە گوزارشتی باوبوو.

## تێڕوانینی پێکهاتەگەرایانە لە مارکسیزم

دوو تێڕوانینەکەی پێشووی نەریتی مارکسیزم هەریەك لە روویەکەوە بە زیادەڕۆییەوە بەرەو زەقکردنەوەی یەکێك لە لایەنەکانی هزری مارکس و لە هەندێ رووەوە تا ئاستی لادان لە بنەماکانی ئەم هزرە هەنگاویان ناوە. تێڕوانینی ئۆرتۆدۆکسی یان تێگەیشتنی هۆکارخواز و ئابووریگەرا لە سەرەتاکانی سەدەی بستەمدا لە بەرامبەر خۆیاندا تێڕوانینی مرۆڤگەرایی و عەقڵگەرایی ناوەڕاستی سەدەیان دروستکرد. و سەرئەنجام لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا تێڕوانینێکی تازەی مارکسیزم گەشەیکرد کە لە کاردانەوەی تێڕوانینی مرۆڤگەرایی و عەقڵگەراییدا دروستبوو کە لە رووی تیۆرییەوە سەنتێزێکی باشترین لایەنەکانی هەریەك لە دوو تێڕوانینەکەی پێشوو بوو. ئەم تێڕوانینە بە ناوی مارکسیزمی پێکهاتەگەرا ناسراوە.

ماکسیزمی کلاسیك پشتی بەو گوزارشتە بەستبوو کە لە خوازەی ژێرخان و سەرخاندا لایەنی ژێرخانی دیاریکەری سەرخانە. دەبێت لە زاراوەی دیاریکەر وردبیینەوە. مارکسیزمی مرۆڤگەرایی بەو لێکەدانەوەیە جەختی لەسەر پەیوەندی دیالێکتیکی ژێرخان و سەرخان دەکردەوە کە ژێرخان و سەرخان وەکویەك کاردەکەنە سەر یەکتر، بۆ نموونە سیاسەت کە لە مارکسیزمی کلاسیکدا بە سەرخان دادەنرێت لە هەندێ کاتدا ژێرخانە. لەوانەش لە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی پێش سەرمایەداری ئایین و یاسا و سیاسەت لە رەگەزە





دیاریکەرەکانی شێوەی بەرهەمهێنانن. مارکسیستە پێکهاتەگەراکان هەوڵیانداوە بە پەنابردن بۆ خوازەی ئۆرگانیك ئەو گرفتە چارەسەربکەن کە خوازەی ژێرخان - سەرخان دروستیان کردبوو لە بیرکردنەوەی مارکسیستیدا. و فۆرمۆلبەندیەکی نوێیان خستەڕوو بۆ شیکردنەوەی مێژوو و کۆمەڵگا کە لەسەر بنەمای مامەڵە و پەیوەندی ناوەکیی سێ بنیاتی ئابووری و سیاسی و ئایدۆلۆژی دامەزراوە. لە باسەکانی دواتردا روونکردنەوەی زیاتر دەخەینەڕوو سەبارەت بەم تێڕوانینیە (و هەروەها دوو تێروانینەکەی تریش).

## لقە سەرەکییەکانی مارکسیزم

ئەگەر زاراوەی لقەکانیش وەکو خوازەی ژێرخان و سەرخان نەبێتە مایەی بەد حاڵیبوون ئەوا دەتوانین بڵێین کە مارکسیزم دابەش دەبێت بۆ سێ لقی سەرەکی. ئەم سێ لقە بریتین لە مارکسیزمی کلاسیك یاخود ئۆرتۆدۆکس و مارکسیزمی مرۆڤگەرایی یاخود فەلسەفی و مارکسیزمی پێکهاتەگەرا. هەریەك لەم سێ لقە سەرەکییە بۆ خۆیان دابەشدەبن بۆ چەند قوتابخانە و ڕێچکەیەکی دی. لەوانە مارکسیزمی کلاسیك دابەشدەبێت بۆ دوو بۆچوونی سۆسیال دیموکراسی (لە تیۆرییەکانی کائۆتسکیدا) و لێنینیزم (لە تیۆری لێنیندا) ئەم دوو بۆچوونە لە لێکدانەوەی ماتریالیزمی مێژوویی مارکسدا هاوبۆچوونن لە پشتبەستن بە ئابووری و هۆکارێتی و پێکهاتە، بەڵام بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە تێڕوانینی ستراتیژی شۆڕش و شێوەی هەنگاونان بەرەو سۆسیالیزم. مارکسیزمی مرۆڤگەراییش بۆچوونگەلێکی وەکو مارکسیزمی فەلسەفی (لە نوسراوەکانی لۆکاشدا)، قوتابخانەی فرانکفۆرت (ماکۆزە-ئادۆرنۆ)، تیۆری رەخنەیی (هابرماس) لە خۆدەگرێت. و پێکهاتەگەرایی مارکسیزمیش لە تیۆرەکانی ئالتۆسێر بە



پێکهاتەگەرایی رەقترەوە بەرەو تیۆری پۆلانزانس بە پێکهاتەگەرایی نەرمترەوە گۆڕاوە.

لە پاژەکانی پاشتردا روونکردنەوەی زیاتر دەخەینەڕوو سەبارەت بە هەریەك لەم رێچکە و قوتابخانە و تیۆرییانە. ئەم هێڵکارییەی خوارەوە وێنەیەکی لق و رێچکە جیاوازە مارکسیستییەکانی سەدەی بیستەمە.



## پاژی دووهەم

# ماركسیزمی كلاسیك

## بنەماكانی ماركسیزمی كلاسیك

ماركسیزم بەو جۆرەی كە لە بەرهەمەكانی پاشتری ماركسدا وەكو كتێبی سەرمایەو لە نوسین و تێگەیشتنەكانی هاوڕێ و هاوكارە نزیكەكانیدا وەكو ئەنگڵس و كاوتسكی خرایەڕوو بە ماركسیزمی كلاسیك ناودەبرێت. ئەم ماركسیزمە لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاكانی سەدەی بیستەمدا كامڵبوو. پاشتر بەسەرهەڵدانی چەند بۆچوونێكی نوێ لە ماركسیزمدا ئەم تێگەیشتنەی ماركسیزم بە ئۆرتۆدۆكسی ناوی دەركرد لە ماركسیزمدا. ئەو تەوژمە ماركسیستیانەی كە لە ماوەی سەدەی بیستەمدا دروستبوون ئەم لێكدانەوەیەی بۆچوونە بنەڕەتییەكانی ماركسیان بە نادروست و بەرهەمی بەدحاڵیبوونی تیۆرەكانی ماركس لە قەڵەمدا و تێگەیشتنێكی نوێیان خستەڕوو بۆ هزرەكانی ماركس كە لە پاژەكانی پاشتردا ئاشنای دەبین.

كەسانێكی زۆر ماركسیزمی كلاسیك بە خوێندنەوەیەكی دروستی بەرهەمەكانی ماركس دادەنێن و فراوانكردنی تیۆرەكەی ماركسی لەقەڵەمدەدەن، ئائەو جێیەی كە پەیوەستە بە بنەماكانی ماتریالیزمی مێژوویی و شیكاری ماركس بۆ كۆمەڵگا و سەرمایەداری رەنگە كەمتر ئەم وتەیە جێی رەخنە بێت، بەڵام لێرەدا كە پەیوەستە بە ستراتیژی ململانێ بۆ گەیشتن بە سۆسیالیزم دەبێت بڵێین كە شوێنكەوتوانی لێكدانەوەی ئۆرتۆدۆكسیی ماركس بەتوندی لە یەكتری و لە بنەما



تیۆرییەكانی ماركس دووردەكەونە. ماركسیزمی ئۆرتۆدۆكسی لە دوو تەوژمی سیاسی تەواو جیاوازدا واتە سۆسیال دیموكراسی ئەڵمانیا و لێنینیزمی رووسیدا گەشەشی كردوو كامڵبوو. سۆسیال دیوكراسی لە رووی رێرەوی سیاسیەوە راستترین تەوژمی ماركسیزمی سیاسی بوو لە كاتێكدا كە لێنینیزم لە كاتی خۆیدا چەپترینی بوو. لێنین كائۆتسكیی رابەری سۆسیال دیموكراسی ئەڵمانیای بە هەڵپەرست و كائۆتسكیش لێنینیزمی بە رێبازێكی بنیاتنراو لەسەر ویستگەرایی و ئاژاوەگێڕیّ هەڵدەسانگاند.

لەگەڵ ئەمەشدا سەرەڕای ناكۆكیە توندەكانیان هەردوو تەوژمەكە یەك لێكدانەوەیان هەبوو بۆ هەندێك لە دوكترینە بنەڕەتییەكانی ماركس. لەو دوكترینانەش: تێگەیشتنی پەیوەست بە ماتریالیزمی مێژوویی و بنەما بنەڕەتییەكانی بوو. ئەم تێگەیشتنەی ماتریالیزمی مێژووی بەم بنەڕەتانەی خوارەوە بە دیاردەكەوێت:

١- رۆڵی دیاریكەرانەی ژێرخان سەبارەت بە سەرخان.

٢- گوزارشتكردن لە سیاسەت و مافەكان و ئایدیۆلۆژیا وەكو سەرخان.

٣- تێگەیشتنی پەیوەندییەكانی بەرهەمهێنان وەكو پەیوەندییە ئابوورییەكان.

٤- گشتاندنی یاساكانی دیالێكتیك بۆ سروشت و كۆمەڵگا.

٥- خستنەڕووی بنەماكانی ماتریالیزم، لەوانە فۆرمولبەندی ژێرخان و سەرخان وەكو جەوهەری زانستی مێژوو.

٦- پشتبەستن بە بۆچوونی جەبرگەرایی لە داینەمیكییەتی مێژوو و كۆمەڵگا. هەروەك ئاماژەی پێكرا ئەم تێگەیشتنەی سەرەكیترین لایەنەكانی هزری ماركس وەكو خوێندنەوەی ئابووریگەرایانە و جەبرگەرایانە و پێكهاتەگەرایانە





لە بۆچوونەکانی مارکسەوە وەرگیراوە. مارکس لە جیاکردنەوە و شیکردنەوەی سیستەمی سەرمایەداریدا جەختی لەسەر لایەنەکانی ئابووری دەکردەوە. لە رووی شیکارییەوە ئابووری لە تەواوی لایەنەکانی کۆمەڵگا جیادەکردەوە و دەیوت کە دامەزراوە سیاسییەکان و یاساکان و سیستەمە بڕواییەکان و تەنانەت فۆرمەکانی خێزانیش بە جۆرێکی ناچار هەماهەنگ دەبن لەگەڵ پێویستییەکانی سیستەمی ئابووریدا(1). بەم پێیە ئابووری بناغە و دیاریکەری چۆنیەتی وەرچەرخان و کاری تەواوی لایەنە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان و لەوانە پەیوەندییەکانی نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان و ناوەڕۆك و کارکردنی دەوڵەتە. بەڵام شوێنکەوتووانی دیکەی مارکس ڕۆڵی سەرەکیی ئابوریان بە دروست نەدەزانی بۆ هەموو سیستەمەکان و بەشتێکی تایبەتی کۆمەڵگای سەرمایەدارییان دادەنا.

## ئەنگڵس و ماتریالیزمی دیالێکتیک

فردریك ئەنگڵس (١٨٢٠-١٨٩٥)ی دۆست و هاوکار و پشتیوانی دارایی مارکس کوڕی بازرگانێکی دەوڵەمەندی ئەڵمانی بوو. ئەنگڵس تەواوکەر و بڵاوکەرەوەی کتێبی سەرمایەی مارکسە لە دوای خودی مارکس. ئەنگڵس لە نووسینی کتێبی «ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی»دا هاوبەش بوو لەگەڵ مارکسدا. لەم کتێبەدا بوو کە بۆ یەکەمین جار بنەماکانی ماتریالیزمی مێژوویی مارکس بە دوور و درێژییەکی زیاتر خرایەڕوو. مارکسیستە کلاسیکی یان ئۆرتۆدۆکسییەکان لەو بڕوایەدابوون کە مارکس و ئەنگڵس لە هەموو ڕوویەکەوە هاو هزربوونە لەگەڵ یەکتردا و دەبێت بە یەکەوە بەرهەمەکانی ئەم دووە بە سەرچاوەی ماتریالیزمی مێژووی دابنرێن. بەڵام کەسانێکی زۆر ئەم بۆچوونەیان خستووەتە بەرپرسیار و وتوویانەکە مارکس و



ئەنگڵس سەرەڕای هاو بۆچوونیان دەربارەی ئابووری سیاسی و داخوازی و تاکتیکەکانی پارتی کرێکار لە زەمینە گەلێکی گرنگی دیکەیشدا ناکۆکی توند لە بۆچوونەکانیاندا هەبوو. یەکێك لە بۆچوونە ناکۆکەکانیان دەربارەی فەلسەفەی سروشت بوو کە ئەنگڵس دەیویست دەرگایەکی نوێی لێبکاتەوە.

ئەنگڵس بەتوندی لە ژێر کاریگەری تیۆری کامڵبوونی سروشتی دارویندا بوو و لەو بڕوایەدا بوو کەدەکرێ یاسایی هەڵبژاردنی سروشتی داروین تێکەڵبکرێت لەگەڵ ماتریالیزمی مێژووییدا. لە کاتێکدا کە مارکس تەنانەت لە بواری زانستە سروشتییەکانیشدا تیۆرییەکەی داروینی بە کاڵ و ناگشتگیر دادەنا چ بگات بەوەی کە پەیوەندەیەك دروستبکرێت لە نێوان ئەو و ماتریالیزمی مێژووییدا، واتە بوارێك کە مامەڵە لەگەڵ مێژوو و کۆمەڵگای مرۆییدا دەکات.

دورستکردنی پەیوەندی لە نێوان تیۆری کامڵبوونی سروشتیی داروین (لەوانە یاسای هەڵبژاردنی سروشتی) و ماتریالیزمی مێژوویی لە لایەکەوە مارکسیزمی لە ڕوانگەیەك نزیککردەوە کە بە پۆزیتیڤیزم ناودەبرێت و لە لایەکی ترەوە بەرەو ئابووریگەرایی پەلکێشی کرد، بە جۆرێك کە چەمکی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی داگرت و بۆ چەمکی ئابووری. یەکێك لە تێگەیشتنەکانی ئەم کارە ئەوەیە کە یەکەم ناسینی کۆمەڵایەتی و زانستی سروشتی بەیەك ڕەگەز دابنێین، دووەم ڕۆڵی مرۆڤەکان یاخود ئەوەی کە لە زمانی مارکسیستیدا بە کارگوزار ناوی دەبن لەبەر چاونەگرین، سێیەم هۆکارێتی مێژوویی بۆ وێنای جەبری کەم بکەینەوە. هەروەك باسکرا، مارکس بڕوای وابوو کە مرۆڤەکان خۆیان مێژووی خۆیان دروستدەکەن، بەڵام نەك لەو هەلومەرجەی کە خۆیان دیاریان کردووە و نەك بە هەر جۆرێك کە خۆیان دەیانەوێت. ئەم وتەیەی مارکس ئاماژە بە دیالێکتیکی نێوان کاری مرۆیی (لایەنی ئازادی) و هەلومەرجی دیاریکراوی مێژوویی (لایەنی





زەرورەت) دەکات کە دەکرێت وەکو هۆکارێتی مێژوویی باسی لێوەبکرێت و جیاوازە لەوەی کە بە جەبرگەرایی ناودەبرێت.

ئەم تێگەیشتنانە هەروەك پاشتر باسی دەکەین بووە مایەی رەخنەی مارکسیستەکانی پاشتر کە بە ماکسیستە مرۆڤگەراکان ناوبراون و هەروەك لە زاراوەی مرۆڤگەرایییەوە بەدەستدێت رۆڵی مرۆڤ لە دروستکردنی مێژوو و کۆمەڵگادا پێگەیەکی بەزرتری هەیە.

بابەتێکی دی کە بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەنگڵس بە دەستپێکەری تێگەیشتنی ئۆرتۆدۆکسی مارکسیزم دابنرێت حەز و نوسراوەکانی ناوبراوە لە بواری فەلسەفەی سروشتیدا. ئەنگلس لە کتێبێکدا بە ناویشانی ئانتی دوورینگ (١٨٧٨) هەولێداوە کە دوکترینی ماتریالیزم و دیالێکتیکی مارکس لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسەتەوە بەرەو تەواوی بوارەکانی بوون واتە سروشت و میژوو و هزر ببژێنێت و فەلسەفەی دیالێکتیك بگۆڕێت بۆ یاسای گشتی کاملبوون لە هەموو بوارەکاندا.

## کاوتسکی و تێگەیشتنی ئۆرتۆدۆکسی لە مارکسیزم

کارل کاوتسکی (١٨٥٤-١٩٣٨) یەکێك بوو لە لێکدەرەوە سەرەکییەکانی مارکسیزم دوای مردنی ئەنگڵس (١٨٩٥). پەیوەندییەکی نزیکی هەبوو لەگەڵ مارکس و پاشانیش لەگەڵ ئەنگڵس و دەوترا کە زۆر لە ژێرکاریگەری بۆچوونەکانی ئەنگڵسدا بووە. کاوتسکی لە سەردەمی لاوێتیدا پەیوەندی بە بزووتنەوەی سۆسیالیستی و پارتی سۆسیال دیموکراسی ئەڵمانیاوە کرد کە لەو کاتدا یەکێك بوو لە رێکخراوە گرنگەکانی بزووتنەوەی کرێکاری، پاشان وەکو یەکێك لە رابەرانی ئەو رێکخراوە ناسرا. کاوتسکی یەکێك بوو لە تیۆریداڕێژە سەرەکییەکانی بزووتنەوەی سۆسیال دیموکرات و تیۆرەکانی پێگەیەکی گرنگیان هەبوو لە رەوتی بزووتنەوەی



کرێکاری و سۆسیالیستی و لێکدانەوەی مارکسیزم. لە ژێرکاریگەری ئەودا بوو کە پاتری سوسیال دیموکراتی ئەڵمانیا وەکو یەکەمین پارتی گرنگی کرێکاران رێبازی مارکسیزمی وەکو ئایدۆلۆژیای فەرمی پارتەکەی پەسەندکرد.

هەروەها کاوتسکی هەوڵێکی زۆری دا بۆ بڵاوکردنەوەی نوسراوەکانی مارکس و بە یەکێك لە بڵاوکەرەوە گرنگەکانی مارکسیزم لە ئەوروپادا ناسرا. کتێبەکەی بە ناونیشانی تێگەیشتنی ماتریالیستیی مێژوو لە دووبەرگدا لە نوسراوە گرنگەکانی هێرمۆنوتیکی ئۆرتۆدۆکسیی هزر و نوسراوەکانی مارکسە. نازناوی پاپای ئاینیزای سۆسیالیزمیان دابووە پاڵ کاوتسکی.

## سۆسیال دیموکراسی و ستراتیژیی پارتی چینی کرێکار

کاوتسکی لە رابەرانی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا بوو کە رۆڵێکی بنەڕەتیی هەبوو لە بنیاتنانی ستراتیژی ئەم پارتەدا. دەبوو لەگەڵ برنشتاین (کە پاشتر باسی دەکەین)دا و لە کەشوهەوای تایبەتی ئەوروپادا ستراتیژی یەکەمین پارتی مارکسیستی فەراهەم بکەن. لە کەشوهەوایەکی وەهادا هەندێك لە دوکترینە گرنگەکانی مارکسیزم وەکو دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و ململانێی چینایەتی کێشەیەکی گەورەی خستبووە بەردەمیان. بەهەر حاڵ پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٩١دا ستراتیژی خۆی لەسەر بنەمای ئایدۆلۆژیای مارکسیزم رێکخست. کاوتسکی و برنشتاین لە کەسە دیارەکانی رێکخستنی ئەم بەرنامەیە بوون. لەم بەرنامەیەدا کە بە بەرنامەی ئۆرفۆرت ناوی دەرکرد دوکترینی تێپەڕین لە مۆڵکداری تایبەتییەوە بۆ مولکداری گشتی جێکرایەوە. بەڵام سەبارەت بە شێوەی تێپەڕین بەرەو سۆسیالیزم دوو دوکترینی دیکەی مارکسیزم واتە ململانێ چینایەتی و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا کەوتنە بەرلێکدانەوەی تایبەت کە پەیوەندی





هەبووە بە بۆچوونی مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکسییەوە. لە بڕی ئەوەی سوود لە زاراوەی شۆڕشی سۆسیالیستی وەربگیردرێت لەم بەرنامەیەدا، باس لە بە گشتی کردنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەکرا لە لایەن چینی کرێکارەوە. بەڵام ئاماژە بەو خاڵە کرابوو کە چینی کرێکار پاش بەدەستەوەرگرتنی دەسەڵات دەست بە کارێکی لەو جۆرە دەکات. کاوتسکی لە کتێبی ڕێگەی گەیشتن بە دەسەڵات (١٩٠٩)دا هەوڵی داوە کە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ببەستێتەوە بە دیموکراتییەوە و جەختی لەسەر دیموکراتی بوونی سروشتی ئەو خاڵە کردەوە کە لە ئەدەبیاتی مارکسیستیدا بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ناوبراوە. بۆ نموونە لەوێدا وتوویەتی کە نابێت دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا بە واتای شەڕی چینایەتی لێکبدرێتەوە. بەڵکو دەبێت بە واتای حکوومەتی پرۆلیتاریاو وەکو زۆرینەی دانیشتوانی وڵات و بە لەبەر چاوگرتنی هەموو بنەما دیموکراتییەکان تەماشا بکرێت.

کاوتسکی ڕەخنەی لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر گرت و تیۆری بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی پارتێکی بچووکی پیشەیی بە ناکۆك زانی لەگەڵ بنەڕەتەکانی مارکسیزمدا. بە بۆچوونی ئەو تەنها لە سایەی بە دەستەوە گرتنی دەسەڵات لە لایەن زۆرینەوە (واتە پرۆلیتاریا) مەبەستەکانی شۆڕشی سۆسیالیستی دێتەدی. لە بەرامبەر تیۆرەکەی لێنینیدا کە بڕوای بە وەدەستەوەرگرتنی دەسەڵاتی هەبوو لە لایەن پارتێکی شۆڕشگێڕی پیشەییەوە، بەڵگەی دەهێنایەوە کە ڕێکخراوێکی نهێنی ناتوانێت دیموکراسی بێت. بە بۆچوونی کاوتسکی سۆسیالیزم پەیوەندییەکی پێویستی هەیە لەگەڵ دیموکراسیدا.

سەبارەت بە دەوڵەتی بۆرژوازیش کاوتسکی ڕوانگەیەکی جیاواز لە مارکسیستە توندڕەو شۆڕشگێڕەکانی هەبوو و لەو بڕوایەدا بوو کە گەرچی لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا بەهرەکێشی چینایەتی بوونی هەیە بەڵام ناکرێت دەوڵەتی مۆدێرن



که بە بنەماکانی دیموکراتی پشت بە دەسەڵات دەبەستێت وەکو ئامرازەکانی چینی سەرەوە تەماشابکرێت.

دەکرێت بڵێین کە ڕوانگەی کاوتسکی تەنها بە تێگەیشتنە ئابوورییگەرایانە و جەبرگەرایانەکەی هاو ئاراستەی نەبوو لەگەڵ مارکسیزمدا، بەڵکو لەگەڵ کەشوهەوا سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوروپایش هەماهەنگ بوو. بەها دیموکراتییەکان کەشوهەوای سیاسی ئەوروپایان دیاری دەکرد و کەشوهەوای کۆمەڵایەتیەکەشی بەپێی باشتر بوونی باری ئابووری کرێکاران بوو. لە کەشوهەوایەکی وەهادا گفتوگۆکردن دەربارەی ململانێ توند و تیژی چینایەتی وەکو تەنها ڕێگەی تێپەڕین لە سەرمایەدارییەوە بەرەو سۆسیالیزم ناتوانێت زۆر دڵخۆشکەربێت.

## مارکسیزمی کلاسیک و پێداچوونەوەخوازی

ئیدوارد برنشتاین (١٨٥٠-١٩٣٢) دۆست و هاوکاری ئەنگلس و کاوتسکی و یەکێك بوو لە ڕابەرانی پارتی سۆسیال دیموکرات. سەرەتا لە ئینتەرناسیۆنالی یەکەم و لە کتێبەکانیدا چەند چاکسازییەك و پاشتر چەند پێداچوونەوەیەکی سەرەکیی لە ستراتیژی و بنەماکانی مارکسیزمدا ئەنجامدا کە پێداچوونەوەخوازی مارکسیزمی کلاسیك ناوی دەرکرد. خاڵی سەرەکی پێداچوونەوەخوازی بریتی بوو لە بڕوابوون بە چاکسازی بەرە بەرەی کۆمەڵگا لە بەرامبەر بڕوای مارکسیزمی کلاسیکدا کە خوازایاری گۆڕینی پەیوەندییەکانی سەرمایەداری بوو بەشێوەیەکی شۆڕشگێڕانە. هەڵبەتە چەمکی شێوەی شۆڕشگێڕانە تەنها بە واتای ململانێی توند و تیژانە نییە. مارکسیزمی کلاسیك ئەگەری تێپەڕین بەرەو سۆسیالیزم بە سوود وەرگرتن لە شێوەکانی هەڵبژاردنە دیموکراتییەکانی ڕەت نەکردووە. بەڵام پێداچوونەوەکانی برنشتاین زۆر لەمە زیاتر بەرەو پێشەوە دەچوو. برنشتاین تائەو





جێیە پێشکەوت کەرایگەیاند ململانێی چینایەتی وەکو میکاینزمی گۆڕانی سەرمایەداری بۆ سۆسیالیزم واتای خۆی لە دەستداوە. بە بۆچوونی برنشتاین نەك تەنها ئەگەری شۆڕشێکی توندوتیژ و خوێناوی لە ئارادانییە بەڵکو پێویستیش نییە. مارکسیستە کلاسیکییەکان دیموکراسیان وەکو یەکێك لە شێوەکانی ململانێی ڕێگەی سۆسیالیزم پەسەند دەکرد، بەڵام برنشتاین دیموکراتی بەواتایەکی ڕەها پەسەنددەکرد و دەیوت کە دەبێت لە بری هەزارەگەرایی خەیاڵی بیر لە راستییەکانی ئێستاو ئایندەی نزیك بکرێتەوە.

بەڵگەی برنشتاین بۆ ڕەتکردنەوەی ململانێی چینانەی وەکو ڕێگەی تێپەڕین بەرەو سۆسیالیزم ئەوە بوو کە لە بنەڕەتدا شرۆڤەکردنەکەی مارکس بۆ سیستەمی سەرمایەداری لەسەر بنەمای حەتمی بوونی قەیرانی سەرمایەداری رووی نەداوە.

بەم جۆرە بە جەمسەری بوونی کۆمەڵگا وەکو درزی نێوان کۆمەڵی گەورەی کرێکارانی نەدار و کۆمەڵی بچووکی سەرمایەدارانی گەورە، بەو جۆرەی کە مارکس پێشبینی دەکرد نە هاتەدی. لە بری هەموو ئەمانە ئەوەی کە روویدا بریتی بوو لە گەشەکردنی کۆمەڵی ناوەڕاستی خەڵکی بە چینی ناوەڕاست ناودەبرێت. بە بۆچوونی برنشتاین دەکرێت لە وەها هەلومەرجێکدا بە سوود وەرگرتن لەو چوارچێوە دیموکراتییانەی کە هەیەو چوارچێوەی پارتە سۆسیالیستە گرووپیەکاندا و بە هاوکاری تەواوی هێزە پێشڕەوەکان بەرەو سۆسیالیزم هەنگاو بنرێت. برنشتاین لەسەر بنەمای نەوکانتیزم سۆسیالیزمی بەزەرووڕەتێکی ئەخلاقی لە قەڵەمدا و نکۆڵی لە پەیوەندی ئەو (سۆسیالیزم) کرد لەگەڵ زەرووڕەتی کۆمەڵگا و ململانێی چینایەتیدا.

پیاچوونەوەکەی برنشتاین لە مارکسیزمدا سنووردار نەبوونە هەندێك لە دوکترینە سەرەکییەکان، بەڵکو بەرەو هەندێك لە گرنگترین بنەماکانیش پەلی هاویشتە، بەم



جۆرە لە راستیدا ناکرێت بە پەیوەستی بزانین لەگەڵ نەریتی مارکسیزمدا. کاوتسکی و لینین هەر یەك بەشێوەی خۆیان ناکۆکی خۆیان دەربڕی سەبارەت بە تیۆرەکانی برنشتاین و کەوتنە بەرگریکردن لە بنەماکانی مارکسیزمی کلاسیك. بەڵام سەر ئەنجان تیۆرەکانی برنشتاین وەکو تیۆری سۆسیال دیموکرات کاری پێکرا. لە کۆتاییدا سۆسیال دیموکرات بەرەبەرە گۆڕا بۆ بابەتەکانی سۆسیالیزمی دیموکراتی، ئەو بابەتانەی کە ئیدی تایبەت نەبوو بە لایەنگرانی سۆسیالیزمی مارکسییەوە.

## لینین و بۆچوونەکانی کردارگەرایی لە مارکسیزمدا

### تێڕوانینی رادیکاڵیستی لە مارکسیزمدا

لە کاردانەوەی بۆچوونی راستگەرایانە و پێداچوونەوەخوازانەی برنشتاین لە لایەك و بۆچوونی کلاسیکی و میانڕەوانەی کاوتسکی لە لایەکی ترەوە زنجیرە بۆچوونێکی رادیکاڵی لە باڵی چەپی بزووتنەوەی سۆسیال دیموکرات گەشەیکرد. ئەم دەستەیەی مارکسیستە توندڕەوەکان لە زۆر لایەنی تێگەیشتن و ئەدەبیاتی فەلسەفی خۆیان هاو ڕابوون لەگەڵ مارکسیزمی کلاسیکدا، بەڵام لە رووی ستراتیژی ململانێی سیاسییەوە زۆر لە مارکسیزمی کلاسیکییەوە دووربوون. هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسی سەرهەڵدانی ئەم بۆچوونە کە زیاتر لە ئەورووپای رۆژهەڵات و رووسیادا زەمینەی لەباری بۆ رەخسا، بریتی بوو لە توندتر بوونی قەیرانە سیاسییەکان و ئارایشتی ململانێ و پێشبینیکردنی سەرهەڵدانی شۆڕش لە تەواوی ئەورووپادا. ((رۆزا لوگزامبەرگ)) مارکسیستی شۆڕشگێڕی پۆڵەندی بەرەچەڵەك ئەڵمانی و لینینی رابەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری رووسیا لەو دەستەیە بوون. یەکێك لە

تایبەتمەندییەکان تێڕوانینی ئەم دەستەیەی مارکسیستەکان بریتی بوو لە بڕوابوون لە کردارگەرایی و شۆڕشگێڕیی.

ڕۆزا لوگزامبورگ (١٨٧٠-١٩١٩) لە بواری یاساو ئابووری خوێندنی خۆی تەواو کرد. سەرەتا لە پۆڵەندا و پاشتر لە ئەڵمانیادا ئەندامی پارتی سۆسیال دیموکرات بوو. یەکێك لەو باسە نوێیانەی کە ڕۆزا لوگزامبورگ لە ئەدەبیاتی مارکسیێتیدا خستیەڕوو بریتی بوو لە ئەنجوومەنەکانی کرێکاران و سەربازان وەکو پایەی سەرەکی پێشکەوتنی شۆڕش. ئەم جۆرە ئەنجوومەنانەکە سەرەتا لە شۆڕشی ١٩٠٥ی ڕوسیادا بە دیارکەوت لە شۆڕشی ١٩١٧ی ڕوسیا، چ لە ڕووداوی شوبات و چ لە ڕووداوی ئۆکتۆبەردا، ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێت ڕۆزا لوگزامبورگ بە خاوەن قوتابخانەیەکی جیاواز و گرنگ دابنرێت لە مارکسیزمدا.

## سەرهەڵدانی لێنینیزم

لە نێوان مارکسیستە شۆڕشگێڕ و کردەوە خوازەکاندا لێنین لە ڕیزی دیارترینی ئەو کەسانەیە کە داهێنانگەلێکی نوێی هەیە و بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەت دادەنرێت. لێنین وەکو مارکسیستێك میراتگری تێڕوانینەیەکە گیۆرگی پلیخانۆف لە ڕووسیادا برەووی پێدا. پلیخانۆف (١٨٥٦-١٩١٨) یەکێك بوو لە تیۆردارێژانی مارکسیزمی کلاسیك و پاش ماوەیەك لە کارکردنی لەگەڵ لێنیندا لە چالاکییە سیاسییەکاندا ناکۆکی بۆچوون کەوتە نێوانیانەوە و ئەم دووە کە یەکیان مامۆستای مارکسیزم بوو لە ڕووسیادا و ئەوی تر ڕابەری سیاسی ئەم سنوورەبوو، ڕووبەڕووی یەکتربوونەوە. پلیخانۆفیش وەکو کاوتسکی هاوڕا نەبوو لەگەڵ هزری لێنین و شۆڕشی ئۆکتۆبەرداو هەوڵی سەقامیگرکردنی سۆسیالیزمی لە ڕووسیای دواکەوتودا بەشکەستخواردوو لەقەڵەمدەدا.



## پارتی شۆڕشگێڕە پرۆفیشناڵەکان

ڤلادیمێر ئیلیچ لێنین (١٨٧٠-١٩٢٤) لە سەردەمی لاوییەوە پەیوەندی کرد بە بزووتنەوەی ململانێی ڕۆشنبیرانی ڕادیکاڵ لە دژی حکوومەتی تزاریزم لە ڕووسیادا. لەم کەشوهەوایەدا بوو کە بە مارکسیزم ئاشنابوو. لە پلیخانۆف و کائۆتسکییەوە مارکسیزمی وەرگرت بەڵام زۆر پێنەچوو کە لە ڕێڕەوی سیاسیدا لەوان جیابووەوە و ڕەوتێکی سیاسی نوێ بنیاتنا. شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ و دامەزراندنی یەکێتی سۆڤیەت بەرابەری ئەو بەئەنجامگەیشتن. هەتا ساڵی ١٩٢٤ ڕابەری شۆڕشەکەی کرد و لەم ساڵەدا دوا بەدوای پیلانێکی تیرۆیستی گیانی لە دەستدا. پاش مردنی ئەو لە سەردەمی ستالیندا بوو کە زاراوە گەلی لێنینیزم و مارکسیزم-لێنینیزم لە لایەن ستالینەوە دروستکران و ڕێبازی لێنین وەکو مارکسیزمی شۆڕشگێڕی بووە خاوەن ناو و ناونیشانی تایبەتی خۆی.

ڕێبازی لێنین بە کتێبی (دەبێت چ بکرێت) (١٩٠٢) و ناکۆکی بۆچوونەکانی ناو پارتی سۆسیال دیموکراتی ڕووسیا و لەوانە لە کۆنگرەی برۆکسل و لەندەن (١٩٠٣) دەستیپێکرد و بە نووسینەکانی ناوبراو کە هەتا کاتی مردنی بەردەوام بوو کامڵبوو. پاش مردنی لینیش تاماوەیەك نەریتە هزرییەکەی بەشێك لە چالاکییە هزری و سیاسییەکانی زۆربەی بزووتنەوەکانی ڕووەو مارکسیزمی خستبووە ژێرکاریگەری خۆیەوە.

تیۆرە نوێیەکەی لێنین کە بزووتنەوەی سۆسیال دیموکراتی کردە دوو پارچەوە و لە ڕێڕەوی سیاسی مارکسیزمی ناسراو بە ئۆرتۆدۆکسی بەرابەری پلیخانۆف و کاوتسکی دوورکەوتەوە بۆ یەکەمین جار لە کتێبە بچووکەکەی ((دەبێت چ بکرێت)) خرایەڕوو. لێنین لەم کتێبەدا ستراتیژییەکی نوێ دەخاتە ڕوو بۆ ڕێکخستنی شۆڕشی سۆسیالیستی. ناوەڕۆکی سەرەکیی بۆچوونی لێنین لەم کتێبەدا





ئەوەیە کە بۆ گواستنەوەی هۆشیاری بۆ کرێکاران و ڕێکخستنی شۆڕشی سۆسیالیستی پێویستمان بە پارتێکی زۆر ڕێك و پێك و پێکهاتوو لە شۆڕشگێڕانی پرۆفیشناڵ هەیە. دەبێت ئەم پارتە کاری خۆی تەرخان بکات بۆ گواستنەوەی هۆشیاری بۆ کرێکاران و ڕێکخستنیان بۆ شۆڕش. ئەگەر کرێکاران بە حاڵی خۆیانەوە وازیان لێ بهێنرێت ناتوانن لە چوار چێوەی هۆشیاری سەندیکایی و بزووتنەوەی سەندیکایی زیاتر هەنگاو بنێین. ئەم بۆچوونەی لێنین لە کۆنگرەی پارتی سۆسیال دیموکراتی ڕووسیادا لە لەندەن (١٩٠٣) زۆربەی کەسە چالاکە مارکسیستەکانی ڕووسیای بەرەو خۆی ڕاکێشاو بووە هۆی دابەشکردنی ئەم پارتە بۆ کۆمەڵی زۆرینە (بەلشەڤیك) و کەمینە (مەنشەڤیك). پاشتر لێنین دانی بەوەدا نا کە لەم کتێبەدا لە بەرامبەر زیادەڕەوی نەیارە سیاسییەکانی لە بزووتنەوەی مارکسیستیدا تووشی زیادەڕەوی هاتووە لە پاش ساڵی ١٩١٧ چیدی سەر لە نوێ ئەم کتێبەی چاپ نەکردووە.

## شۆڕشی بەردەوام

تیۆرییەکەی دیکەی لێنین کە لە لایەن لایەنگرانیەوە بە داهێنان لە مارکسیزمدا و لە لایەن نەیارەکانیشییەوە بە لادان لەم تەوژمە هزریە لەقەڵەمدەدرێت بریتییە لە تیۆرییەك کە هەندێ کات بە تیۆری شۆڕشی بەردەوام ناودەبرێت. لێنین لە کتێبی ((دوو تاکتیکی سۆسیال دیموکراتی)) لە ناکۆکی لەگەڵ مەنشەڤیکەکاندا سەبارەت بە ستراتیژی شۆڕش بۆچوونێکی نوێ دێنێتە پێشەوە. مەنشەڤیکەکان بەپێی تێگەیشتنی کلاسیکی مارکسیزم لەو بڕوایەدا بوون کە شۆڕشی سۆسیالیستی پاش شۆڕشی بۆرژوازی سەرهەڵدەدات و سەرەتا پێویستە مارکسیستەکان چاوەڕوانی تێپەڕاندنی شۆڕشی بۆرژوازی بن. بۆچوونی ئەمان وابوو کە دەبێت لە هەلومەرجی



ڕووسیادا بۆ ئەنجام گەیاندنی شۆڕشی بۆرژوازی لەگەڵ لیبراڵەکاندا هاوکاری یەك بکەن. بەڵام لێنین لە کتێبی ناوبراودا وەها بەڵگەی هێنایەوە کە دەکرێت لە شۆڕشێکی دیموکراتیدا بە ڕابەری پرۆلیتاریا شۆڕشی بۆرژوازی ببەسترێتەوە بە شۆڕشی سۆسیالیستییەوە. وەها شۆڕشێك هێشتا لە سروشتی خۆیدا بۆرژوازییە بەڵام بە ڕابەری پرۆلیتاریا و یەکێتی کرێکاران و جوتیاران دەتوانن لەبەرەو پێشبردنیدا قۆناغی شۆڕشی بۆرژوازی بەئەنجامبگەیەنن و ئەو کات بۆ قۆناغی شۆڕشی سۆسیالیستی پەروەردەی بکەن. بەکردەوە شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ڕووسیادا (١٩١٧) بەم تاکتیکە بە بەرهەم گەیشت.

لە ساڵی ١٩١٧دا دوو شۆڕش دروستبوون. یەکەم شۆڕشی شوبات بوو کە تیایدا پاش ڕووخانی حکوومەتی تزار دەوڵەتێکی کاتی لە ڕووسیادا هاتە سەر حوکم. کاتێك کە ئەم دەوڵەتە خۆی بە دوور گرت لە چاکسازی زەوی و زار، لێنین داواکاری زەوی جوتیارانی خستە نێو بەرنامەی کاری خۆیەوە و کەوتە ڕووبەڕووبوونەوەی حکوومەتی کاتی و بەستراتیژیی یەکێتی کرێکاران و جوتیاران شۆڕشی ئۆکتۆبەری ڕێکخست.

## ئیمپریالیزم و شۆڕشی سۆسیالیستی

گرنگترین دەستکەوتی لێنین لە برەوپێدان و تەواوکردنی تیۆرییە مارکسیستییەکاندا بریتییە لە تیۆری ئیمپرایالیزمی ناوبراو. بەر لە لێنین هەندێك لە مارکسیستەکان چەند تیۆرییەکیان خستبووە ڕوو دەربارەی ئیمپریالیزم و هۆکار و ناوەرکەکەی. لە سەردەمی مارکس خۆیدا هێشتا سەرمایەداری ڕکابەری زاڵ بوو و سەرمایەداری بەواتا تەکنیکییەکەی زاراوەکە نەچوو بووە ناو ((قۆناغی ئیمپریالیستی))یەوە.





پاش مارکس شۆێنکەوتوانی و لەوانەیش کاوتسکی و روزا لۆگزامبۆرگ و هیلفردینگ چەند باسێکیان دەستپێکردبوو سەبارەت بە ئیمپریالیزم. مارکسیستەکانی پێش لێنین بە گشتی سەرهەڵدانی دیاردەیەکی وەکو ئیمپریالیزمیان دەگەڕاندەوە بۆ زیادە بەرهەمهێنانی ناوخۆیی یاخود رووەکەی دیکەی واتە لە ئاستی پێویست نەبوونی بەکارهێنانی ناوخۆیی لە وڵاتە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا و پێویستی بە بوونی بازاڕی دەرەکی، هەر بۆیە ئەمەیان بەزەروورەتی دەست بەسەراگرتنی سەر زەوییەکانی ئەو بەردەریاکان لەقەڵەمدەدا.

لێنین بە تێپەڕین لە سەرمایەداری رکابەرییەوە بۆ سەرمایەداری مۆنۆپۆڵی ئیمپریالیزمی روونکردەوە و لە شوێنی خۆیدا ئەم قۆناغە دەبەستێتەوە بە شۆڕشی سۆسیالیستییەوە بەم جۆرە تیۆری ئیمپریالیزم بە شێکە لە تیۆری گشتی لێنین دەربارەی شۆڕشی سۆسیالیستی و ئەگەری سەرهەڵدانی وەها شۆڕشێك لە وڵاتێکی دواکەوتووی وەکو رووسیادا. لێنین لە تیۆرەکەی خۆیدا سوودی لە تیۆری کۆکردنەوەی مارکس وەرگرت. بە بۆچوونی لێنین دەبێت لە یاسای روو لە دابەزینی بەهای قازانجدا بە دوای بنەمای ئیمپریالیزمدا بگەڕێین. بەپێی ئەم یاسایە بە بەرزەوە بوونی پێکهاتەی ئۆرگانیکی سەرمایە (بە زمانێکی سادەتر بە بەرزەوەبوونی گەشەی تەکنەلۆژی و بە گشتی بوونی لە بەرهەمدا) بەهای قازانج کەم دەبێتەوە. بۆیە سەرمایەدارەکان بۆ گەیشتن بە بەهای قازانجێکی زۆرتر سەرمایەکانی خۆیان دەنێرنە ئەو وڵاتانەی کە تیایاندا پێکهاتەی ئۆرگانیکی سەرمایە (گەشەی تەکنەلۆژی) نزمترە و بەهای قازانجیش زۆرترە.

لێنین لە کتێبی ((ئیمپریالیزم دوایین قۆناغی گەشەی سەرمایەداری)) (١٩١٦) ئیمپریالیزمی بە سەرمایەداری لە قۆناغی مۆنۆپۆلیدا پێناسەکرد. سەرمایەداری مۆنۆپۆلی بەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە وەدیاردەکەوێت:



١- کەڵەکەبوونی بەرهەم و سەرمایە.

٢- تێکەڵکردنی سەرمایەی پیشەسازی و دارایی و زاڵکردنی سەرمایەی دارایی بە سەر سەرمایەی پیشەسازیدا.

٣- زیادکردنی گرنگی ناردنی سەرمایە بە بەراورد لەگەڵ ناردنی کەل و پەل.

٤- دابەشکردنی بازارەکان و شەڕکردن لەسەر دووبارە دابەشکردنەوەی بازاڕەکان.

هەر بۆیەش لێنین شەڕی یەکەمی جیهانی بە شەڕی ئیمپرایالیستی لەقەڵەمدەدا و کرێکارانی جیهانی بانگهێشت کرد لە بری شەڕکردن لەگەڵ یەکدی لە ژێر دروشمی درۆیینی ئابڕووی نیشتمانی لەگەڵ یەکتردا یەکبگرن و بکەونە ململانێ لە دژی سیستەمی سەرمایەداری.

لێنین پێیوابوو کە دیاردەی ئیمپریالیزم ناوەڕۆکی سەرمایەداریی گۆڕیوە و زەرورەتی دووبارە پێداچوونەوەی ستراتیژی شۆڕشی هێناوەتە ئاراوە. بە پێی بۆچوونی ئەو سەرمایەداری تایبەتی لە دوو رووی سەرکییەوە بارێکی نوێی دروستکردووە کە دەبێت لە رێکخستنی شۆڕشی سۆسیالیستیدا بە وردی لەبەر چاو بگیردرێن، یەکەم ئەوەی کە سەرمایەداری مۆنۆپۆلی هاوکاتە لەگەڵ گەشەی ناهاوسەنگی وڵاتانی دەوروبەری سیستەمی سەرمایەداری جیهانی. ئەم کارە چەند زنجیرەیەکی لاوازی دروستکردووە کە دەبێت شۆڕشی جیهانی سۆسیالیستی لەم زنجیرە لاوازانەوە (کە رووسیا بە یەکێك لەوانە دەژمێردرا) دەستپێبکات. دووەم، بەهرەکێشی ئیمپریالیستی و گواستنەوەی بەر بلاوی سامان بۆ وڵاتە سەرمایەدارەکان ئەو توانایەی بەخشیوەتە دەوڵەتە سەرمایەردارەکان کە باری ئابووری وڵات باشتر بکەن و گیانی شۆڕشگێری کرێکاران لاواز بکەن.





پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر پاڵپشتیکردنی بزووتنەوە ئازادیخوازەکان لە لایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە بەم تیۆرییە ئاراستەدەکرا. بەو واتایەی کە دەوترا بە ئازادکردنی وڵاتە داگیرکراوەکان و ڕێگرتن لە تاڵان کردنیان ئەو هەل و مەرجە لەناو دەبرێت کە دەبێتە هۆی لاوازکردنی وەرەی کرێکارانی وڵاتە سەرمایەدارییەکان. بەم پێیە سەرکەوتن لە بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتمانییەکان یەکێکە لە بنەماکانی سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستی جیهانی.



**یادداشتەکان:**

1- David Marsh and Gerry stoker, Theory and Methods in political Science, palgrare Macmillan, 2002, p.153.

٢- ئەوەی کە بەناوی ئینتەرناسیۆنال ناسراوە بریتییە لە کۆمەڵەیەك کە بۆ یەکەمین جار مارکس و ئەنگلس بۆ هەماهەنگ کردنی بزووتنەوەی کرێکاری دایانمەزراند. ناوی فەرمی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوو لە ئەنجوومەنی ئینتەرناسیۆنالی کرێکاران کە لە ساڵی ١٨٦٤ لە لایەن مارکسەوە کرایەوە. ئەم ئینتەرناسیۆنالە بە ناوی ئینتەرناسیۆنالی یەکەم ناسرا. ئینتەرناسیۆنالی دووەم لە ساڵی ١٨٨٩ دامەزراو لە ساڵی ١٩١٤ بە دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان سۆسیالیستەکان و کۆمۆنیستەکان هەڵوەشایەوە.

3- Vincent Geoghegan, in Robert Ecdeshallet al, political Ideologies, London and Newyork, Routledge, Third edition 2003, p. 87.

# پاژی سێهەم

## بۆچوونە فەلسەفی و هیگلییەکان لە مارکسیزمدا

### بۆچوونە نوێیەکان لە مارکسیزمدا

لە کاردانەوەی بۆچوونە ئۆرتۆدۆکسییەکانی ناو مارکسیزم کە مارکسیزمی بەرەو جۆرێك ماتریالیزمی نا پەسەند پەلکێش کردبوو، هەروەها لە بەرامبەر پێداچوونەوەی کردارگەرایانەی لێنین و ستالین کە مارکسیزمی گۆڕی بوو بۆ ستراتیژی بەدەستهێنانی دەسەلات لە لایەن رێکخراوە بچووکەکانی شۆڕشگێڕە پرۆفیشناڵەکان گوزارشتێکی نوێ بۆ مارکسیزم دورستبوو کە بەپێی دیارخەرە جیاوازەکانی بەناونیشانە مارکسیزمی هیگڵی و مارکسیزمی مرۆڤگەرایی و مارکسیزمی رۆژئاوایی ناوبراوە. ئەم بۆچوونە لە بەرامبەر تێگەیشتنی ئابووریگەرایانەی مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکسی وەکو رێگەی دەربازبوون پشتی بە لایەنە هیگڵییەکانی مارکسیزم و لە بەرامبەر تێگەیشتنە کرداگەرایانەکانی مارکسیزم-لێنینیزم پشتی بە پانتایی کۆمەڵی کەلتووری سۆسیالیستی دەبەست.

هەروەك باسکرا بۆچوونی ئۆرتۆدۆکسیی مارکسیزم بە دیارخەرگەلێکی وەکو ئابووریگەرایی و پێکهاتەگەرایی و پۆزیتڤیستییەوە ناسرا، هەروەك چۆن دەربڕینی کردارگەرایی کە لە نێوان بەلشەڤیکەکاندا گەشەیکرد بەپشتبەستن بە ستراتیژی گۆڕانساز و گونجاندنی مارکسیزم لەگەڵ هەلومەرجی کۆمەڵگا دواکەوتوو و تازە گەشە کردووەکان دەناسرێتەوە. بۆچوونی مرۆڤگەرایی لە مارکسیزمدا لە بەرامبەر بۆچوونی ئابوورگەرای و پۆزیتڤیستی لە لایەك و بچووککردنەوەی مارکسیزم بۆ



ستراتیژی کۆمەڵی بچووکی شۆڕشگێڕە پرۆفێشناڵەکان لە لایەکی ترەوە رووی کردە چەمکگەلێکی وەکو گشتی بوونی کۆمەڵایەتی و دیالێکتیك و نامۆبوون و بەشت بوون و پیشەسازی کەلتوور و پشتی بە لایەنە رەخنەییەکانی مارکسیزم بەست. (لە باسەکانی پاشتردا سەبارەت بەم چەمکانە روونکردنەوەی زیاتر دەخەینەڕوو).

لە هەمانکاتدا ئەم جۆرە بۆچوونە نوێیانەی ناو مارکسیزم رەنگدانەوی رووداو و ئەزموونە مێژووییەکانی رابردوو، بۆچوونی ئۆرتۆدۆکسی مارکسیزم بە شتێکی زۆری سەرمایەی سیاسی و هزری خۆی ئاراستەی ئەو واتایە کردبوو کە بزاوتنی مێژوو بەشێوەیەکی ناچاری و زۆرەکی رۆژێك دەگاتە گۆڕانی سەرمایەداری و سەرماداریش دەکەوێتە سەر رێرەوەی سۆسیالیزم. بەڵام شکستی یەك لە دوای یەکی بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و بەردەوامی تەمەنی سەرمایەداری بە شێوەیەکی جدی بانگەشەکانی بۆچوونە ئۆرتۆدۆکسییەکانی خستەگومانەوە. بە شتێکی زۆری مارکسیستەکان و لەوانەش ئەو مارکسیستانەی کە لەم پاژەدا باسیان لێوە دەکەین سەرکەوتنی بەلشە ڤیزمیان لە رووسیادا بە سەرکەوتنی سۆسیالیزم دانەدەنا، چونکە ئەوەی کە لە سۆڤیەتدا تێدەپەڕی زۆر نەدەگونجا لەگەڵ ئامانجە مرۆڤدۆستانە و دیموکراتییەکانی مارکسیزمدا. بەم جۆرە بۆچوونی ناوبراو لە هەمانکاتدا رەنگدانەوەی بە ئەنجام نەگەیشتنیشە لە ئارەزووە گەورەکاندا.

جگە لە هەموو ئەمانەش بۆچوونە نوێیەکانی مارکسیزم سوودی لە پێشکەوتنە نوێیەکانی تەواوی بوارەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان وەرگرت و گەنجینەی کەلتووری ئەم تەوژمە هزرییەی دەوڵەمەند کرد. بە شتێکی زۆری ئەو مارکسیستانەی کە لێرەدا بە کورتی باسیان لێوە دەکەین لە کاتی خۆیدا لە رۆشنبیرانی نوخبەی ئەورووپا بوون. لە باسەکانی خوارەوەدا هەندێك لە گرنگترین جموجۆڵەکانی ئەم تەوژمە هزرییە دەخەینەڕوو.





## ١- ماركسیزمی فەلسەفی

سەرەتا بۆچوونە نوێیەكانی ماركسیزم بە كارەكانی بیرمەندانێكی وەكو لۆكاش و گرامشی دەستی پێكردوو لە نووسینەكانی كەسانێكی وەكو هۆركهایمەر و ئادۆرنۆ و ماركۆزەدا كامڵبوو و لە ئەنجامدا لە تیۆرەكانی هابرماسدا گەیشتە وێستگەیەكی نوێ. ئێمە لێرەدا یەكەمین هەنگاوەكانی ئەم تەوژمە هزرییە لە ژێر ناونیشانی ماركسیزمی فەلسەفی و هەنگاوەكانی پاشتری لە قۆناغێكی نوێدا لە ژێر ناونیشانی ماركسیزمی رەخنەیی بەشێوەیەكی چڕ دەخەینەڕوو.

### لۆكاش و چەمكی نامۆبوونی ماركس

گیۆرگ لۆكاش (١٨٨٥-١٩٧١) یەكێكە لە فەیلەسووفە دیارەكانی ماركسیست و لەو كەسانەیە كە ماركسیزمی لەگەڵ چەند لایەنێكی هیگڵیزمدا ئاوێتە كردووە. لۆكاش لە رووی رەچەڵەكەوە خەڵكی هەنگاریایە و لە بوداپێست لەدایكبووە، بەڵام لە ئەڵمانیا و لە زانكۆی بەرلین خوێندنی تەواو كردووە. لە هەمانكاتدا لۆكاش سیاسییەكی چالاك بووە و لە یەكێتیە كرێكارییەكان و پارتی كۆمونیستدا كاری دەكرد. لۆكاش بە یەكەمین كتێبی گرنگی فەلسەفی خۆی بە ناویشانی ((مێژوو و هۆشیاری چینایەتی)) (١٩٢٣) جەختی لەسەر بابەتی پەیوەندی نێوان تیۆری و كردار كردەوە لە تێڕوانینی دیالێكتیكیدا و لە دوایین كتێبیشیدا بە ناونیشانی ((هیگڵی لاو)) (١٩٤٨) بابەتی كاریگەری راستەخۆی هیگڵ لەسەر ماركسی روونكردەوە. [1] بەم جۆرە بە یەكێك لەكەسەدیارەكانی ماركسیزمی هیگڵی یاخود ماركسیزمی فەلسەفی دەژمێردرێت.

دەتوانین لە چەمكگەلێكی وەكو گشتێتی كۆمەڵایەتی و نامۆبوون و بەشت كرددا بە دوای رەهەندە سەرەكییەكانی هزری لۆكاشدا بگەڕێین. ئەم چەمكانە و



شوێنگەیان لەناو سیستەمی هزریی لۆكاشدا لەگەڵ ئەوەی نیشاندەری چەند خاڵێكی دیكەی جەخت كردنەوەی نوێیە لە ماركسیزمدا، كە جیاوازە لە بۆچوونی ئابووریگەرایانەی كاوتسكی و بۆچوونی كردارگەرایانەی لێنین و ستالین، لە هەمانكاتدا دیارخەری هەوڵێكی نوێنە بۆ نوێژەنكردنەوەی فەلسەفەی ماركس بە گەڕانەوە بۆ هەندێك لە بناغە هیگڵییەكانی.

### نامۆبوون و كۆمەڵگای بۆرژوازی

لە بەرگی دووەمدا سەبارەت بە چەمكی نامۆبوون لە هزری ماركسدا روونكردنەوەیەكی كورتمان خستەڕوو. هەروەك باسكرا ماركس لەوێدا نامۆبوون وەكو پرۆسەیەك شیدەكاتەوە كە تیایدا بەرهەمی كاری زەینی و راستینەی مرۆڤ لێی جیادەبێتەوە و وەك كاڵا و ئامرازی سەركوت و وەهمە میتافیزیكییەكان لە بەرامبەر ئەو و لە رووبەڕوویدا رادەوستن. سەرچاوەی بەشتێكی زۆری رووە نارێكەكانی مێژووی رابردووی مرۆڤ تاسەردەمی ئێمە لێرەوەیە. ماركس لە دەستنوسە فەلسەفی و ئابوورییەكان (كە لۆكاش و ماركسیستە هاوبیرەكانی ئەو لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ ئەمانە)دا بە سوودوەرگرتنی لە شێوازی دیالێكتیكی هیگڵی چەمكی نامۆبوونی بە چەمكێكی گشتی و بە تێڕوانینی سەرتاسەری مێژووی مرۆیی بەكاربردووە. ماركس لێرەدا جەختی لەسەر ئەم باسە كردبووە و كە ژیانی بە كۆمەڵ و موڵكداری هاوبەشی خێڵەكی بە سەرهەڵدانی موڵكداری تایبەتی نكۆڵی لێكرا. ئەم لە ناوچوونە هەلومەرجی نامۆبوونی فەراهەمكرد كە تەواوی مێژووی مرۆیی تووش كردووە. ئێستا مرۆڤ بە تێپەڕاندنی قۆناغەكانی كامڵبوون گەیشتووەتە خاڵێك كە دەكرێت لە چوارچێوەی سۆسیالیزمدا موڵكداری تایبەتی رەت بكرێتەوە. بەرەتكردنەوەی ئەمەش (كە لە راستیدا بەشێوەی





دیالێکتیکی هیگڵی بریتییە لە ڕەتکردنەوەی نکۆڵی لێکردن دووبارە مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ بە خود بوونی خۆی. هەڵسوڕێنەری ئەم قۆناغەی مێژوو و ئەم ڕەتکردنەوەی نکۆڵییە بریتییە لە پرۆلیتاریا. بە هەرحاڵ نامۆبوون باجێك بووە كە دەبوو مرۆڤ بۆ گەیشتن بە قۆناغی نوێی شارستانیەتی خۆی بیدات.

مارکس لە بەرهەمەکانی پاشتری خۆیدا سەرنجی دابووە سەر دوو چەمکی شیکاری تر واتە هێزەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان. بەڵام بە لەبەر چاوگرتنی ئەو بەد حاڵیبوونانەی کە لە بۆچوونە ئۆرتۆدۆکسییەکاندا بۆ ئەم دوو چەمکە دروستببوو و تیایدا چەند شتێك و لەوانەش ئەوەی کە مارکسییەکان بە سەرخانی کەلتووری ناویان دەبرد فەرامۆش کرابوون. لۆکاش جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ چەمکی نامۆبوون لە بەرهەمەکانی یەکەمی مارکسدا تاوەکو لایەك هۆکاری بەردەوام بوونی سیستەمی سەرمایەداری شیبکاتەوە و لە لایەکی ترەوە بوارێکی نوێ بکاتەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە دژی ئەم سیستەمە. بەم جۆرە بوو کە لۆکاش کۆمەڵگای هاوچەرخی وەکو دیارخەری نامۆبوون و بەشت بوونی خستەبەر ڕەخنە.

## گوزارشتی گشتی کۆمەڵایەتی

لۆکاش لەو بڕوایەدا بوو کە دەبێت کۆمەڵگا وەکو گشتێکی پێکهاتوو لە زەین و بینراو سەیر بکرێ و لێی بکۆڵرێتەوە. بە بۆچوونی ئەو دامەزراوەکان، پرۆسەکان و ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان وەکو بەراستینە بوونی گیانی لە خۆنامۆبوون. دەبێت کۆمەڵگا وەکو گشتێك لەبەر چاوبگیردرێت نەك بەشێوەی زنجیرە بەشێك کە بە تەواوی ڕەنگدانەوەی پەیوەندییە ئابوورییەکانن. هەروەها گۆڕانی کۆمەڵگا وەکو گشتێك کارێکی ئاساییە، بەڵام نەك (هەروەك چۆن ئۆرتۆدۆکسی باسی دەکات) بە



گۆڕانی پەیوەندییە ئابوورییەکان یاخود (بەو جۆرەی کە بۆچوونی لێنینی دەیەوێت) بە گۆڕانی پەیوەندییە سیاسییەکان. پرۆلیتاریا وەکو چینێك تەنها چینێکە کە لەبەر پێگە مێژووییەکەی وەکو گشتێکی یەکگرتوو سەیری کۆمەڵگا دەکات و وەکو گشتێك بەرەو گۆڕانی هەنگاو دەنێت.

کێشەکە لەوەدایە کە هەر سیستەمێکی هزری گەر کۆمەڵگا بە توشبووی نامۆبوون و دیلی هۆشیاری درۆیین بزانێت ئەوا ڕووبەڕووی ئەم پارادۆکسە دەبێتەوە کە بەدەستهێنانی هۆشیاری ڕاستەقینە لەوەها کۆمەڵگایەکدا چۆن دێتەدی.

مارکس بەم جۆرە ئەم لوغزەی حەلدەکرد کە دەیوت پەیامی چینایەتی پرۆلیتاریا لە کاتی بە دەستهێنانی هۆشیاری چینایەتی هاووێنەیە لەگەڵ پەیامە مێژووییەکەی لە ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی. هۆشیاری چینایەتی پرۆلیتاریا وەکو هۆشیاری مرۆڤە دەربارەی ڕەوشی خۆی و ڕزگاربوونە لە هۆشیاری یاخود هەستی درۆیین. لۆکاش دابەشبوونی گشتێتی کۆمەڵگا بۆ چەند بەشێك و لەوانەش جیاوازی زەین و ڕاستینە بە دیاردەکانی لە خۆنامۆبوون لە قەڵەمدەدات. کاتێك کە ڕاستینە و هۆش واتە ڕاستینە دەرەکییەکان و زانیاری ئێمە سەبارەت بەو ڕاستیانەی بە دروستی لەگەڵ یەکدا کۆببنەوە ئێمە باری هۆشیاری درۆیین و نامۆبوون تێدەپەڕێنین. لەوەها دۆخێکدا بەواتایەك ئێمە ڕەوشی بەشت کرد لەناو کۆمەڵگادا هەست پێ دەکەین و دەیگۆڕین.





## بەشت کردوویی

بەشت کردوویی واتە ئەوەی کە دیاردە و راستییەکانی نێو کۆمەڵگا کە مێژوویی و کاتی و بەرهەمی کاری بابەتی و زەینین وەکو کارێکی سروشتی و هەتایی و چەسپاو سەروو مێژوویی تەماشا بکەین. ئەو پەیوەندییانەی کە لە کۆمەڵگادا بەرچاومان دەکەون وەکو دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆچینەکان و هەبوونی موڵکداریی تایبەتی و تەواوی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان هەموو بەرهەمی مێژوون. رۆژێك بەپێی زەروورەتێك هاتوونە بوون و رۆژێکیش بە پێی زەروورەتێك دەگۆڕێن. بەڵام لە هەموو سەردەمێکدا چینی دەسەڵاتدار ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا دەگونجێت (بۆ نموونە ئیمتیازی دەرەبەگی لە قۆناغی فیۆدالیدا و پەیوەندی نێوان کار و سەرمایە لە سەردەمی سەرمایەداریدا) وەکو راستییەکی ئەزەلی و هەمیشەیی دەناسێنێت. لەوەها بارێکدا بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگا وەکو حکوومەت و ئابووری و سیستەمی خێزان و سیستەمی موڵکداری و کەلتوور وەکو پێکهاتەگەلێکی ئەزەلی و هەمیشەیی و چەسپاو و نەگۆڕ بەر چاوەدەکەون نە وەك کۆمەڵێك پەیوەندی کۆمەڵایەتی و شیاوی گۆڕان. بارودۆخێکی لەم جۆرە پێی دەوترێت بەشت کردوویی.

کۆمەڵگای سەرمایەداری هاوچەرخ بە توندترین شێوە تووشی ئەم بارودۆخە هاتووە. ئەم بارودۆخە دەبێتە رێگر لەبەردەم ئەوە کە ئێمە کۆمەڵگا بەگشتێکی دیالێکتیکی و کاتدار و شیاوی گۆڕان لە قەڵەمبدەین. ئەم بەشت بوونە بەشی خۆی پرۆلتاریاشی گرفتار کردووە. بەو جۆرەی کە لۆکاش دەڵێت دەبێت پرۆلتاریا هۆشیاری بەدەستبێنێت و زاڵبێت بەسەر هەستی درۆیندا و بە گۆڕینی تەواوی بەشەکانی کۆمەڵگا لەوانە ئابووری و حکوومەت و سیاسەت و کەلتوور گۆڕان لە کۆمەڵگادا دروستبکات.



پرسیار لەوەدایە کە بە چ شێوەیەك؟ پرۆلتیاریا چۆن زاڵدەبێت بەسەر بار و دۆخی بەشت کردوویی لە بواری هۆشیاریدا و لەوانەش بەسەر هەستی درۆیندا؟ مارکس لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەیوت چینی کرێکار بە هۆی باری چینایەتی و مێژوویی خۆی لە پرۆسەی کاری راستینە و زەیندا (پراکسیس) دەگاتە هەستێکی لەم جۆرە. بەڵام لێرەدا لۆکاش وەکو لێنین لەو بڕوایەدا بوو کە پرۆلتیاریا بێ توانایە لە ئاست بەدەستهێنانی هەستێکی لەم جۆرەدا و ئەمە رۆشنبیرانن کە دەبێ ئەم چینە بەرەو بەدەستهێنانی ئەم هۆشیارییە رابەرایەتی بکەن. [٢]

## گرامشی و تیۆری هەژموونی و دەسەڵات

ئانتۆنیۆ گرامشی (١٨٩١-١٩٣٧) دارێژەری تیۆریگەلێکە لە ئەنجامدا بوونە رێڕەوی پارتە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپا. گرامشی تیۆردارێژ و سیاسەتوانی ئیتالی لە ساردینی لە دایکبووەو لە زانکۆی تۆرین بەشی زمانناسی خوێندووە. لە سەرەتای لاوێتیدا پەیوەندی بە بزووتنەوەی سەندیکاییەوەکرد کە لە ئیتالیادا گەشەو کارتێکردنێکی زۆری بەدەستهێنابوو. لە ساڵی ١٩١٣ لە پارتی سۆسیالیستی ئیتالیادا دەستی بە چالاکی کرد. لە ساڵی ١٩١٩دا لەگەڵ هاوبیرانیدا رۆژنامەی خاوەن نفووزی ئەردن نۆڤ یان دەکرد، پاش ئەوەی کە پارتی سۆسیالیست تووشی جیابوونەوە هات گرامشی پارتی کۆمۆنیستی ئیتالیای دامەزراند و بووە بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتەکە. لە ساڵی ١٩٢٦ لەگەڵ بە دەسەڵات گەیشتنی فاشیستەکان و لە کاتێکدا کە سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی ئیتالیابوو دەستگیرکراو بڕیاری بیست ساڵ زیندانی کردنی بۆ دەرچوو. سەرەڕای نالەباری تەندروستیشی لە زینداندا هەر چالاك بوو و لە ماوەی پازدە ساڵی گرتنیدا چەندین بابەتی دەربارەی فەلسەفە و سیاسەت و هونەر نووسی و بە شاراوەیی دەینارده دەرەوە. بەشێك لەم نووسینانە بە ناونیشانی یادداشتەکانی زیندان بڵاوکرانەوە. لە ساڵی ١٩٣٧ و ساڵێك دوای ئازادکردنی کۆچیدواییکرد.





## هەژموونی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا

وەکو تەواوی مارکسیستە فەلسەفی و مارکسیستە رۆژئاواییەکان ئەو پرسیارەی کە لە بەردەم گرامشیدا بوو ئەوەبوو کە بۆچی شۆڕشی سۆسیالیستی لە ئەوروپادا بەرفراوان نەبووە و بۆچی پرۆلیتاریا هۆشیاری چینایەتی بەدەستنەهێناوە. بۆ تێگەیشتنی ئەم هاوکێشانە و دۆزینەوەی رێگەچارەیەك بۆ بزووتنەوەی سۆسیالیستی بوو کە گرامش گەیشتە چەمکی هەژموونی و تیۆرییەکی تایبەتی لەم رووە خستەڕوو کە بەناوی خۆیەوە ناسراوە.

چەمکی هەژمونی بریتییە لەوەی کە بۆرژوازی بە هۆی ئەوەی ئایدۆلۆژیاکەی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هەژموونی (سەرکردایەتی) هەیە بۆیە دەتوانێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنێت و پێویست بەوەناکات کە جگە لە کاتی قەیران پەنا بۆ دامودەزگای توندوتیژی خۆی ببات. رابەرایەتی هزری و ئەخلاقی بۆرژوازی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا کۆنترۆڵی سیاسی کۆمەڵگا لە لایەن ئەوەوە مسۆگەردەکات. تێگەیشتن و هەست و زانستی خەڵکی بەرامبەر بە سەرخانی ئایدۆلۆژیای واتە سیاسەت و کەلتوور و ئاین و پەروەردە و فێرکردن کە لە ژێر هەژمونی بۆرژوازیدا سەریهەڵداوە فۆرم وەردەگرێ. خەڵکی لە رێگەی کۆمەڵپەسندییەوە پەیوەندییە بۆرژوازییەکانیان دەکەنە شتێکی ناوخۆیی هەر بۆیە دەسەڵاتی بۆرژوازی بە توندوتیژی لەقەڵەمنادەن.

دەتوانرێت چ بکرێت بۆ زاڵ بوون بەسەر هەژموونی بۆرژوازیدا؟ گرامش بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم هەژمونییە و لەناوبردنی شێوەیەکی سەرەکی و شێوەیەکی لاوەکی دەخاتەڕوو. شێوە سەرەکییەکە بریتییە لە ململانێیەکی چەند لایەنە بە سوودوەرگرتن لە فۆرمە جۆرا و جۆرەکانی رێکخراوەیی وەکو حیزبی و سەندیکایی و پەرلەمانی لە پێناو مەبەستە جیاوازە سیاسی و کەلتووری و هەڵبژاردنەکان و بە



هاوئاهەنگی لەگەڵ تەواوی هێزە پێشکەوتووەکاندا. دەبێت کۆی ئەم خەباتانە بە بەرفراوانکردنی کەلتووری سۆسیالستی وەکو مەرجی پێویستی کارتێکردنی هزری شۆڕشگێری کۆتایی بێت. شۆڕش بەپێچەوانەی ئەوەی کە بەلشەڤیکەکان بە هۆی هەلومەرجی تایبەتی رووسیاوە بە ئەنجامیان گەیاند، تەنها کارێکی رێکخراوەیی نییە. هەر بۆیەش گرامشی بڕوای وابوو کە دەبێت لە روسیادا ئەنجوومەنەکان چالاك بکرێن بۆ کاری کەلتووری و بڕەوپێدان، ئەگینا جگە لە دیکاتۆریەت شتێکی تر چاوەڕوانی شۆڕشی روسیا ناکات. [٣] پارتی کۆمونیستی سۆڤیەت خۆی بەدوورگرت لە چالاك کردنی رۆڵی ئەنجوومەنەکان و لە ئاکامدا ئەوەی کە گرامش و خەڵکانی تر پێشبینیان کردبوو -دیکتاتۆریەت- هاتەدی).

بەم جۆرە سەرکەوتنی سۆسیالیزم پێویستی بە خەباتێکی بەردەوام و بەربلاو و دوور و درێژ هەیە. بەڵام هەموو ئەمانە بە واتای پەسەندکردنی بۆچوونی مارکسیستە ئۆرتۆدۆکسی و پێداچوونەوە خوازەکان نییە. گرامشیش ناکۆك بوو بەرامبەر گۆڕینی مارکسیزم بۆ ستیراتیژی بە دەستهێنانی دەسەڵات لە لایەن لێنینەوە، هەروەها بەرامبەر بە بۆچوونی سۆسیال دیموکراتە نوێیەکان سەبارەت بە تێپەڕینی پلە بە پلە و خۆڕسك بەرەو سۆسیالیزم بۆ بەرەو پێشبردنی سۆسیالیزم. گرامشی پێی وابوو کە دەبێت لە ئەنجامدا هێزی شۆڕشگێڕ دەسەڵاتی دەوڵەت بگرێتە دەست.

بەڵام شێوەی لاوەکی رووخاندنی هەژموونی بۆرژوازی بریتییە لە رووبەڕوووبوونەوەی راستەوخۆ کە لە رەوشی ئێستادا و بەرچاوگرتنی نەمانی گیانی شۆڕشگێڕی پرۆلیتاریا زۆر جێی ئومێد نییە.





## پێگەی پارتی کۆمۆنیست

بەم جۆرە پێویستە جەماوەر بۆ ئامادەکردنی پێش مەرجەکانی شۆڕش تائاستی خود ئاگایی شۆرشگێڕی بەرەو پێشەوەبچن. دەبێت خود ئاگاییە شۆرشگێریە لە لایەن پارتی شۆرشگێڕەوە بگوازرێتەوە بۆ جەماوەر. پارتی شۆڕشگێڕ تەنها رێکخراوێکە کە دەتوانێت بگاتە گشتێتی کۆمەلایەتی و لە نێوان خەلکیدا برەوی پێبدات تاوەکو هەژموونی نوێ، واتە هەژموونی کەلتووری سۆسیالیستی لە نێوان جەماوەردا زالبیبێت. گرامشیش وەکو لۆکاش پێی وابوو کە چینی کرێکار بەشێوەیەکی خۆرسکی ناگاتە هۆشیاری چینایەتی و پەیامی خۆی. دەبێت پارتی کۆمۆنیست وەکو هێزی پێشرەو هۆشیاری شۆرشگێڕی بگوازێتەوە بۆ ناو جەماوەر. گرامشی لە کتێبی ((میری نوێ))دا پارتی کۆمۆنیست بە میری ماکیاڤیللی دەچوێنێت کە دەتوانێت جەماوەر بۆ دروستکردنی کۆمەلگا رێکبخات.

گرامشی رۆشنبیرانی دابەشدەکات بۆ دوو کۆمەلی رۆشنبیرانی کلاسیکی و رۆشنبیرانی ئۆرگانیك. رۆشنبیرانی کلاسیکی پەیوەستن بە چینە دەسەلاتدارەکانەوە و رۆلی بە کۆمەلایەتی کردنی سیاسی بە ئەنجام دەگەیەنن بۆ ئەم چینە. بەلام رۆشنبیرانی ئۆرگانیك ئەو کەسانەن کە لە چینی دەسەلاتدار دادەبرین و پەیوەندی بە چینی ئایندەسازانەوە دەکەن.

تیۆرییەکانی گرامشی کاریگەرییەکی زۆری کردووەتە سەر ((کۆمونیزمی ئەوروپی)).



## ٢- مارکسیزمی رەخنەیی و قوتابخانەی فرانکفۆرت تیۆری رەخنەیی

لە سالەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ رەوتێکی گرنگی بیرکردنەوە لە کۆمەلگا رۆژئاواییەکاندا دەستی کرد کە بە تیۆریی رەخنەیی ناسراوە. ئەم رەوتە بە تایبەتی پەیوەستە بەسەرچاوەیەکەوە کە بە ((قوتابخانەی فرانکفۆرت)) ناو دەبرێت. زاراوەی ((تیۆری رەخنەیی)) ئەم واتایە لە خۆدەگرێت کە ئەم هزرە هەولدەدات بۆ دۆزینەوەی پێکهاتەکانی ژێرەوەی کۆمەلگای هاوچەرخ و هەلسەنگاندنی پێگەیەکی تیۆری ئامادەبکات. لێرەدا مارکسیزم وەکو تیۆرییەك بۆ شیکردنەوەی کەم و کورتییە بنەڕەتیەکانی کۆمەلگای سەرمایەداری هاوچەرخ و نیشاندانی رێگەی لە دەربازبوونی بە کاردێت. تیۆری رەخنەیی کە ئێستا یۆرگن هابرماس نوێنەری مەزنێتی چەند نەوەیەکی مارکسیستەکان لە هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆوە بگرە هەتا مارکۆزە و هابرماس لە خۆدەگرێت.

ئەگەرچی مارکسیستەکانی پەیوەست بەم رەوتە هزرییە بناغەی تێڕوانینی خۆیان لە مارکسەوە وەرگرتووە بەلام چەند لایەنێکی هزرەکانی هیگل و کانت و ڤیبەر و فرۆید و هۆرسل و هەندێکی تر لە زانایانی هاوچەرخیان بۆ نووژەنکردنەوەی هزری مارکس بەکارهێناوە بە جۆرێك کە لە هەندێ کاتدا جۆری شیکردنەوەکەیان تارادەیەکی بەرچاو لە شێوەی شیکردنەوەی مارکس دووركەوتووەتەوە.

مەبەستی سەرەکی هێرشی تیۆری رەخنەیی بریتییە لە هۆشیاری درۆیین لە کۆمەلگای سەرمایەداری هاوچەرخ و ئەو پرسانەی کە خالی جێی سەرنجی مارکسیستگەلێکی وەکو لۆکاش و گرامشی بوون. پۆزیتڤیزم لە زانستە کۆمەلایەتییەکاندا وەکو زانستی بەشت بوون بە یەکێك لەوان دادەنرێت.

## هورکهایمەر، رەخنەی پۆزیتڤیزم و گەڕانەوە بۆ پراکسیس

ماکس هورکهایمەر یەکێکە لە دامەزرێنەران و کەسە سەرەکییەکانی ئەو قوتابخانەیەی کە بە قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسراوە. قوتابخانەی فرانکفۆرت لە لایەن کۆمەڵێك لەو مارکسیستانەی کە پەیوەست بوون بە زانکۆی فرانکفۆرتەوە (وەکو قوتابی و مامۆستا) دامەزرا و ناوی خۆشی لەم زانکۆیەوە وەرگرتووە. لە بنەڕەتدا ئەم قوتابخانەیە وەکو دامەزراوەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ لێکۆڵینەوەی قووڵی بنەما تیۆرەکانی مارکسیزم و دۆزینەوەی رەگ و ریشەی هەڵەکانی رابردوو و لە کۆتایشدا نۆژەنکردنەوەی مارکسیزم دامەزراوە [٤]. یەکێك لە خاڵەکانی وردبوونەوەی قوتابخانەی فرنکفۆرت لە پیاچوونەوەی مارکسیزم بریتی بوو لە جیاکردنەوەو شیکردنەوەی پەیوەندی نێوان تیۆری و کردار. قوتابخانەی فرانکفۆرت مارکسیستگەلێکی زۆری لە دەوری خۆی کۆکردەوە و چەندین لێکۆڵینەوە و باس و کۆڕی بەرفراوانی بەرێخست کە ئەنجامەکەی بریتی بوو لە دروستبوونی تیۆری رەخنەیی.

هۆرکهایمەری کە لە کەسایەتییە سەرەتاییەکانی ئەم بۆچوونە بوو لە خێزانێکی خاوەن کارگەی ئیشتۆتگارت لە دایکبووە. خوێندنی خۆی لە بواری دەروونناسی و پاشان فەلسەفە تەواوکرد و لە زانکۆی فرانکفۆرت دەستی بەوانە وتنەوەکرد. وەکو زۆربەی لایەنگرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ژیانێکی پڕ لە هەڵبەز و دابەزی بەسەربرد، چونکە لەگەڵ بە دەسەڵات گەیشتنی فاشیستەکان ناچار بوو بەرەو ئەمریکا کۆچبکات و ماوەیەك لەویدا درێژە بە کارەکانی بدات.

### رەخنەگرتن لە پۆزیتیڤیزم

هۆرکهایمەر وەکو یەکێك لە دامەزرێنەرانی دامەزراوەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان و یەکێك لە رەخنەگرانی بۆچوونی ئۆرتۆدۆکس لە مارکسیزمدا



بابەتی پۆزەتیڤیزمی کردە ناونیشانی کارەکەی خۆی. بە بۆچوونی ئەو تەواوی بیرمەندانی تیۆری رەخنەی پۆزیتڤیزم رێگری سەرەکی ناسینی راستییەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری و رەتکردنەوەی ئەم راستیانەن.

پۆزیتڤیزم لە فەلسەفەدا لەرووی بووناسییەوە لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزراوە کە زەین یاخود ناسێنەر لە سەربەخۆیە لە راستینە (جیهانی دەرەوە) و لە رووی مەعریفەناسیشەوە لەسەر ئەو هزرە دامەزراوە کە ئەزموون بنەمای زانستە. لە کۆمەڵناسیشدا پشت بەو هزرە دەبەستێت کە دەکرێت زانستی کۆمەڵایەتیش وەکو زانستی سروشتییەکان بە تەواوی زانستی بکرێت و بە یاسا گشتی و یەقینیەکان تۆکمە بکرێت، یەکێك لە لێکۆڵەران بە چوار پرەنسیپ باسی پۆزیتیڤیزم کردووە:

پرەنسپی یەکەم: ئێمە تەنها دەتوانین بگەینە دەرکەوتەی شتەکان (ئەوەی کە دەبینرێت) نەك بوون (ناوەڕۆك)ەکانیان.

پرەنسیپی دووەم: ناسنامە میتافیزیکییەکان ناچنە خانەی زانینە زانستییەکانەوە.

پرەنسیپی سێیەم: دادوەریکردنە بە هاییەکان رەهەندی زانستیان نییە.

پرەنسیپی چوارەم: یەك شێوازی توێژینەوە هەیە بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانستە سروشتییەکان.[٥]

یاخود هەروەك گیدنز، کۆمەڵناسی ناسراوی ئینگلیزی دەڵێت بە بۆچوونی پۆزیتڤیستەکان دەکرێت راستەوخۆ شێوەکانی زانستە سروشتییەکان بۆ کۆمەڵناسی بە کاربرێت و زەین ویستی مرۆڤ رێگری ئەوەنییە کە کرداری کۆمەڵایەتی وەکو شتێك لە دنیای سروشتیدا بخەینەبەر لێکۆڵینەوە. جگە لەمە دەکرێت ئەنجامی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانیش وەکو دەستکەوتی زانستە سروشتییەکان بەشێوەی یاساکان فۆرمۆلە بکرێت.[٦]





هۆرکهایمەر قوتابخانەی ڤەیەنای کە لە سەردەمی ئەودا لە پێگەی پۆزیتڤیزمەوە دەستی پێدەکرد خستەبەر رەخنە. رەخنەی ئەو لە پۆزەتیڤیزم ئەوەیە کە ئەم تێڕوانینە مرۆڤ دەخاتە ریزی روداو و شتە سروشتییەکانەوە و چاوپۆشی دەکات لە جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێوان دیاردە مرۆییەکان و دیاردە سروشتییەکان. هۆرکهایمەر دەڵێت کە پۆزیتڤیزم لە سەردەمێکدا وەکو زانستی بۆرژوازی رۆڵی پێشکەوتوی هەبو بەڵام ئێستا وەکو خودی بۆرژوازی رۆڵە پێشکەوتووەکەی خۆی لە دەست داوە. چیدی ئەم زانستە ناتوانێت بگاتە ناسینی دروستی کۆمەڵگا چونکە لەم حاڵەتەدا دەبێت ناکۆکییەکان قەیرانە قووڵەکانی ئەم کۆمەڵگایە بکاتەوە، ئەمەش وەکو رەتکردنەوەی سیستەمی سەرمایەداری و خودی بۆرژوازیشە.

## گەڕانەوە بۆ پراکسیس و رەخنەگرتن لە ئابووریگەرایی

هۆرکهایمەر دوا بەدوای رەخنەگرتن لە پۆزیتڤیزم ئەم بۆچوونە دەخاتە روو کە لە هەلومەرجی ئێستادا راستییە کۆمەڵایەتییەکان تەنها دەکرێت لە رێگەی دیالێکتیکی و گرنگیدان بە گشتێتی کۆمەڵایەتی (نەك لێکۆڵینەوەی دیاردە پەرت و بڵاو و پارچەپارچەکان بەشێوەیەکی پۆزەتیڤیستی) بێنەدی. ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە تیۆری رەخنەیی بەوەها شێوازێك دەکەوێتە ئاشکراکردنی رووە ناعەقڵانییەکانی سیستەمی سەرمایەداری هاوچەرخ و بۆ دەرباز بوون لەوانەش پێشنیاری رێگای شیاو دەکات. وەها کارێك بە وردبوونەوە لە پراکسیس وەکو تێکەڵکردنی کاری راستینە و زەینی دێتەدی.

تێگەیشتنی ئابووریگەرایانەی مارکسیزم پێکهاتەی بەرهەمهێنان و تەکنولۆژیا بە فاکتەری جەوهەری سیستەمی کۆمەڵایەتی دادەنێت و دەیانخاتە شوێنی پراکسیس. لە کاتێکدا کە تواناکانی بەرهەمهێنان و تەکتولۆژیا بۆ خۆیان بەرهەمی کاری مرۆڤن. بۆیە لە بری پێکهاتەی ئابووری وەکو دیاریکەری پەیوەندییەکان



بەرهەمهێنان و هەلومەرجی کار و هەروەها دامەزراوە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا دەبێت گشتێتی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی دیالێکتیکی نێوان بەشەکانی ئەم گشتە (کە فاکتەرە ژێرخانی و سەرخانییەکان پێکەوە لەبەر چاودەگرێت) لەبەر چاوبگیرێت.

## ئادۆرنۆ، دیالێکتیکی رۆشنگەری و دەسەڵاتی عەقڵی ئامرازی

تیۆدۆر ئادۆرنۆ (١٩٠٣-١٩٦٩) یەکێکە لە کەسە دیارەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت وتیۆری رەخنەیی. ئادۆرنۆ جگە لە فەلسە لە بواری هونەر و جوانیناسیشدا نوسینگەلێکی بەرچاوی هەیە. یەکەمین کتێبی فەلسەفی ئادۆرنۆ بریتییە لە ((دیالێکتیکی رۆشنگەری)) کە بەهاوکاری هۆکهایمەری هاوڕێیی نووسیویەتی. ناسراوترین کتێبیشی بریتییە لە ((دیالێکتیکی نیگەتیڤ)).

## دیالێکتیکی رۆشنگەری

ئادۆرنۆ لە دیالێکتیکی رۆشنگەریدا رەخنەگرتن لە کۆمەڵگای سەرمایەداری تارەخنەگرتن لە هزری رۆشنگەریی بەرەو پێشەوە دەبات. هۆیەکەشی ئەوەیە کە بە بۆچوونی ئادۆرنۆ دۆخی ئێستای کۆمەڵگای سەرمایەداری درێژە و دەرئەنجامی زەرووری لۆژیکی زاڵ بە سەر رۆشنگەریدایە. رۆشنگەری لە دایکبووی عەقڵی ئامرازیە و عەقڵی ئامرازیش زاڵە بەسەر کۆمەڵگای ئێستادا. ئادۆرنۆ رێرەوی مێژووی بەشێوە ڤیبەریەکەی کە بریتییە لە پرۆسەی بە عەقڵانی بوونی کاروبارەکان وەردەگرێت. لە دنیای هاوچەرخدا عەقڵانی بوون بە دەسەڵاتی عەقڵانییەتی ئامرازی کۆتایی دێت. عەقڵانیەتی ئامرازی واتە عەقڵانییەتێك کە تەنها بیر لە پەیوەندی ئامانج-ئامراز دەکاتەوە، لەم رووەوە بنەمای ئەم هاوکێشەیە ئەوەیە کە چ ئامرازێك گونجاوە بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێك. بەوەها تێڕوانینێك بۆ کاروبارەکان بە تەواوی مەبەستی خۆشبەختی مرۆیی لە بیردەکرێت. دەسەڵاتی تەکنولۆژیا و دەسەڵاتی





بۆرۆکراسی و زاڵبوونی جۆرەکانی پەیوەندییە ناپەسەندەکان وەکو نامۆبوون و بەشت کرد و هتد دەرکەوتەی وەها دیاردەیەکن. تەنانەت فاشیزمیش وەکو گەورەترین خراپە (شەڕ)ی کۆمەڵایەتی نیوەی دووەم بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی لە جۆری عەقڵانیەتی ئامرازییە. بەڵگە هێنانەوەی ئادۆرنۆ ئەوەیە کە فاشیزم دژی نوێ بوونەوەنییە بەڵکو درێژەی سروشتی ئەوە. هێزەکانی سەردەمی رۆشنگەری کە بە زاڵ بوون عەقڵی مرۆڤ بەسەر سروشتدا تواناو رەوایی بەدەستدێنن سەرئەنجام لە رێرەوی پێشڤەچوونی خۆیاندا دەگۆڕێن بۆ هێزێکی تێکدەر.

## پیشەسازی کەلتوور

بەم جۆرە ئادۆرنۆ یەکێك لە بەشەکانی تیۆرەییەکەی مارکس کە لەسەر بنەمای جوولەی بەرەو پێشەوەچوونی مێژوو دامەزراوە لەبەر چاوناگرێ و کۆمەڵگای هاوچەرخ لە کۆنترۆڵی جۆرەها هێزە ناعەقڵانییەکاندا دەبینێتەوە. یەکێك لە نیشانەکانی دەسەڵاتی عەقڵانیەتی ئامرازی ئەو شتەیە کە ئادۆرنۆ بە ((پیشەسازی کەلتوور)) ناوی دەبات. پیشەسازی کەلتوور ئامادە سازییەکە کە بۆژروازی بۆ دەستەمۆکردنی هزر و رەفتاری جەماوەر بەکاری دەهێنێ. پیشەسازی کەلتوور بریتییە لە برەوپێدانی جۆرێك لە کەلتووری ستاندارد بە سوودوەرگرتن لە جۆرەها سەرگەرمی ئاست نزم و خەڵك خەڵەتێن کە خەڵك لە چەنگاڵی خۆیاندا دیل دەکەن. (بەرنامەکانی تەلەفیزۆن بە نموونەی دادەنرێت). ئەم کەلتوورە تاکێتی و ئازادی لەناودەبات. بەم جۆرە بەرگری پرۆلیتاریا بەرەو لاوازبوون دەچێت.



## دیالێکتیکی نیگەتیڤ

ئاردۆرنۆ هیچ روانگە و تیۆرییەکی کۆمەڵایەتی بە خاڵی دەستپێك و بە بناغەی بیرکردنەوە دانانێت و پێی وایە کە دەبێت تەنها خاڵی دەسپێك بۆ تەماشاکردنی کۆمەڵگا بریتی بێت لە رەخنە و نکۆڵیکردن. بۆ ئەم مەبەستەش چەکی ((دیالێکتیکی نێگەتیڤ)) بەکاردەهێنا. هاوئاراستە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا خۆی بە دوور دەگرێت لە وێنەکێشانی کۆمەڵگای داهاتوو کە دەبێت ببێتە شوێنگری کۆمەڵگای نە هامەتباری ئێستا، چونکە ئەمە بۆ خۆی وەکو خاڵی دەستپێکە و لە روانگەی ئادۆرنۆوە پەسەندنییە.

## مارکۆزە، حەزە راستەقینەکان و حەزە درۆیینەکان

هێربێرت مارکۆزە (١٨٩٨-١٩٧٩) هەنگاوێکی تری تیۆری رەخنەیی و پێگەی قوتابخانەی فرانکفۆرتی بەرەو پێشەوەبرد. وەکو هابرماس لە ریزی فەیلەسووفە دیارەکانی قوتابخانەی رەخنەیی کە سیستەمێکی تیۆریی تەواوی دورستکردووە. کتێبە گرنگەکانی بریتین لە ((مرۆڤی یەك پانتایی)) (١٩٤٦) و ((نامەیەك دەربارەی ئازادی)) (١٩٦٩) و ((کالاّ وشارستانیەت)) (١٩٥٥). مارکۆز هەوڵیدا بەسوودە وەرگرتن لە بۆچوونەکانی هیگڵ و فرۆید تیۆری مارکسیستی نووژەن بکاتەوە. وەکو هەموو هاوبیرانی لە قوتابخانەی فرانکفۆرت کەوتە رووبەڕووبوونەوەی لە رێ لادانی پۆزیتڤیستی و دیترمینیستی لە مارکسیزم و جەختی لەسەر پەیوەندی بەرامبەری بوون و هۆشیاری و رەتکردنەوەی بڕوابوون بە لە پێشتربوونی یەکێك بەسەر یەکێکی تردا کردەوە. مارکۆز لە کتێبی ((مرۆڤی یەك پانتایی))دا روونی دەکاتەوە کە چۆن کۆمەڵگای پیشەسازی پێشکەوتوو دەتوانێت بە بەشدارکردنی کرێکاران لە مەسرەفگەرایی و دورستکردنی ((پێداویستی درۆیین)) و نامۆبوونی چەند لایەنە بەرەو رەوشێکی پەلکێشبکات کە دیلبوونی خۆی بە ئازادی بزانێت و ئازادی راستەقینەی لەبەر چاوبکەوێت.





هێڵی ناوەندی سیستەمی هزری مارکۆزە بریتییە لە جیاکردنەوەی دوو ئاستی جیاوازی ژیانی کۆمەڵایەتی و رووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو ئاستە و توانستی پەڕینەوە لە یەکیانەوە بۆ ئەوەی تر.[٧] ئاستی یەکەم پەیوەستە بەزات و ئاستی دەومیش بە رواڵەت. جیاوازی نێوان زات و روخسار رابردوویەکی دوور و درێژی هەیە لە فەلسەفەی رۆژئاوادا. جیاوازی نێوان ئەم دووە بە تیۆری ئایدیای ئەفلاتوون[٨] بە دیارکەوت (لەو رووەوە کە ئەفلاتوون جیهانی هەستپێکراوی بە گۆڕاو و ناسەقامگیر و پەیوەست بە جیهانی عەقڵ پەسەندەوە ناساند) و پاشان لە هزری رۆژئاوادا مایەوە. لە راستیدا جیاوازی نێوان زات و روخسار جیاوازی نێوان دوو ئاستی راستییە. چەمکی زات لەو تێگەیشتنەوە هاتووە کە لە پشت رواڵەتی گۆڕانخواز و فرە و ئاڵۆزی شتەکاندا کە روخسارەکەیان پێکدەهێنێ پێکهاتەیەکی سەقامیگر و تاکانە هەیە کە زاتی ئەوان دروستدەکات. مارکۆز دەڵێت ئەو بۆ چوونەی کە پێی وایە پێکهاتەی تاك و سەقامیگری شتەکان تەنها لە رێگەی گەڕانەوەیان بۆ خودا یا سروشت، یا زاتی ئەوان شیاوی تێگەیشتنە لە سەرانسەری مێژووی رۆژئاوادا درێژەی هەبووە.

مارکۆز پاش پەسەندکردنی ئەم شێوەیە دەڵێت تێگەیشتن زات یان سروشتی شتەکان لە بەردەستی عەقڵی مرۆڤدا. عەقڵ لە پشت ئاڵۆزی شتەکانەوە ئەوەی کە روخسارییە و ئەوەی کە زاتیە لێکتر جیادەکاتەوەو دایاندەماڵێت و وەك چەمکیان لێدەکات. کاتێك کە چەند چەمکێکی وەکو مرۆڤ و دەوڵەت و هونەر و چەمکەکانی تر دروستدەکەین لە راستیدا زاتمان لە روخسار جیاکردووەتەوە.[٩] بیرکردنەوەی عەقڵانی واتە بیرکردنەوە بەپێی چەمکەکان.





توانای بیرکردنەوەی چەمکیانە نیشانەی ئەو توانایەی مرۆڤە کە هەست بە مەودا دەکات لە نێوان خۆی و ئەو شتەی کە دەرکی دەکات، ئەمەش بۆ خۆی نیشانەی شایستەیی مرۆڤە لە ئازادی و هەڵسەنگاندنی رەخنەگرانەدا. بە بۆچوونی مارکۆزە فەلسەفەی رۆژئاوا لەم بابەتە تێگەیشت بەڵام هەستی بە گرنگییەکەی نەکرد. هەر لەم رووەوە مەسیحییەت عەقڵی دایە پاڵ زاتی خوایی. مەسیحیەت بەم جۆرە پاساوی بۆ عەقڵانییەتی ئەو رێکوپێکییە دەهێنایەوە کە لە سروشت و لە کۆمەڵدا هەیە. بە پاساوێکی لەم جۆرە ئیدی شوێنێك بۆ رەخنە نامێنێتەوە. کانت یەکەم فەیلەسوف بوو کە گرنگی هێزی رەخنەگرانەی عەقڵی خستەڕوو بەڵام عەقڵی بەشتێکی باڵاو بەرزتر لە ئەزموون لەقەڵەمدا. هیگڵ بۆچوونی دوو فاقییانەی کانت (دوو فاقی بوون و دەرکەوتن یان زات و روخسار)ی کامڵ کردوو وتی کە روخسار زات ئاشکرا دەکات. و تەواوی جیهانی بە رەنگدانەوەی عەقڵ راگەیاندوو وتی کە دەبێت لە مێژوودا بەدوای زاتدا بگەڕێین. مێژوو قۆناغەکانی وەدیهاتنی بەرەبەرەی زاتە.[١٠]

مارکس بە پێچەوانەی کانت و هیگڵ لە دنیای کۆمەڵایەتیدا بە دوای سەرچاوەی عەقڵدا گەڕا نەك لە دەرەوەی کۆمەڵگا. مارکس وتی نابێت بۆ گەڕان بە دوای شوێنی سەرهەڵدانی عەقڵدا بکەوینە لێکۆڵینەوەی سەر و مێژوویی. مارکس سەرچاوەی عەقڵی گەڕاندەوە. بۆ دنیای کۆمەڵایەتی و بەم شێوەیە کۆتایی بە فەلسەفە هێناو تیۆری کۆمەڵایەتی کردە شوێنگرەوەی فەلسەفە. تیۆری کۆمەڵایەتی رەخنەیی لێرەوە سەری هەڵدا. عەقڵ هێزی رەتکردنەوە یاخود ئامادەیی رەخنەگرتنی زاتییە. بە پێی تێڕوانینی تیۆری کۆمەڵایەتی نابێت مرۆڤ بە بوونەوەرێکی ئەبستراکت یاخود سەروو مێژوویی لەقەڵەمبدرێت، بەڵکو وەکو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی سەیر بکرێت.

## عەقڵ و ئازادی

ماركۆزە رەهەندەكانی بوونی مرۆڤ بەسێ بەشی عەقڵی و ئازادی و گەڕان بە دوای شادی روون دەكاتەوە.[11] وتمان مرۆڤ بوونەوەرێكی عەقڵانییە. هەروەها عەقڵانی بوون ئازاد بوونیش لە خۆدەگرێت. ئازادی بۆ خۆی لە سێ حاڵەتی جیاواز دروستبووە. یەكەم چونكە مرۆڤ بوونەوەرێكی عەقڵانیە بۆیە دەتوانێت هەڵبستێت بە دروستكردنی چەمكەكان و لە رێگەی ئەویشەوە دەست بە بیركردنەوەی چەمكی بكات. دووەم ئەم كارە بۆ خۆی پێویستی بە قبووڵكردنی مەودای نێوان خودو شتە دەرەكییەكانە و ئەمەش بە واتای سەربەخۆیی و خود رێسایی مرۆڤە. مرۆڤ لەم پانتایی بوونەدا بۆ خۆی خاوەن شایستەی هەڵبژاردنە. سێیەم مرۆڤ دەتوانێت بە بەشداری لەگەڵ خەڵكی و بە بەشداربوون لە بڕیاردانە بە كۆمەڵەكان دەستی بە ئازادی بگات.

خود رێسایی بوون واتە لە ژێر كۆنترۆڵی خەڵكی تردا نەبوون. كۆیلە كە بە ناچاركردنی راستەوخۆ و كرێكار كە بە هۆی بژێوی بەشێوەی ناچاركردنی ناراستەوخۆ لە ژێر كۆنترۆڵی خەڵكی تردان لە ئازادی بێ بەشن.

## ئازادی و دەسەڵات

چەمكی دەسەڵاتی دەكەوێتە بەرامبەر چەمكی ئازادی. كاتێك كە كەسێكی تر ئامانجەكان و كارەكانی تاك دیاری بكات. ئەوا ئەو تاكە لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتدایە. دەسەڵات چەند شێوەیەكی جۆرا و جۆری هەیە. ناچاركردنی راستەوخۆ لە رێگەی ترساندن و چەسپاندنی هزرێك بە زەمینەسازی جۆرا و جۆر،



هەردووكیان بەشێوازەكانی دەسەڵات دادەنرێت. لە كۆمەڵگادا، دەسەڵات بە دوو شێواز بەرچاو دەكەوێت: پێكهاتەیی و ئامرازی. پێكهاتەیی كاتێكە كە پێكهاتەی كۆمەڵگا بە جۆرێكە كە بەرژەوەندییەكانی كۆمەڵێك لە تاكەكان پێویستی بە پێشێڵ كردنی بەرژەوەندییەكانی كۆمەڵێكی ترە. ئامرازی كاتێكە كە كۆمەڵێك توانای زاڵبوونی هەیە بەسەر كۆمەڵێكی تردا. لە كۆمەڵگای چینایەتیدا ئەم دوو جۆرەی دەسەڵات بەرچاو دەكەون. جگە لەمە لە كۆمەڵگای چینایەتیدا دەسەڵاتی ئایدۆلۆژیاش بەرچاو دەكەوێت كە لە جۆری چەسپاندنی هزرە.

## دەسەڵات و هێز

هەموو كۆمەڵگایەكی رێكوپێك پێویستی بە هێزێك هەیە كە لە لایەن هەمووانەوە پەسند بكرێت. چەمكی هێز جۆرێك ناكۆكی دیالێكتیكی لەخۆ دەگرێت، بەو واتایەی كە لایەكی ئازادییە و لایەكەی تری ملكەچییە. پێویستە مرۆڤەكان ئازادبن بۆ دروستكردنی پەیوەندی هێز، بەڵام كاتێك كە هێز دروستبوو بۆ خۆشیان پەیڕەوی لێدەكەن. لێرەدا مرۆڤە ئازادەكان بە دروستبوونی هێز هاوكات ئازادی خۆیان لەدەستدەدەن. لە تیۆرییەكەی رۆسۆشدا ئەم لوغزەمان بەرچاوكەوت و ئاشنابووین بە خستنەڕوو و چۆنیەتی چارەسەركردنی ئەم كێشەیە لە تیۆرییەكەیدا. ماركۆزە بەش بە حاڵی خۆی لە وەڵامی ئەم لوغزەدا دەڵێت كاتێك كە هاوڵاتیان دەكەونە ئامادەكردنی كاروبارە كۆمەڵایەتییەكان و رێكخستنی مەبەستە گرووپییەكان و دەوڵەت رادە سپێرن بە جێبەجێكردنی ئەو كات ئازادی و هێز دەبنە هاووێنە.

سێیەمین بەشی سیستەمی فەلسەفی مارکۆزە بریتییە لە گەڕان بە دوای شادمانیدا. مارکۆزە بە پەیڕەوی کردن لە فرۆید دەڵێت کە دەروونی مرۆڤ لە دوو غەریزەی دژ بەیەك پێکهاتووە:

ئەوین و مەرگ. غەریزەی مەرگ غەریزەی وێرانییە. بەکارهێنانی مەرامگەلێکی وەکو رق و توند و تیژی و ستەم پەیوەستن بەم غەریزەیەوە. غەریزەی ئەوینیش غەریزەی ژیانە. ئەفراندن و چێژ و خۆشەویستی پەیوەستن بەم غەریزەوە. دیالێکتیکی ئەم دوو غەریزەیە شارستانیەت دروستدەکات. لە نەریتی فەلسەفەی رۆژئاوادا کەمتر گرنگی بە غەریزەی ئەوین دراوە. فەیلەسووفان لە ئەفلاتوون بە دواوە جەختیان لەسەر فەزیلەتی دانانی کردووەتەوە و عەقڵیان بە هێزی رێنما پێکەرو کۆنترۆڵکەری حەزەکان داناوە. بەڵام بە بۆچوونی مارکۆزە تەنها عەقڵ نییە کە رۆڵی هەیە لە ناسینی مرۆڤدا، بەڵکو حەز و ئارەزووەکانیش تێیدا بەشدارن.

مارکۆزە مرۆڤی بە بوونەوەرێکی عەقڵانی دادەنا کە کامڵ بوونی ئەو بە باشترین ئاست لە لەوەدیهاتنی زۆرترین ئازادی و شادمانیدایە. وەدیهاتنی ئەم بنەڕەتە، هەروەها مافی مرۆڤ لە ئازادی و شادمانی هۆکاری بوونی کۆمەڵگا مرۆییەکانە. دەبێت عەقڵانییەتی رێکی کۆمەڵایەتی و رەوایی سیاسی و فۆرمی حکوومەت و رەوابوونی یاسا بە توانای دابینکردن زۆرترین ئازادی و شادمانی بۆ هەمووان هەڵبسەنگێنرێت. هەلومەرجی شۆڕشگێڕانە کاتێك دروستدەبێت کە ئەم وێنانە پەرەبستێنێ کە کۆمەڵگا دەتوانێت زیاتر لەوەی کە سیستەمی سەقامگیر بڕیاری لەسەر دەدات ئازادی و شادمانی بخوڵقێنێ.





مارکۆزە سەبارەت بە چۆنیەتی میکانیزمی سیستەمی سەرمایەداری هاوڕایە لەگەڵ تەواوی هاوەڵانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و لەوانەش هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ کە لەم پاژەدا باسکران. ئەویش پێیوایە کە مانەوەی سیستەمی سەرمایەداری بە هۆشیاری درۆیین هاتووەتەدی. پێشەسازی راگەیاندن و راگەیەنەرە گشتییەکان و زانستە کۆمەڵایەتییە پۆزیتیڤگەراکان ئامرازەکانی چەسپاندنی هۆشیاری درۆیین. ئێستاش پیشەسازی سەرگەمکەر (تەلەفزیۆن) و پڕکردنەوەی کاتەکانی بێکاری شوێنێکی گرنگیان هەیە لەم بوارەدا. بەم کەرەستانە و تەواوی ئامادەکارییەکانی تر رەزامەندییەکی هەرزان و بێ مایە لای کرێکاران دروست دەبێت. بۆرژوازی بە پرۆسەگەلیکی لەم جۆرە خەریکی ((بەنەزان کردنی)) خەڵکە.

## سۆسیالیزم وەکو تیۆری خواستە راستەقینەکان

مارکۆزە دەڵێت سۆسیالیزم تیۆرییەکە دەربارەی خواستە راستەقینە مرۆییەکان و وزەی پاڵنەری مێژووی هاوچەرخە. بەڵام بە سەرنجدانی ئەو شێواندنە سیستماتیکییەی بیر و بۆچوونی گشتی کە مارکۆزە باسی لێوەدەکات دەبێت بپرسین چۆن دەبێت خواستە راستەقینەکان بناسین. مارکۆزە بەم جۆرە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە کە وێنەیەکی جیهانی حەزە راستەقینەکان لە تاریکخانەی فەلسەفەدا هەیە. [١٢] ئەوەی پێویستە بکرێت ئەوەیە کە ئەم وێنەیە ئاشکرا بکرێت. ئەو شۆڕشەی کە بە ئاگاداربوون لەم پێویستییە راستەقینە هەڵدەگیرسێت لە ئەنجامدا سروشتی درۆیینی مرۆڤ دەسڕێتەوە و سروشتی راستەقینەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە.





بەڵام چ هێزێك ئەم حەزە راستەقینەیە دەدۆزێنتەوە و بەدییاندەهێنێت. هەروەك باسمانکرد مارکس پرۆلیتاریای بە هێزی ئازادکەری مێژوودادەنا. بەڵام مارکۆزە وەکو زۆربەی مارکسیستە هاورێبازەکان خۆی رەشبینە بەرامبەر بە رۆڵی پرۆلیتاریا و رۆڵی ئەم چینە بەو رۆشنبیر و پارتانە دەسپێرێت کە خۆیان بە بەرپرس دەزانن لە بەرامبەر جیهانی زات و مەبەستەکان.

## ٣- هابرماس و نۆژەنکردنەوەی ماتریالیزمی

### دیالێکتیک بۆژەنکردنەوەی مارکسیزم

هابرماس لە گەورەترین بیرمەندانی تیۆری رەخنەیی و لە پاشماوەکانی نەریتی قوتابخانەی فرانکفۆرتە کە خستنەڕووی تیۆرییەکی گشتگیر و هەمەلایەنە لە رێگەی سوود وەرگرتن لە نەریتی هیگڵی دەستکەوتە تیۆریەکانی کەسانێکی وەك مارکس و ڤیبەر و تالکۆت پارسۆنزو ئیمانۆیل کانت و دەروونناسی زیگمۆند فرۆید و ژان پیاژە دەستی داوەتە نۆژەنکردنەوەی هەمەلایەنی مارکسیزم و گونجاندنی لەگەڵ هەلومەرجی کۆمەڵگای سەرمایەداری دواتر.

یورگن هابرماس کە بە یەکێك لە گەورەترین فەیلەسوفانی سیاسی هاوچەرخ دادەنرێت لە ساڵی ١٩٢٩ لە دوسلدۆرفی ئەڵمانیا لە دایك بووە. لە تەمەنی لاوێتیدا لەگەڵ نوێنەرە دیارەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئاشنابوو. هابرماس کە وەکو زۆربەی نوێنەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەگەڵ بە دەسەڵات گەیشتنی فاشیستەکان لە ئەڵمانیا کۆچی کردبوو گەڕایەوە ئەڵمانیا و لە زانکۆی فرانکفۆرت دەستی بەوتنەوەی فەلسەفە و کۆمەڵناسی کرد. گەرچی حاڵی حازر لە تەمەنی پیریدایە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا زۆر چالاکە. هابرماس نووسینێکی زۆری هەیە. ((ناسین و حەزە مرۆییەکان)) (١٩٦٨) و ((قەیرانی رەوایی))[١٣] (١٩٧٣)



و ((تیۆری کرداری پەیوەندی)) (١٩٨١) لە یەکەمین نوسینەکانی هابرماسن. بەکەمین کتێبی هابرماس پەیوەندییەکی نزیکی هەیە لەگەڵ نەریتی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بەڵام کتێبی دووەم و سێیەمی زۆر لەم نەریتە دووردەکەونەوە و لە راسیتدا هاوکات لەگەڵ نووژەنکردنەوەی مارکسیزم پێداچوونەوەی قوتابخانەی فرانکفۆرتیش دەکات.

ئەوەی هابرماسی هانداوە بۆ پێداچوونەوەی قوتابخانەی فرانکفۆرت بریتی بووە لە قورسی تێڕوانیی هیگڵی بۆ ئەم قوتابخانەیە. قورسی وەها تێڕوانینێك ببوە هۆی ئەوەی کە خستنەڕووی سیستەمێکی تیۆریی نوێ بۆ زانستی کۆمەڵایەتی بە جۆرێك کە بۆ لێکۆڵینەوە ئەزموونییەکانیش گونجاوبێت و دژواری تێبکەوێت. جگە لەمە تێهەڵکێشکردنی تێڕوانینی هیگڵی (لە گوتاری رەتکردنەوە وەکو ئاوازی کامڵبوون) لەگەڵ رەخنەی مارکسیستی (رەخنەی سیستەمی سەرمایەداری) لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا ئەم رەوتەی بەرەو رەتکردنەوەی هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری و تەنانەت بزووتنەوەی رۆشنگەریش پەلکێشکرد بوو، و ئەمەش دەگونجا لەگەڵ گیانی مارکسیزمدا کە مێژووی بە پرۆسەیەکی بەرەو کامڵبوون دادەنا. هابرماس لە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەدا فۆرمبەندییەکی نوێی لە هێزی سەرەکی جووڵەی مێژوو بە ناونیشانی بە عەقڵانی بوون خستەڕوو. (بە عەقڵانی بوون) لە تیۆرییەکی هابرماسدا دوو رەهەند لە خۆدەگرێت، یەکەم عەقڵانیەتی ئامرازی کە لایەنی نێگەتیڤی هەیە (چونکە بە تواناو هێزی تەکنۆلۆژی بۆرۆکراسی بەسەر کۆمەڵگادا کۆتایی دێت). دووەم عەقڵانییەتی پەیوەندی کە لایەنی پۆزەتیڤ بە عەقڵانی بوونە (چونکە دەبێتە هۆی پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی مامەڵە کردن لەگەڵ یەك و لەوانەش گەشەکردنی ئۆرگانەکانی گفتۆگۆ.





هەروەها تیۆرییەکەی هابرماس تیۆرییەکی کۆمەڵایەتی ڕەخنەییە، هەم لەو ڕووەوە کە پێوەرێکە بۆ هەڵسەنگاندنی تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکانی ترو هەم لەو ڕەوشەوە کە شیکردنەوە و لێکدانەوە و ڕەخنەی دنیای کۆمەڵایەتی ئێستایە واتە سەرمایەداری ئەم دواییە. هەروەها هابرماس بە تیۆری ((بە عەقڵانی بوون)) بە جۆرێکی نوێ هەڵدەستێت بە گونجاندنی شیکردنەوەی مارکسیستی لەگەڵ کۆمەڵگای سەرمایەداری لە قۆناغە پێشکەوتووەکەیدا کە لە سەرمایەداری لیبرالی (بنیاتنراو لەسەر دەست تیۆەرنەدانی دەوڵەت لە ئابووری) دوورکەوتووەتەوە و چووەتە ناو قۆناغێکەوە کە تێیدا دەوڵەت چووەتە خانەی ڕێکخەری پرسە کۆمەڵایەتییەکان (دەوڵەتی خۆشگوزەران) و ڕێنماییکاری کۆکردنەوەی سەرمایە (ئابووریی کینزی).

## نەخشەی گشتی کۆمەڵەی هزری هابرماس

هابرماس لە تیۆریدارێژیدا کاری خۆی بە کتێبی ((ناسین و حەزە مرۆییەکان)) بۆ نەریتی قوتابخانەی فرانکفۆرت بە ڕەخنەی پۆزەتیڤیزم دەستپێکرد. هابرماس لەگەڵ ڕەخنەی پۆزەتیڤیزمیدا وەکو شێوە و بیرکردنەوەیەك کە دەبێتە هۆی لەباربردنی ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان و نەبوونی تێگەیشتنی گشتێتی کۆمەڵایەتی و لادانی ناسینی کۆمەڵایەتی هاوچەرخ لە تێگەیشتنی دروستی ڕاستییە تاڵ و ناخۆشەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری بەڵگە دێنینەوە کە شێوەی دروستی لێکۆڵینەوە بریتییە لە شێوەی دیالێکتیکی کە بە گەڕانەوە بۆ ئامانجی ڕزگاربوون لە گشتێتی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە. بە پێچەوانەی بانگەشەی پۆزەتیڤیزم ناسین تەنها لە ڕێگەی ئەزموون بەرهەم نایەت، بەڵکو بەو گوتار و چەمکانە دیاریدەکرێت کە زەینی ناسەر بەشێوەی پێشینە (بەرلە هەڵسان بە ئەزموون) دەیخاتە ناو پرۆسەی ناسینەوە. [١٤] زەینی ناسەریش زەمینێکی کۆمەڵایەتییە کە لە مامەڵەی



کۆمەڵایەتیدا دروستبووە. بەردەوام ناسین پەیوەستە بە حەزە مرۆییەکانەوە، لەوانە حەزی تەکنیکی و حەزی تێگەیشتن و حەزی ڕزگاربوون.

هابرماس لە بەرهەمەکانی پاشتری خۆیدا بە سوودوەرگرتن لە هەردوو چەمکی پەیوەستی کار و مامەڵە دەکەوێتە نۆژنکردنەوەی ماتریالیزمی مێژووی مارکس. کار بریتییە لە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشت (بۆ بەرهەمهێنان) و مامەڵەی پەیوەندی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا. مامەڵەی چوارچێوەی کەلتوور و ئەخلاق و زانستی کۆمەڵایەتی دروستدەکات. هابرماس پێی وایە کە چوارچێوەی مامەڵە (یان بە دەربڕینێکی سادەتر کەلتوور) لۆژیکی کامڵبوونی تایبەت بە خۆی هەیە. هابرماس دەڵێت دەبێت هەم بەپێی کارو کرداری ئامرازی و هەم بەپێی مامەڵە و کرداری پەیوەندی پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆیی هەڵبسەنگێندرێت. لەگەڵ ئەوەی کە ئەم دوو چوارچێوەیە پەیوەستن بە یەکەوە بەڵام هەر یەکەیان عەقڵانییەتی تایبەت بەخۆی هەیە. لە کۆمەڵگای سەرمایەداری عەقڵانییەتی پەیوەندی و عەقڵانییەتی ئامرازی دژبەیەك ڕادەوەستن. ئەم ناکۆکییە بەشێوەی قەیرانی ڕەوایی بە دیاردەکەوێت. چارەسەری ئەم ناکۆکییەش پەیوەستە بە گۆڕانی سیستەمی سەرمایەرداری و سەقامگیربوونی سیستەمێکی نوێ کە بتوانێ عەقڵانییەتی پەیوەندی لە دەسەڵاتی ئامرازی ڕزگار بکات.

ئەوەی کە لە خوارەوەدا باسی لێوەدەکەین ڕوونکردنەوەی ئەم نەخشە گشتییەیە.

## ناسین و حەزە مرۆییەکان

پۆزەتیڤیزم تێڕوانینی مەعریفەناسی زاڵی، قۆناغی چالاکیی بیرمەندانی پەیوەست بە قوتابخانەی فرانکۆفرت بوو. ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم مەعریفە ناسییەدا لە چەند ڕوویەکی جیاوازەوە گرنگ بوو بۆ قوتابخانەی فرانکفۆرت: چ لە ڕووی





ئایدۆلۆژیاوە چونکە ئەم تێڕوانینە بەشێوەیەکی ناراستەخۆ بەرگی لە سیستەمی سەرمایەداری دەکرد، و چ لە رووی دڵەڕاوکێ زانستییەوە چونکە پۆزەتیڤیزم مەعریفەیەکی کۆمەڵایەتی نادروستی بنیاتنابوو و رێگربوو لە بەردەم شمڵ گرتنی ناسینێکی کۆمەڵایەتی دروستدا. لە مەعریفە ناسیدا ئەم دوو تێڕوانینە (هەروەك لە باسکردنی تیۆرەکانی ئادۆرنۆدا باسمانکرد) لەسەر دوو گریمانە دامەزرابوو: یەکەم ناسینی زانستی نەك تەنها یەکێکە لە جۆرەکانی ناسین بەڵکو تەنها ناسینی خوازراو و گونجاو، دەکرێت لە هەر دوو بواری زانستە سروشتییەکان و زانستە کۆمەڵایەتییەکان سوود لەم شێوەیە وەربگیردرێت بۆ گەیشتن بە زانستی گونجاو لەگەڵ راستی، دووەم دەبێت هەموو ناسینێك تەنها ناسینی راستییەکان بێت لەبەر ئەوەی بەهاکان ناکەونە چوار چێوەی راستییەوە بۆیە ناتوانن ببنە بابەتی لێکۆڵینەوەی زانستی.[١٥]

هابرماس بەڵگە دێنێتەوە کە یەکەم، پۆزەتیڤیزم گشتێتی کۆمەڵایەتی لەبەر چاودەخات و بە زیاد رەوی لە بەشەکاندا هەم لە ناسینی کۆمەڵگا کە گشتێکی لێکدراوە بەجێی دەمێنێ و لە هەمانکاتیشدا عەقڵ لەباردەبات. دووهەم، بێ ئاگایە لە پەیوەندی نێوان ناسین لەگەڵ حەزە مرۆییەکاندا و لە گەڕان بە دوای زانستی پەتیدا بەرەو تراویلکە هەنگاو دەنێت.

هابرماس بە درێژی روونی دەکاتەوە کە چۆن ناسین لەگەڵ حەزە مرۆییەکان لە پێوەندیدایە. ئەو حەزە مرۆییەکان بە سێ جۆر و پێکهاتەی ناسنیش بە گونجاو لەگەڵ ئەمانەدا بەسێ رهەندی دادەنێت. ئەم سێ رەهەندە بریتین لە:

١- کۆنترۆڵی تەکنیکی کە لەگەڵ حەزی مرۆڤ بۆ دەسەڵاتی ئامرازی بەسەر سروشت لە پێوەندیدایە.

٢- حەزی دووەم بریتییە لە حەزکردن بە تێگەیشتنی بەرامبەری نێوان مرۆڤەکان لە ژیانی رۆژانەدا. چ لە چوارچێوەی یەکەمدا کە پەیوەستدەبێت بە زانستە



سروشتییەکانەوە چ لە چوارچێوەی دووەمدا کە پەیوەستە بە زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە لە هیچ یەکدا ئێمە ناتوانین بەو جۆرەی کە پۆزەتیڤیستەکان دەڵێین بە وەها ناسینێك بگەین کە تیۆریی دیالێکتیکی بانگەشەی بۆ دەکات. لە تیۆریی دیالێکتیکدا دەوترێت کە هەر زەرەیەك لە ناسینی ئێمە یەکسانە بە زەرەیەك لە مادده.[١٦] ئەنانەت لە زانستە سروشتییەکانیشدا ناچارین بە تێڕوانینی پێشووەوە بچینە ناو کاری لێکۆڵینەوە کە ئەمەش بە زەروورەت ئەو شتەی کە لە لێکۆڵینەوەی سروشتدا دەیدۆزینەوە پێناسە دەکات. لە چوار چێوەی دووەمدا واتە چوارچێوەی پەیوەندیش زەینی ناسەر سەربەخۆ و کارلێکراونییە، بەڵکو بەوپێش گریمانانە پۆشتە و پەرداخ کراوە کە لە کۆمەڵگا پەسەندییەوە سەرچاوەیان گرتووە.

٣- سەرئەنجام ئێمە هەموویان وەکو بوونەوەرێکی مرۆیی حەزێکی تریشمان هەیە، ئێمە هەمووومان لە ئەزموونی رۆژانەماندا بەردەوام دەمانەوێت لە بەشێك لە بوونی خۆماندا جیاوازی دابنێین لە نێوان رەگەزی دەسەڵات و رەگەزی حەقیقەت. بۆیە بە زمانێکی سادەتر دەمانەوێت ئەو وەهمانەی کە دەسەڵاتی سیاسییان لە کۆمەڵگادا پەردەپۆش کردووە هەڵبدەینەوە و لە ناوەڕۆکی دەسەڵاتی سیاسی تێ بگەین. هابرماس ئەم حەزە بە حەزی رزگاربوون ناودەبات.

## کرداری پەیوەندی

بەم جۆرە هابرماس لەو خاڵەوە دەستپێدەکات کە پەیوەندی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا جیاوازە لە جۆری پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ چوارچێوەی سروشتی و پێداویستی دیکەی دەوێت. مرۆڤەکان وەکو بونەوەرانی کۆمەڵایەتی مامەڵە لەگەڵ یەکتردا دەکەن و پێویستیان بە تێگەیشتنی یەکتر هەیە. ئەم کارە بەسوودوەگرتن لە زمان وەکو فاکتەری پەیوەندی دێتەدی. مامەڵە مرۆڤ لەسە بنەمای زمان بەکرداری پەیوەندی ناو دەبرێت. ئەو ناسینەی کە لەم چوارچێوەیەدا بەدەستدێت دوو ئاستی





هەیە: یەکەم ئەوەی کە مرۆڤەکان لە پرۆسەی کۆمەڵگا پەسەندایدا بە دەستی دێنن و لە راستیدا وێنەیەکی جیهانی کۆمەڵایەتی ئەوانە لە قاڵبی پێکهاتەی زمانیدا و دووەم ئەو ئاستەی کە لایەنێکی زانستی ترە لەو هێرمینۆتیك دروستدەکات. هابرماس چەمکی هێرمینۆتیك (کە لە بنەڕەتدا بە واتای تەئویلە و لەوبەشانەدا بەکاردێت کە مامەڵە لەگەڵ راڤەو لێکدانەوەدا دەکەن). بۆ ناوبردنی هەموو زانستە مرۆییەکان بەکاردەبات.

بەڵام ئەم دوو روەی ناسین تەواوی حەزە مرۆییەکان لە خۆناگرێت. ئەم دوو ئاستەی ناسینیش مامەڵە لەگەڵ پرسیارگەلێکی وەکو رەوایی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و پرسە پەیوەستەکانی ناکەن. ئەم پرسانەی دوایی پەیوەست دەبن بەڕووی سێیەمی ناسینەوە کە دەکەوێتە بواری رەخنەوە و پەیوەستدەبێت بە تیۆری رەخنەییەوە. لە رێگەی رەخنەوەیە (بەشێوەیەکی بنەڕەتی رەخنەی دەسەڵات) کە مرۆڤ دەتوانێت رزگاربێت. هابرماس لەسەر ئەم بنەمایەکردار (واتە جۆری حەزو بواری کار)ی بۆ دوو دەستە دابەشکرد: یەکەم کرداری ئامرازی کە بریتییە لە کردارێك بۆ گەیشتن بە ئامانجێك. لەم جۆرە کردارەدا بکەری کردار لە لایەکە و ئامانجیش دەکەوێتە لایەکەی ترەوە. ئەم کردارە پەیوەستە بە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا، لێرەدا بکەری کردار دەکەوێتە لایەکەوەو سروشتیش کە بکەری کردار دەیەوێت بۆ ئامانجەکانی خۆی بە کاریبهێنێ دەکەوێتە لایەکەی ترەوە. جۆری دووەم بریتییە لە کرداری پەیوەندی. کرداری پەیوەندی پەیوەستدەبێت بە مامەڵەی نێوان دوو یاخود چەند بکەری کردارێك کە دەتوانن سوود لە زمان وەربگرن. ئەم کردارە لە چوارچێوەیەکدایە کە تێیدا بکەری کردارەکان هەوڵدەدەن بۆ کاری هاوبەش و لە کاری وەهاشدا بگەنە لێکگەیشتن و سەرئەنجام هاوکاریکردن. لێرەدا زمان رۆڵی سەرەکی هەیە.



## عەقڵانییەتی پەیوەندی

بەهەمان شێوە کە کرداری ئامرازی کەرەستە و ئامادەکاری و رێڕەو و لۆژیکی کامڵبوونی خۆی هەیە، کرداری پەیوەندیش لۆژیك و رێرەوێکی هەیە کە پەیڕەوی لە عەقڵانییەتێکی تایبەت دەکات. لێرەدا ئێمە دەگەینە یاساکانی کامڵبوونی کۆمەڵایەتی کە هاوکاتە لەگەڵ پێداچوونەوەی بەرچاوی ماتریالیزمی مێژووی مارکس، بەتایبەتی تێگەیشتنی ئۆرتۆدۆکسی مارکسیزم. هەروەك لە خستنەڕووی تیۆری ماتریالیزمی مێژووی مارکسدا باسمانکرد فۆرمبەندی کلاسیکی هێزەکانی مێژوو لەسەر بنەمای دوو چەمکی سەرەکی هێزەکانی بەرهەمهێنان و پەیوندییەکانی بەرهەمهێنان دامەزرا بوو. لەم چەمکبەندییەدا دەوترا کە لە بنەڕەتدا بە گەشەکردنی ئامرازی بەرهەمهێنان (قۆڵنگ، گاسن، ماشێن، وزەی ئاو، وزەی هەڵم و وزەی کارەبا) هێزەکانی بەرهەم هێنان گەشەدەکەن و هێزی بەرهەمهێنانی گونجاو لەگەڵ گەشەی خۆی دەبێتە هۆی وەرچەخانی (بەرەبەرە یاخود شۆڕشگێڕانە) لە پەیوەندییەکانی بەرهەم هێناندا. هەروەها دەوترا کە دەبێت لە گەشەکردنی هێزەکانی بەرهەمهێناندا پێشکەوتنی ئامراز وەکو ((بگۆڕی سەربەخۆ)) تەماشا بکرێت. لەم بارەیەوە لە زمانی مارکسییەوە دەوترا کە ئاسیاوی دەستی کۆمەڵگای کۆیلایەتی و ئاسیاوی ئاوی کۆمەڵگای فیودالی و ئاسیاوی کارەبایی کۆمەڵگای سەرمایەداری بۆ مرۆڤ بە دیاری دێنێت. بەم جۆرە لەم چەمکبەندییەی ماتریالیزمی مێژووییدا ((ئامرازێکی بەرهەمهێنان)) شوێنی سەرەکی وەردەگرێت.

هابرماس دەیەوێت ماتریالیزمی مێژووی لەو تێگەیشتنە بچووکخوازە رزگاربکات کە دەبێتە هۆی دروست بوونی تێگەیشتنی ئابووریگەریانە و دیتەرمینیستیانە بۆ ئەو چەمکە. تیۆری عەقڵانییەتی ناوبراو فۆرمبەندییەکی نوێ بۆ ماتریالیزمی مێژووی دەخاتەروو.





هابرماس بەڵگە دێنێتەوە کە تەنانەت لە چوارچێوەی کرداری ئامرازیشدا (بۆ گۆڕینی سروشت بە پێی مەبەستەکانی بەرهەمهێنان) کار گوتارێکی ئابووری پەتی نییە، بەڵکو گوتارێکی مەعریفە ناسییە. لە دەربڕینی هابرماسدا کامڵبوونی کۆمەڵایەتی پێشکەوتن لە ڕێڕەوی پەرەپێدان و ئافراندنی کەلتووری بەتوانستی وزەیی ڕزگاری بەخشە. هەروەها بە عەقڵانی بوون بەواتای پێشکەوتنی بانگەشەی عەقڵە لە بەرامبەر دەسەڵاتی تاکڕەودا. لە قۆناغە سەرەتاییەکانی مێژووی مرۆڤدا ئەفسانە (شارستانی میزۆپۆتامیا، میسر) و لە قۆناغی دووهەمیشدا میتافیزیك و ئایینزا (یۆنان و ڕۆم) دەسەڵاتی سیاسییان لە ژێر پەردەی وەهم و ئەفسووندا حەشاردابوو. بەسەرهەڵدانی ڕێنیسانس و مۆدێرنێتە ڕەوتێکی نوێ لە ناسینی مرۆییدا دەستیپێکرد کە دەسەڵاتی سیاسی لە وەهم و ئەفسون داماڵرا.

## بەعەقڵانی بوون

لە کەلتوور و هزری ڕۆژئاوادا چەمکی بە عەقڵانی بوون پەیوەست بووە بەناوی مارکس و ڤیبەری کۆمەڵناسی ناوداری ئەڵمانیا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم. ڤیبەر بە عەقڵانی بوونی بە ناوەڕۆکی مێژووی هاوچەرخی ڕۆژئاوا و بزوێنەری مۆدێرنیتە شیکردووەتەوە. تێگەیشتنی پرۆستانتی بۆ مەسیحییەت ڕەگەزێکی لەخۆیدا هەڵگرتووە کە پێش زەمینەی سەرهەڵدانی سەرمایەداری ڕۆژئاوای ئامادەکردووە. لە تیۆرییەکەی ڤیبەردا سەرئەنجام ڕەوتی بەعەقڵانی بوون بە فەرمانڕەوایی بۆروکراسی و تەکنۆلۆژیا یاخود بە واتایەکی تر بەعەقڵی ئامرازی بۆ سەر چارەنووسی مرۆڤ کۆتایی دێت کە ئەو بە ((قەفەزی ئاسنین)) ناوی دەبات. چەمکی بەشت بوون و لە دەستچوونی ئازادی و لەدەستچوونی واتا لە شیکردنەوەی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا بۆ تایبەتمەندی کۆمەڵگای سەرمایەداری هاوچەرخ



پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئەم تێڕوانینەی ڤیبەردا. بەم جۆرە ڤیبەر و قوتابخانەی فرانکفۆرت بەواتایەکی نیگەتیڤ بە عەقڵانی بوون بەکاردەبەن.

بەڵام هابرماس عەقڵانییەت بە خاوەنی دوو ڕەهەند دەزانێت. ڕەهەندی نیگەتیڤ کە بریتییە لە پێشکەوتنی عەقڵانییەتی ئامرازیی بەشێوەی دەسەڵاتی بۆرۆکراسی و تەکنۆلۆژیا و سەرمایەداری هاوچەرخ. ڕەهەندەکەی تری بە عەقڵانی بوون بریتییە لە سڕینەوەی ئەفسوون لەسەر جیهان (بۆ وێنە لەسەر دەسەڵات) یاخود بەواتایەکی تر پێشکەوتنی زانستی نوێ. بە بۆچوونی هابرماس ڤیبەر تەنها سەرنجی یەك ڕووی پرۆسەی بە عەقڵانی بوونی داوە، بۆیە بە لەدەستچوونی ئازادی و سەربەخۆیی لێکداوەتەوە. ڕووەکەی تری بریتییە لە عەقڵانییەتی پەیوەندی کە ڕوویەکی گرنگتری عەقڵانییەتە. عەقڵانییەتی پەیوەندی بەرەو ئەگەری ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی هەنگاو دەنێت. بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی ئەم پرسە دەبێت هەنگاوێکی تربچینە پێشەوە و بگەینە دوو چەمکی سەرەکی دیکە لە تیۆرییەکەی هابرماس واتە جیهانی ژیان (یان ژیانی جیهان) و ((جیهانبینی)).

## ژیانی جیهان و کرداری پەیوەندی

ژیانی جیهان چەمکی سەرەکی تیۆری سیاسی و کۆمەڵناسی هابرماسە. ژیانی جیهان شوێنکە کە تیایدا پێکهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ هۆشیاری و کرداری تێکەڵدەبن. هاوکات لەگەڵ پرۆسەی بە عەقڵانی بووندا ژیانی جیهانیش عەقڵانی تردەبێت و بەرەبەرە هەڵسەنگاندنە ڕەخنەییەکان شوێنی ڕەگەزە چەسپاوەکانی کەلتوور دەگرنەوە. ژیانی جیهان بنەمایە کە بۆ ئەو شتەی کە بە جیهانبینی ناودەبرێت. جیهانبینی هەمان ئەو پەیوەندییەی هەیە لەگەڵ ژیانی جیهاندا کە لە تیۆری دەروونکۆڵی فرۆیددا هەست هەیەتی لەگەڵ نەستدا. ژیانی

جیهان ئاسۆیی بینین و زەمینەسازی هۆشیاری و کرداری کۆمەڵایەتییە. مامەڵەی نێوان پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان لە لایەك و کەلتوور و ئەخلاق و هۆشیاریش لە لایەکی ترەوە لە ژیانی جیهاندا رەنگدەدەنەوە. کامڵبوونی کۆمەڵگا بە واتای بە عەقڵانی بوونی ژیانی جیهانە. وەرچەخان لە تەواوی پێکهاتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی دەسەڵات هەمان ئەو شتانەن کە بە عەقڵانی بوون دەخەنەڕوو.

هابرماس بۆ چارەسەکردنی یەکلایەنەبوونی تیۆریەکەی ڤیبەر دەربارەی ((بەعەقڵانی بوون)) (کە وتمان بە ((قەفەزی ئاسنین)) کۆتایی دێت) دەڵێت کە کۆمەڵگا بە درێژایی دوو رێگە بەرەو پێشەوە دەچێت: یەکەم وەرچەرخان لە ژیانی جیهان و دووەم وەرچەرخان لە سیستەم. هابرماس رەخنە لە تیۆرییەکەی ڤیبەر دەگرێت کە وا هەستدەکرێت لە چەمکبەندییەکەی ئەو بۆ رێرەوەی عەقڵانییەت لەناکاو بزوێنەری ئەخلاقی کەلتووری کە کۆمەڵگای نوێیان وەگەڕخستووە لە کاردەکەوێت. هابرماس ناتوانێت ئەوە قبووڵبکات کە هێزە بزوێنەرەکانی عەقڵانییەتی نوێ لەناوکاو وەکو سپرینگێك لە کاربکەون و عەقڵانییەتی ئامرازی زاڵ بێت بەسەر کۆمەڵگادا. هەروەك باسمان کرد ڤیبەر لەو بڕوایەدابوو کە بڕواو بەها پرۆتستانتەکان کە بزوێنەری پێشکەوتن و عەقڵانییەتی نوێ بوون و تەکنۆلۆژیا و بۆرۆکراسی نوێیان دروستکرد لە کۆتایی رێگەکەدا فەرامۆش دەکرێن و ئەو تەکنۆلۆژیاو بۆرۆکراسییەی کە ئێستا لە پێگەی بەهایی خۆیان جیابوونەتەوە وەکو ((قەفەزێکی ئاسنین)) مرۆڤ دەبەستێتەوە.

بەڵام هابرماس سەرەڕای تیۆرییەکەی ڤیبەر و قوتابخانەی فرانکفۆرت لەو بڕوایەدایە کە بە عەقڵانییەتی بوون نەك تەنها نابێتە قەفەزی ئاسنین و بەشتبوون لە چوارچێوەی کرداری پەیوەندیدا بەڵکو لە رێگەی رزگاربوون لە عەقڵانییەتی ئامرازیش بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت.



## سەرمایەداری پاشتر و قەیرانی رەوایی

لەگەڵ ئەوەی کە هابرماس وەکو مارکس پەیوەندی نێوان کاری کرێکار و سەرمایە وەکو بنەڕەتی رێکخەری سەرمایەداری لیبراڵ و فۆرمە هەموارکراوەکەیدا سەرمایەداری پاشتر تەماشا دەکات بەڵام سەرمایەداری پاشتر بە هەڵگری گۆڕانگەلێك دادەنێت کە بە چەمکەکانی مارکسیزمی کلاسیك وەکو پەیوەندی سەرمایە و کار و چین لەواتا کلاسیکییەکەیدا روون ناکرێتەوە. بۆ وێنە لە سەرمایەداری پاشتردا دەوڵەت رۆڵی رێکخستنێکی گرنگی لە ئەستۆ گرتووە و بە هاوکاری دەزگای حکوومی بەشێوەیەکی روو لە زیادبوون بەهرەکێشیی بەرەو پێشەوە بردووە. ئەم رەوشە پێویستی بە تیۆرییەکی نوێ هەیە کە رۆڵی بەربڵاوی دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەداری و هەلومەرجی دەوڵەتی خۆشگوزەران و دابەزینی دیموکراسی بۆ جۆرە جەماوەرییەکەی روون بکاتەوە. کتێبی قەیرانی رەوایی هابرماس هەوڵێکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم پرسانە.

هابرماس لە قەیرانی رەوایی جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکاتەوە کە سەرمایەداری پاشتر کە بە سەرمایەداری رێکخراویش ناودەبرێت دەوڵەت بە مەبەستی لەناو بردنی نارێکییەکانی سیستەمەکە بەشێوەیەکی بەربڵاو دەست لە ئابووری وەردەدات و رۆڵی راستەوخۆی هەیە لە بەهرەکێشی و کۆکردنەوەی سەرمایەدا. ئەم راستییە پرسی قەیرانی رەوایی هێناوەتە ئاراوە. قەیرانی ناوبراو لەو کارەوە سەرچاوەی گرتووە کە دەوڵەت ناتوانێت ناخ و ناوەڕۆکی توند و تیژی خۆی بشارێتەوە واتە خۆی بە نوێنەری بەرژەوەندی گشتی بناسێنێت و خۆی بەڕەوا بخاتەڕوو. بناغە ئایدۆلۆژییەکانی دەوڵەت کە لە بواری بەها کلاسیکییەکاندا بە هێرشی عەقڵانییەت و لە بواری بەها نوێیەکانیشدا (سەرکەوتن و بەکاربردن و خۆشگوزەرانی) بە هۆی دەستتێوەردانی دەوڵەت لە بەرژەوەندی کەرتی تایبەتدا تووشی قەیران بووەو لەگەڵ خۆیدا دەبێتە هۆی پلەکانی کەمبوونەوەی رەوایی بۆ سیستەم و ئەم کەمبوونە رەواییەش چارەسەرناکرێت.





## ئەخلاقی گوتاری

رازی بوون بە چوارچێوەی سەربەخۆ و لۆژیکی سەربەخۆ بۆ کرداری پەیوەندی و لەبەر چاوگرتنی ئەگەری بە عەقلانی بوون یان بەواتایەکی تر رێرەوی کامڵبوونی بە چەمکێکی تر بە ناونیشانی ((ئەخلاقی گوتاری)) کە یەکێکی ترە لە چەمکە گرنگەکانی تیۆری سیاسی هابرماس کۆتایی پێ دێت. عەقلانییەتی پەیوەندی پشت بە ئامادەیی بکەری کردارەکان دەبەستێت بۆ دەستپێکردنی باس و بەڵگەهێنانەوە لە پێناو سەلماندنی متمانەی بانگەشەکەی خۆیان. دەبێت بەشداریخوازانیکرداری پەیوەندی لە حاڵەتی دەربڕینی بۆچوونی ناکۆك لە لایەن لایەنەکانی گفتوگۆوە راستی و رەوابوونی بانگەشەی خۆیان لە رووی ئەخلاقییەوە بسەلمێنن. لە راستیدا لەوەها بارێکدا کرداری پەیوەندی پشت بەرامان و وردبوونەوە دەبەستێت. دەبێت وەها رێگەیەك لە کۆتاییدا بگاتە دروستکردنی جۆرێك لە ئەخلاقی راستینە یان رێسایی.

لە راستیدا ئەمە شێوەی ئامانجیانەی گفتۆگۆ و بەڵگەهێنانەوەیە و هابرماس بە گوتار ناوی دەبات. گوتار بریتییە لەو باس و بەڵگەهێنانەوەیەی کە لە شێوازی ئامانجیانەی گفتوگۆدا ئامادەیی هەیە.

ئەخلاقی گوتاری پشت بەم بنەڕەتە کانتییەی خوارەوە دەبەستێت: ((تەنها ئەو رێسایانە دەتوانن بانگەشەی متمانە بکەن کە توانیبێتیان لە پایەی بەشداریخوازانی گوتاری کردەییدا پشتگیری تەواوی کارلێکراوانی ئەو رێسایەیان بەدەستهێنابێت (یان بتوانن بە دەستی بێنن))[١٧]. هابرماس لەم دوکترینەوە بنەڕەتی یەکسانی و ئازادییە سیاسییەکان هەڵدەهێنجێ. بە جۆرێك کە دەڵێت دۆخی ئامانجیانەی گوتار پێویستی بە لێکڕوانینی (یان بە زمانێکی سادەتر یەکسانی) مافەکان و یەکسانی دەسەڵات هەیە لە نێوان هەموو بەشداریخوازەکاندا (بۆ نموونە هاوڵاتیان). ئەم



لێکڕوانین و یەکسانییە ئەم راستییەی لە خۆگرتووە کە هیچ پابەندراوییەك جگە لە بەڵگەی باشتر بۆ بەشداریخوازان مایەی پابەندبوون نییە. ئازادی رادەربڕین لە هەلومەرجە سروشتییەکانی ئەم جۆرە بەڵگە و گفتوگۆ کردنەیە. هابرماس دەڵێت کەسەر ئەنجام راستی واتە رێسای دروستی ئەخلاقی لە فۆرمی ئامانجیانەی گوتارەوە دێتەدەر. وەکو بەرچاو دەکەوێت ئەم رێسایە لە ناوەڕۆکی ویستی گشتی رۆسۆ دەچێت هەروەها ئەخلاقی گوتاری هابرماس لە فەرمانی رەهای کانت (بەرگی دووەم، پاژی ٧)ش دەچێت، بەڵام یەکسان نییە لەگەڵیدا، چونکە هابرماس بە پێچەوانەی کانت بە گرووپی باس لە بکەری کردارەکان دەکات. هابرماس دەڵێت نەخشەکەی کانت مۆنۆلۆگ (تاکبێژی)یە، لە کاتێکدا کە نەخشەکەی ئەو دیالۆگ (گفتوگۆی بەرامبەر)ە. بە واتایەکی تر عەقڵ پەیوەندییەکی نێوان زەینەکانە.

## دیموکراسی گوتاری

هابرماس لە ئەخلاقی گوتارەوە دەگاتە جۆرێك دیموکراسی کە بە دیموکراسی گوتاری ناویانبردووە. لە راستیدا ئەم دیموکراسییە شێوەیەکە بۆ بنیاتنانی گفتوگۆ و بەڵگە هێنانەوە کە لە رێگەیەوە سیاسەتی گشتی دروستدەکرێت. دەبێت بۆ ئەم کارە سیستەمێك لە مافەکان دروستبکرێت کە مافی هەموو بەشداریخوازان لە گفتوگۆکردن بۆ بەشداری لە یاسادانادا مسۆگەر بکات. بە پێی بنەڕەتی دیموکراسی تەنها ئەو یاسایانە دەتوانن بانگەشەی رەوایی بکەن کە پرۆسەی گوتاری یاسادانانە رەزامەندی و پشتگیری هاوڵاتیانیان بە دەستهێنابێت. هەڵبەتە بەکردەوە هیچ یاسایەك بەم جۆرە دانانرێت. لە باشترین هەلومەرجدا یاسا لە لایەن زۆرینەوە دادەنرێت. بەڵام ئەگەر کەمینە ماف و توانای راستەقینەی ئەوەی هەبێت کە لە قۆناغەکانی پاشتردا بە بەڵگە هێنانەوەی باشتر سەرکەوێت بەسەر زۆرینەدا ئەوا لەم حاڵەتەدا بنەڕەتی دیموکراسی گوتار لەکەدارنەبووە.





## بواری گشتی

ئەو دیموکراسییەی کە هابرماس باسی دەکات و بە دیموکراسی بەشدارنەش ناودەبرێت لەسەر بنەمای شتێك دامەزراوە کە بە ((بواری گشتی)) ناودەبرێت. ئەم چەمکە یەکێکی ترە لە بەشەکانی تیۆری کرداری پەیوەندی و عەقلانییەتی هابرماس. مەبەست لە بواری گشتی ئەو فەزا کۆمەڵایەتییەیە کە دامەزراوە و کردارە کەلتوورییەکان، بە تایبەتی لە جۆری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکەونە ناویەوە. لە فەزایەکی وەهادا کە باسکردن سەبارەت بە پرسە هەمووانییەکان بەڕێوەدەچێت و هەمووان مافی بەشداری کردنیان تێدا هەیە. ئەم بوارە لە لایەکەوە تایبەتییە و لە لایەکی ترەوە جیاوازە لە بواری دەوڵەت و هەر بۆیە سەربەخۆیە.

لە بنەڕەتدا بواری گشتی بوارێکی بۆرژوازی بووە. لە سەدەی نۆزدەیەمدا بۆرژوازی بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی هەستا بە ئۆرگانیزەکردنی باسی گشتی، ئازاد و بەربلاو وەکو مەرجی پێویست بۆ رەواییدان بە کرداری سیاسی و حکومی. بەم شێوەیە بوو کە باسی عەقلانی لە بواری گشتیدا کە چوو بووە شێوەی بوارێکی سەربەخۆوە ئۆرگانیزەکرا.

لەم بوارەدا و لەبەرچاوگرتنی ئەو گەشەیەی کە عەقلانییەتی پەیوەندی پێی گەیشتبوو چیدی بە هاومتمانەی یاسا پەیوەست نەبوو بە ویستی ئاسمانی و پێشینەی رەچەڵەکی و فەرمانی میر، بەڵکو لەسەر بنەمای بینین و بەڵگەهێنانەوە دامەزرا بوو[١٨]. بۆ روونکردنەوەی لۆژیکی کردار لەم بوارەدا دەگەڕێینەوە بۆ بەرژەوەندی گشتی نەك بۆ بەرژەوەندی تایبەتی گرووپەکان. لەوەها هەلومەرجێکدایە کە ویستی عەقلانی دروستدەبێت.

لە سەدەی بیستەم و لە سەرمایەداری پاشتردا بەسەرهەڵدانی کۆمەڵگای گرووپی و دیموکراسییەت لەسەر هەمان بنەما، هەروەها دەوڵەتی خۆشگوزەران بواری گشتی تووشی لەناو چوون هات. هابرماس دەڵێت ئێستا خەڵکی خۆشگوزەران و



خوێندەواری کۆمەڵگای ئەمڕۆ لە بری ئەوەی فاکتەری سیاسەت بن بابەتی سیاسەتن. لە راستیدا واتە کۆمەڵێکی بچووکی خاوەن سەرمایەکان بە ئامراز و ئامادەکاری جیاواز بەرەو ئەم لاو ئەولا پەلکێشیان دەکەن. هیچ باسێك سەبارەت بە پرۆلیتاریای هۆشیار و خەباتگێر کە هەڵگری عەقلانییەتی مێژوو داینەمۆی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان و ئامانجی رزگاری بوون لە ئارادا نییە. هابرماس ئەمە بە دەستدرێژی سیستەم (پێکهاتەی ئابووری-کۆمەڵایەتی سەرمایەداری) بۆ سەر ژیانی جیهان شیدەکاتەوە. ئێستا بەوەها دەستدرێژییەك لە لایەن سیستەمەوە (سیستەمی سەرمایەداری) بۆ سەر ژیانی جیهان و لەناو چوونی رۆڵی پرۆلیتاریا کاری رزگاری لە ئەستۆی هەموو ئەو کەسانەدایە کە لە بواری کرداری پەیوەندیدا بە دوای عەقلانییەتی پەیوەندی نوێدا دەگەڕێن.





### یادداشته‌کان:

١- حسین بشیریە: تاریخ اندیشه سیاسی درغرب جلد ١ تهران، نشری، چاپ سوم ١٣٨٠، ص ١٥١.

٢- سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٧.

٣- ن. ك بەمارتین جی، تاریخچه مکتب فرانکفورت، ترجمه چنگیز پهلوان، تهران، انتشارات کویر، ١٣٧٢.

4- Christopher Brayan, Sostivism in social Rheory and Research, Newyork st Marim's press, 1988, p.4.

5- Ibid p.7.

٦- حسین بشیریە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٥.

٧- بیخوبارخ، متفکرین سیاسی معاصر، ترجمه منیر سادات مادرشاهی، تهران، نشر سفیر، ١٣٨٠، ص ١١٨.

٨- بەرگی دووەمی ئەم کۆمەڵیە، پاژی سێیەم.

٩- بیخو بارخ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٥.

١٠- بەرگی دووەم.

١١- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩.

١٢- حسین، بشریە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٦.

١٣- یورگن هابرماس، بحران مشروعیت، ترجمه جهانگیر معینی، تهران، گام نو، ١٣٨٠.

١٤- حسین بشریە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١١.

١٥- مایکل سناف، فیلسوفان سیاسی قرن بیستم، ترجمه خشایار دیهمی، تهران، نشر کوچك، ١٣٧٨، ص ٤٣٢.

١٦- مایکل پیوزی، یورگن هابرماس، ترجمه احمد تدین، تهران، نشر هرمس، ١٣٧٩، ص ٢٦.

١٧- مایکل سناف، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥٣.

١٨- مایکل پیوزی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩.



# پاژی چوارەم

## مارکسیزم و تێڕوانینە پێکهاتە گەرایانەکان

### بۆچوونە پێکهاتەگەراکان لە مارکسیزمدا

هەروەك باسمانکرد مارکسیزم لە ڕۆژئاوا پتر لە سێ بۆچوونی سەرەکیدا پەرەی سەند. یەکەم مارکسیزمی کلاسیکی بە بۆچوونی ئۆرتۆدۆکسی دژە فەلسەفییەوە، دووەم مارکسیزمی فەلسەفی دژە ئۆردۆکسی و سێیەم مارکسیزمی پێکهاتە گەرایانە. مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکسی پاش مردنی مارکس لە لایەن دۆست و قوتابیەکانی خۆیەوە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم گەشەی کرد. هێشتاش ئەم بۆچوونە بە تایبەتی لەناو مارکسیستە ئینگلیزی و ئەمریکییەکاندا لە برەودایە. لە بەرامبەر ئەم بۆچوونە ئۆرتۆدۆکسییەدا جۆرێك لە مارکسیزم بەبۆچوونی فەلسەفی توندەوە گەشەیکرد کە کەوتە دژایەتیکردنی ماتریالیزمی بیرکالأنەی بۆچوونی سەرەتایی. مارکسیزمی مرۆڤگەرایی هیگڵی کەسانێکی وەك لۆکاش و گرامشی و تیۆری ڕەخنەیی و قوتابخانەی فرانکفۆرت کە لە پاژی پێشوودا باسمانکرد لەم دەستەیە بوون. ئەگەر مارکسیزمی فەلسەفی و ڕەخنەیی کاردانەوەیەك بوو لە لایەن مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکسی لە بەرامبەر سادەکردنەوەی فۆرمۆلەکانی ماتریالیزمی مێژوویی ئەوا لە بەرامبەردا و لە کاردانەوەی مارکسیزمی فەلسەفی و مرۆڤگەرادا بۆچوونێکی نوێ لە مارکسیزمدا گەشەی کرد ئەم ڕەوتە هزرییەی لەگەڵ بۆچوونە پێکهاتەگەرایانەکاندا تێکەڵکرد.





لوی ئالتۆسترو نیکۆس پۆلانزاس بۆ کاردانەوە لە بەرامبەر هەندێك لە بۆچوونی ئایدیالیستیی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەش بەحاڵی خۆیان لە ڕێگەی دووبارە خوێندنەوەی مارکسیزم نۆژەن کردنەوەیاندا. لە ساڵەکانی ١٩٦٠، ١٩٧٠ ئەم بۆچوونە لە نێوان مارکسیستەکانی فەرەنسادا گەشەیکرد. بێگومان ڕەهەندی پێکهاتەگەرایانە یەکێك بوو لە ڕەهەندەکانی ماتریالیزمی مێژووی مارکس، هەر بەو جۆرەی کە ئابووریگەراکان و دیترمینیزم ڕەهەندەکانی دیکەی بوون، هەر بۆیە بۆچوونی پێکهاتەگەرایانەش وەکو بۆچوونە مرۆڤگەراکان و بۆچوونە ئابووریگەراکان بەش بە حاڵی خۆیان زیاتر جەختیان لەسەر یەکێك لە چەند ڕەهەندەکەی مارکسیزم کردەوە. ئەگەر مارکسیستە مرۆڤگەرا و فەلسەفییەکان گەڕانەوە بۆ بەرهەمەکانی قۆناغی لاوێتی مارکس ئەوا مارکسیستە پێکهاتەگەراکان زیاتر پیشتیان بە نووسینەکانی پاشتری مارکس دەبەست.

### قوتابخانەی پێکهاتەگەرایی

بۆچوونی پێکهاتەگەرایانەی مارکسیزم لە ژێرکاریگەری ڕەوتێکدایە بە ناوی پێکهاتەگەرایی کە زیاتر لە فەرەنسا و سەرەتاش لە زمانناسیدا پەرەی سەند، پێکهاتەگەرایی بەو جۆرەی کە لە فەرەنسادا دروستبوو زیاتر بەو لایەدا چووە کە لەسەر بنەمای پێکهاتەکانی ژێرەوەی (بنەماکانی) زمان و هزر بە دوای پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکاندا بگەڕێت. هاوتای چەمکی وشەی پێکهاتە بریتییە لە زاراوەی کارگوزار. هەردوو چەمکی پێکهاتە و کارگوزار وەکو دوو مۆدێلی شیکردنەوەن لە مەعریفەی کۆمەڵایەتیدا کە لە بەرامبەر یەکتردا ڕادەوەستن. لە شیکردنەوەی بابەتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مێژووییەکاندا هەندێك پشت بە ڕۆڵی مرۆڤەکان و ڕەفتاری مرۆڤ چ لە چوار چێوەی تاك یان چینی کۆمەڵایەتی یاخود هێزی



کۆمەڵایەتی دەبەستن و هەندێکی تر پێکهاتە و دامەزراوەکان لەبەر چاودەگرن. لە بۆچوونی دووەمدا پێکهاتەکان شتگەلێکن لە پەیوەندی سیستەماتیك و مۆدێلدارانەیان مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا دروستدەبن. پشتبەستن بە پێکهاتە ڕابردوویەکی دووری هەیە لە هزری ڕۆژئاوادا و پێشینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونەکانی ئەفلاتوون و ئەرەستۆ.

لە قۆناغی نوێدا پێکهاتەگەرایی وەکو ڕەوتێکی مەعریفەناسی بە کارەکانی دی سۆسێری (١٨٥٧-١٩١٢) زمانناسی سویسری دەستیپێکرد. مرۆڤناسێکی فەرەنسی بە ناوی لوی شتراوس تێڕوانینی پێکهاتەگەرایی کە بۆخۆی لە زمانناسیدا دروستببوو بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەکارهێنا.

پێکهاتەگەرایی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی سوودەوەرگرتن لە مەعریفەناسی باوی زمانناسی پێکهاتەگەرا لە بواری دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا. لە بۆچوونی پێکهاتەگەرایانەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە یەکە تاکەکانی هەر سیستەمێك بەپێی پەیوەندی و پەیوەستبوونی مۆدێلدارانەیان لەگەڵ یەکتردا بەو جۆرەی کە سیستەمێکی دیاریکراو دروستدەکەن و دەبنە خاوەنی واتا. بنەمای هزری پێکهاتەگەرایی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەوەیە کە دەبێت زانستی کۆمەڵایەتی دزە بگاتە بن ئاستەکانی سەرەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و لە ژێر ئەم ئاستانەدا ئەو بنەما ژێرەکیانە بدۆزێتەوە کە دیاردەکانی سەرەوە ڕێکدەخەن. بۆچوونی پێکهاتەگەرایانەی مارکسیزم جەخت لەسەر ئەم ڕەهەندەی شیکردنەوەی تیۆری مارکس دەکاتەوە. لە باسەکانی خوارەوەدا ئاشنا دەبین بە تیۆرەییەکانی دووکەس لە مارکسیستە پێکهاتەگەراکان بە ناوی لوی ئالتۆسێر و نیکۆس پۆلانزاس.





## ١- لوی ئالتۆسێر و خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ سەرمایە:

لوی ئالتۆسێر (١٩١٨-١٩٩٠)ی فەیلەسووفی گەورەی فەرەنسی لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی ((خوێندنەوەی سەرمایە)) هەولێدا بە خوێندنەوەکی نوێ بۆ مارکسیزم بەرگری لە لایەن زانستی مارکسیزم بکات لە بەرامبەر لایەنە مرۆڤگەرایی و فەلسەفییەکەیدا کە مارکسیزمە فەلسەفی و رەخنەییەکان پشتیان پێ بەستبوو.

ئالتۆر دەیوت کە کێشەی لێکدانەوەی فەلسەفی و مرۆڤگەرایی مارکسیزم ئەوەیە کە بەرگریکارەکانی هەستیان بە گرنگی کارەکەی مارکس شێوەی شیکردنەوەی بۆ توێکاری کۆمەڵگای سەرمایەداری نەکردووە. لە لایەکی ترەوە هێرشیکردە سەرتێڕوانینی لێنینی و ستالینی کە مارکسیزمیان خستبووە شێوەی ئایدۆلۆژیایەکەوە و لایەنە زانستییەکەیان لە بیرکرد بوو. ئالتۆسێر جەخت لەسەر ئەو بابەتە دەکردەوە کە دەبێت لە هزری مارکسدا و گوتاری جیاوازی وەکو گۆتاری مرۆڤگەرایی و گوتاری زانستی لە یەکتر جیابکەینەوە و بیناسین. نووسینەکانی سەردەمی لاوێتی مارکس زیاتر لە بۆچوونە مرۆڤگەراییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، لە کاتێکدا کە نووسینەکانی سەردەمی کامڵبوونی هزری ناوبراو، بەتایبەتی کتێبی سەرمایە بەشێوەیەکی بنەڕەتی روویەکی زانستی هەیە.

ئالتۆسێر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە نابێت مارکیسزم لەگەڵ شتگەلێکی وەکو ((ئایدۆلۆژیا))، ئەخلاق یاخود ئایینیزا تێکەڵبکرێت. مارکسیزم لە هەنگاوی یەکەمدا زانستە نەك ئایدیۆلۆژیا. مارکسیزم زانستی فۆرمبەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. بۆچوونێکی لەم جۆرە بووەتە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە رەخنەگرانی بۆچوونی لەم جۆرە بووەتە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە رەخنەگرانی بۆچوونی پێکهاتەگەرایانە ئالتۆسێر بە نەو ئۆرتۆدۆکسی ناوزەد بکەن.



## دابڕانی مەعریفەناسانە

ئالتۆسێر لەو بڕوایەدایە کە مارکس لە قۆناغی پێگەیشتوویی هزری خۆیدا بە تەواوی لە بۆچوونە هیگڵەکەی کە لە کتێبی دەستنووسە ئابووری و فەلسەفییەکانیدا رەنگی داوەتەوە دوور کەوتووەتەوە. هەروەها پێی وایەکە مارکس لە ماتریالیزمی بیرکالی فۆیەرباخ و بۆچوونی کانیش جیابووەتەوە و پێیناوەتە قۆناغێکی نوێی تێفکرینەوە. هەروەك ئالتۆسێر دەڵێت مارکس لە نووسینەکانی سەردەمی لاوێتی خۆیدا لەبری هزری رەها لە فەلسەفەی هیگڵ چەمکی زاتی مرۆڤی دانا. دستنووسە فەلسەفی و ئابوورییەکان لەوەها بیرکردنەوەیەکەوە سەرچاوەی گرتووە. بەڵگەهێنانەوەی مارکس لەم کتێبەدا ئەوەیە کە سەرهەڵدانی موڵکداری تایبەتی لە قۆناغێکی مێژوودا نکۆڵی لە زاتی مرۆڤ دەکرد و جارێکی تر لە قۆناغێکی دیکەی مێژوودا، مرۆڤ نکۆڵی لە موڵکداری تایبەتی دەکات (نکۆڵیکردنی نکۆڵی) بەزاتی خۆی دەگات.

بەڵگەهێنانەوەی ئالتۆسێر ئەوەیە کە مارکس لە قۆناغەکانی پاشتری چالاکی هزری خۆیدا ئەم شێوەیەی بە لاوەنا و ئەم بۆچوونەی خستەڕوو کە زات یان جەوهەری مرۆڤ شتێك نییە جگە لە کۆمەڵێك لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان. هەروەها ئالتۆسێر بڕوای وایە کە مارکس لە قۆناغی کامڵبوونی هزریی خۆیدا دوو چەمکی هێزەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی بۆ دیاریکردنی جووڵەی مێژوو بەکاربردووە. هەورەك وتمان مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکسیش ئەم بۆچوونەیان خستوەتەڕوو. بەڵام ئالتۆسێر دەڵێت کە لە راستیدا مەبەستی مارکس لەم دوو چەمکە دوو پێکهاتەیە و مارکس لەم فۆرمبەندییەدا هەموو جۆرە رۆڵێکی کارگوزار یان زەمینەیەتی مێژووی بە لاوەنا. بەم جۆرە ((کارگوزاری))ی راستەقینە بریتییە لە مێژووی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان وەکو پێکهاتەیەك مرۆڤەکانیش جگە لە هەڵگری پێکهاتە شتێکی ترنین.





## پەیکەرەی ئۆرگانیک

ئالتۆسێر تیۆری پەیوەست بە شێوەی بەرهەمهێنان (کە لەکاتی باسکردنی بۆچوونی مارکسیزمی ئۆرتۆدکسیدا و لە روونکردنەوەی ماتریالیزمی مێژووی مارکسدا لێکدانەوە کلاسیکی و ئۆرتۆدۆکسییەکەیان خستەڕوو) لەگەڵ لێکدانەوەی پێکهاتەگەرایانەی خۆیدا دەگونجێنێ. بەپێی وتەکانی ئالتۆسێر هەموو شێوەیەکی بەرهەمهێنان سێ ئاست یان سێ خولەکەی سەرەکییە و ئەمانەش بریتین لە:

پێکهاتەی ئابووری و پێکهاتەی سیاسی و پێکهاتەی ئایدۆلۆژیایی. رەنگە لە هەموو فۆرمبەندییەکی ئابووری-کۆمەڵایەتیدا دوو یاخود چەند شێوەیەکی بەرهەمهێنان هەبێت کە یەکێکیان بریتییە لە شێوەی بەرهەمهێنانی زاڵ و ئەوی تریشی شێوەی بەرهەمهێنانی شوێنکەوتوو (هەروەك چۆن لە کۆمەڵگا تازە گەشەکردووەکاندا شێوەکانی بەرهەمهێنانی فیودالی یان ئاسیایی لەگەڵ شێوەی بەرهەمهێنانی زاڵی سەرمایەداریدا پێکەوە دەژین). سەرئەنجام لە هەموو فۆرمبەندییەکدا سێ ئاستی پەیوەست بە یەك بەدی دەکرێت بە زمانێکی سادەتر وەکو ئاستەکانی ئابووری و سیاسەت و ئایدۆلۆژیا باسبکرێن. ئەم سێ ئاستە چەند جەوهەرێکی لێکجودانین کە پەیوەندی دەرەکیان هەبێت لەگەڵ یەکتردا. لێکجیاکردنەوەیان تەنها بۆ لایەنی شیکاری و ئاسانکاری تێگەیشتنە، ئەگینا لە راستیدا بە تەواوی لەگەڵ یەکتردا تێکەڵن. ئەو کات ئالتۆسێر دەڵێت کە دەبێت لە بری چەمکی ژێرخان و سەرخان کە لە مارکسیزمی کلاسیکدا بەکاردەبرێت باس لەم سێ پێکهاتەیە بکرێت و لە سەر ئەم سێ پێکهاتەیە لێکۆڵینەوە ئەنجامبدرێت.

لە هەموو شێوەیەکی بەرهەمهێناندا هەریەك لە سێ ئاستی ئابووری و سیاسی و ئایدۆلۆژیا سەرەڕای تێکەڵبوونیان سەربەخۆییەکی رێژەییشیان هەیە و دەکرێت بەشێوەی جیاواز لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت. پەیوەندی نێوانیان لە جۆری



دیاریکەرانەی سادە نییە چونکە هەریەك لەوان خاوەن مێژووی کامڵبوون و ناکۆکی و داینەمیزمی ناوەکی خۆیەتی. بۆیە بە پێچەوانەی بۆچوونی مارکسیستە ئۆرتۆدۆکسییەکان ناکرێت ناکۆکییەکان و وەرچەرخانەکانی کۆمەڵگا بۆ یەك دژیەکی سەرەکی بچووك بکرێتەوە. مارکسیستە ئۆرتۆدۆکسییەکان بڕوایان وابوو کە تەواوی دیاردە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایدۆلۆژیاییەکان کە ژیانی کۆمەڵایەتی دروستدەکەن لە هەموو قۆناغێکیدا تەنها یەك دژیەکی سەرەکی بەرهەمدێننەوە (بۆ نموونە دژیەکی کوێلە و کوێلەدار و لە شێوەی بەرهەمهێنانی کویلایەتی یان کرێکار و خاوەن کار لە سیستەمی سەرمایەداریدا).

ئالتۆسێر بەم پێداچوونەوەیە توانی زاڵبێت بەسەر کەموکورییەکانی لێکدانەوەی ئۆرتۆدۆکسی کە تێڕوانینی ماتریالیستیی بەرەو دیترمینیزم و ئابووریگەرایی پەلکێشکردبوو. چونکە ئەو لە بری خوازەی ژێرخان و سەرخان چەمکی پەیکەری ئۆرگانیکی بەکاردەبرد کە بریتییە لە سەربەخۆیی رێژەیی هەر سێ بواری ئابووری و سیاسەت و ئایدۆلۆژیا. ئەو بەهەمان شێوە رەخنە لە رێژەیی بوونی ماتریالیزمی مێژوویی لە لایەن مارکسیزمی مرۆڤگەرا و سنووردارکردنی بنەماکانی بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری دەگرێت و یاساکانی ماتریالیزمی مێژوویی بۆ تەواوی مێژوو بە دروست دەزانێت.

## دیارکەریی ئابووری

بەم جۆرە لە لێکدانەوەی پێکهاتەگەرایانەی ئالتۆسێر بۆ ماتریالیزمی مێژوویی، سیاسەت و ئایدۆلۆژیا رەنگدانەوەی راستەوخۆی ژێرخانی ئابووری یان پێکهاتەی ئابووری یان پێکهاتەی ئابووری پێشوەخت سەقامگیر بوو نین، بەڵکو ئەوانیش بەش بە حاڵی خۆیان بەشدارن لە چۆنیەتی و ناسنامەی ژێژخان (پێکهاتەی ئابووری)دا.





بەم شێوەیە لە لێکدانەوەی ئالتۆسێریشدا ئابووری ((لە دوایین شیکردنەوەدا)) دیارکەرە. دیارکەری پێکهاتەی ئابووری لە چەند روویەکەوەیە: سەرەتا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات کە لە هەر قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا کامیەك لە سێ ئاست یان سێ خولەکی ناوبراو (ئابووری و سیاسەت و ئایدۆلۆژیا) بێتەدی. بۆ نموونە لە سیستەمی بە کۆمەڵی سەرەتایی کە هێشتا جیاوازی لە نێوان چینەکاندا دروستنەبووە و چنیەکان نەهاتوونەتە ئاراوە جۆری پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان بوونی دەوڵەت و سیاسەت بە پێویست نازانێ. بەم پێیە لەم قۆناغەدا تەنها ئاست یان خولەکی ئابووری بەدیهاتووە و دوو ئاست یان خولەکەکەی تر بەدینەهاتوون. پاشان ئاستی ئابووری (یان پێکهاتی ئابووری) دیاریدەکات کە کامیەك لە سێ ئاست یان پێکهاتەکە وەکو پێکهاتەیی زاڵدەبێت لەناو پەیکەری ئۆرگانیکدا. ئالتۆسێر لە نێوان دیاریکەری و زاڵبووندا جیاوازی دادەنێت. گەرچی پێکهاتەی ئابووری بەردەوام لەدوایین شیکردنەوەدا دیاریکەرە بەڵام بەردەوام پێکهاتەی زاڵ نییە: بۆ نموونە هەورەك مارکس وتبووی لە جیهانی کۆندا سیاسەت و لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ئایینیزا (ئادیۆلۆژیا) رەگەزی زاڵ بوون.

بەڵام شێوازی بەرهەمهێنان زاڵبوونی ئەم یان ئەو پێکهاتەیە دیاری دەکات. واتە شێوەی بەرهەمهێنانی سەدەکانی ناوەڕاست لە نێوان دوو ئاستەکەی تردا خوازیاری زاڵبوونی سیاسەتە. ئالتۆسێر دەڵێت کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سیاسەت رەگەزی زاڵ بوو، چونکە زەوی واتە یەکێك لە بەشە سەرەکییەکانی کەرەستەکانی بەرهەمهێنان (لە دنیای پێش سەرمایەداری) لە دەستی رەعیەتدا بوو فیودالەکانیش بە ئامرازی سیاسی درێژەیان بە بەهرەکێشی واتە دەستبەسەراگرتنی زیادە بەرهەمی رەعیەت دەدا. بەڵام لە فۆرمبەندی سەرمایەداریدا پێکهاتەی ئابووری پێکهاتەی دیاریکەرە و لە هەمانکاتدا پێکهاتەی زاڵیشە. لێرەدا بەهرەکێشی لە کرێکاران پەیوەستە بە موڵکداری کەرەستەکانی بەرهەمهێنانەوە.



فۆرمبەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەرمایەداری سەرەتا فۆرمبەندییەکی مێژووییە کە تیایدا پێکهاتەی ئابووری هەم دیارکەرەو هەم زاڵە.

ئەم تێگەیشتنە ئەو رێگە بە ئالتۆسێر دەدات بەشێوەی گرامشی و تارادیەك تەواوی بیرمەندانی بۆچوونی فەلسەفی و رەخنەیی نەك رۆڵێکی شوێنکەوتوو و لاوەکی بەڵکو پێگەیەکی سەرەکی بداتە ئایدیۆلۆژیا. بە بۆچوونی ئالتۆسێر گرنگترین بنەمای دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا بریتییە لە سیستەمی ئایدیۆلۆژیا نەك سیستەمی توند و تیژی و ناچارکردن. هەموو فۆرمبەندییەکی ئابووری-کۆمەڵایەتی لە رووی ئایدیۆلۆژیاوە هەلومەرجی بەرهەمهێنانەوە (مانەوە)ی خۆی بەرهەمدێنێتەوە.

بە بۆچوونی ئالتۆسێر دەوڵەت لە دوو بەشی سەرکوتکردنی و ئایدیۆلۆژیا پێکهاتووە. ئالتۆسێر باس لە چینە کۆمەڵایەتییەکان و ململانێی چینایەتی دەکات بەڵام کاری چینە کۆمەڵایەتییەکان بەشی جەوهەری تیۆرییەکەی ناوبراو نییە. بە بۆچوونی ئالتۆسێر چینەکان بە کارگوزاری مێژوو دانانرێن (هەروەك مارکس دەیوت پرۆلیتاریا کارگوزاری رزگاری مرۆڤە لە سیستەمی خولقێنەری نامۆیی). لە راستیدا لە تیۆری پێکهاتە گەرایانەی ئالتۆسێردا چینەکان هەڵگرانی پێکهاتەن: هەڵگرانی پێکهاتەی ئابووری و پێکهاتەی سیاسی و پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیایی. لەم بارەیەوە تیۆرییەکەی ئالتۆسێر بەرەو پێکهاتەگەرایی توندڕەوانە هەنگاو دەنێت. پۆلانزاس ئەم رەهەندە توندڕەوانەی پێکهاتەگەرایی چاککردەوە.

٢- پۆلانزاس: دەوڵەت و چینە کۆمەڵایەتییەکان

دەسەڵاتی سیاسی و چینە کۆمەڵایەتییەکان نیلۆس پۆلانزاس (١٩٣٦-١٩٧٩) تیۆریدارێژی فەرەنسی بەرەچەڵەك یۆنانی لە لایەکەوە درێژەی بە کارەکەی ئالتۆسێردا لە تێکەڵکردنی مارکسیزم لەگەڵ دەربڕینە پێکهاتەگەراییەکان و لە





لایەکی ترەوە بە ئەنجامدانی چەند چاکسازییەك بەرەو قۆناغێکی نوێی کامڵبوونی برد. بەشێکی زۆری نووسینەکانی پۆلانزاس دەربارەی چینە کۆمەڵایەتییەکان و دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتە. هەندێك لە نووسینە گرنگەکانی پۆلانزاس بریتیین لە ((دەسەڵاتی سیاسی و چینە کۆمەڵایەتییەکان)) و ((چینەکان و سەرمایەداری هاوچەرخ)) و ((دەوڵەت و دەسەڵات و سۆسیالیزم)) و ((فاشیزم و دیکتاتۆری و قەیرانی دیکتاتۆرەکان)).

پۆلانزاسیش وەکو هابرماس هەوڵیدا کە تیۆرییە مارکسیستیەکان بۆ شیکردنەوەی ڕەوشی نوێی سەرمایەداری (کە بە سەرمایەداری پاشتر ناومان برد) ڕێکبخات. لە کتێبی ((دەسەڵاتی سیاسی و چینە کۆمەڵایەتییەکان))دا کەوتە دەربڕین و ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتەی کە سەرەڕای ئەوەی کە دەوڵەتی هاوچەرخ بە فەرمی و لە ڕواڵەتدا جیاوازە لە ئۆرگانە ئابوورییەکانی بەرهەمهێنان بەڵام بە هۆی پاراستنی یەکپارچەیی کۆمەڵگای سەرمایەداری و پارێزگاریکردن لە ناوەڕۆکە چینایەتییەکەی بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە خزمەتی کۆکردنەوەی سەرمایە و پاراستنی سیستەمی سەرمایەدارییدایە. هەروەها پۆلانزاس جەختی لەسەر ئەو بابەتە کردەوە کە لە پلەی یەکەمدا ڕەوشی پێکهاتەیی دەوڵەت پێگەی دەوڵەت وەکو خزمەتکاری سەرمایەداری مسۆگەر دەکات. بەم جۆرە کەوتە دژایەتیکردنی بۆچوونی ئەو کەسانەی باسیان لە وەرچەرخانی ناوەڕۆکی دەوڵەت کردبوو لە سەرمایەداری پاشتردا. پۆلانزاس لە تیۆرەکانی خۆیدا بەڵگەی هێنایەوە کە دەوڵەت ڕۆڵێکی بنەڕەتی هەیە لە بەرهەمهێنانەوەی پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگادا. دەوڵەت دەبێتە هۆی ڕەنگدانەوەی پێوەندییە چینایەتییەکانی بواری ئابووری لە بواری سیاسەتدا. بەم جۆرە ململانێی چینە کۆمەڵایەتییەکان و چینە ژێر دەستەکان بەشی خۆیان کاریگەرییان دەبێت لەسەر پێکهاتەی دەوڵەتدا.



## ئاشتکردنەوەی پێکهاتە لەگەڵ پراکسیس

پۆلانزاس پێکهاتە گەرایە توند و سەختەکەی ئالتۆسێری هەموارکرد و لەگەڵ ڕۆڵی کارگوزار یا بە وتەیەکی ململانێی چینایەتیدا ئاشتی کردەوە. بەم جۆرە سەرەڕای پاراستنی پێوەندە گرنگەکان لە مارکسیزمی کلاسیکدا نەرمییەکی زیاتری بەخشییە شیکردنەوەی مارکسیستەکانی سەبارەت بە ڕۆڵی ململانێی چینایەتی و پێگەی سەرخان. بە واتایەکی تر پۆلانزاس لەچاو مارکسیستە ئۆرتۆدۆکسییەکان، هەروەها لە چاو ئالتۆسێریشدا شوێنکی زۆرتری بۆ ململانێی چینایەتی دیاریکردبوو بۆیە گرنگییەکی زۆری بە پراکسیس دا. لەم ڕووەوە هەندێك پۆلانزاس بە نەومارکسیست ناودەبەن (هەڵبەتە لە بەرامبەر مارکسیستە مرۆڤگەراکانیشدا ئەم ناوەیان بەکاربردووە).

هەروەها بە بەراورد لەگەڵ ئالتۆسێردا پۆلانزاس سەربەخۆییەکی ڕێژەیی زیاتری بۆ دەوڵەت پەسەندکردووە. لە دەربڕینی پۆلانزاسدا دەوڵەت بریتییە لە کۆمەڵێك لەو پەیوەندییانەی کە لە ژێر کاریگەری ململانێی چینایەتیدا دروستدەبن. دەوڵەت بوارێکە کە کاری ململانێی چینایەتی بۆ دەسەڵاتی سیاسی دەخاتەڕوو. لێرەدا تیۆرییەکەی پۆلانزاس تێڕوانینێکی نوێی لە خۆگرتووە. لە بۆچوونە مارکسیستەکانی پێشودا زیاتر دەوڵەت وەکو مەیدانی زاڵبوونی چینەکان سەیردەکرا، لە کاتێکدا پۆلانزاس دەوڵەت تەنها بە مەیدانی زاڵبوونی چینەکان دانانێت بەڵکو ململانێی چینایەتی بۆ دەسەڵات و بە ڕەنگدەرەوەی ئەم ململانێیەشی دادەنێت.

## دەسەڵاتی سیاسی و هەژموونی ئایدیۆلۆژیایی

لەناو هەموو پێکهاتەیەکی ئابووریدا دەسەڵاتی چینێکی زاڵ هەیە کە لە ئاستی سیاسیدا وەکو دەسەڵاتی سیاسی و لە ئاستی ئایدیۆلۆژیدا وەکو هەژموونی





(سەرکردەیی) ئایدۆلۆژیایی بە دیار دەکەوێت هەژموونی ئایدۆلۆژیایی ڕێ بۆ هەژموونی سیاسی خۆش دەکات و لە بەرامبەریشدا هەژموونی سیاسیش ڕێ بۆ هەژموونی ئایدیۆلۆژیایی خۆشدەکات. ئەم دووە لازم و مەلزوومی یەکترن و یەکیان بەبێ ئەوی تریان نابێت. لێرەدا پۆلانزاس لە ڕوانگەی گرامشی دەربارەی هەژموونی ئایدیۆلۆژیا نزیکدەبێتەوە. ئەو چینەی کە لە بلۆکبەندی دەسەڵاتدا خاوەن دەسەڵات و هەژموونییە بە پەنابردن بۆ ئایدیۆلۆژی خۆی بە پێگەی دەرکەوتنی بەرژەوەندی گشتی دەناسێنێ و هەوڵدەدات پشتگیری چینە ژێر دەستەکان بەدەستبێنێت. هەر بۆیە ئایدیۆلۆژیا یەکێکە لە ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی (دەسەڵاتی چینە دیاریکراوەکان).

## دەوڵەت وەکو بواری ململانێی چینەکان

پۆلانزاس لە کتێبی ((دەوڵەت و دەسەڵات و سۆسیالیزم))دا (١٩٨٧) تیۆرییەکی نوێ دەربارەی دەوڵەت دەخاتەڕوو کە هەم ڕوانگەی پێشووی خۆی پێ ڕاستدەکاتەوەو هەم تیۆری دەوڵەتی مارکسیستی لەو تیۆرییە نزیکدەکاتەوە کە ئێستا بە پلۆرالیزم لە شیکردنەوەی سەرچاوەکانی دەسەڵات ناودەبرێت. پۆلانزاس لە تیۆرییەکەی پێشوی خۆیدا دەوڵەت وەکو مەیدانی دەسەڵاتی چینایەتی پێناسە کردبوو. لەم تیۆرییەدا (دەوڵەت وەکو مەیدانی دەسەڵاتی چینایەتی) پشت بەو واتایە بەستبوو کە دەوڵەت هەوڵدەدات بە بەشداریکردن لە ململانێکانی بواری کۆمەڵگای مەدەنی و سەقامگیرکردنی هەژموونی ئایدیۆلۆژیایی خۆی لەوێدا بەرژەوەندییەکانی چینی زاڵی ئابووری بەرەو پێشەوە ببات و پارێزگاری لە هێزی سیاسی ئەم چینە بکات. بەم پێیە دەوڵەت وەکو نوێنەری بەرژەوەندییەکانی چینی



زاڵ کاردەکات. بەوەها شیکردنەوەیەك بۆ دەوڵەت دەبێت بڵێین کە لەناو پێکهاتەیەکی ئابووری دیاریکراودا دەسەڵاتی چینی زاڵ (ئابووری) لە پێکهاتەی سیاسیدا وەکو دەسەڵاتی سیاسی و لە ئاستی ئایدیۆلۆژیشدا (یان پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیا) وەکو هەژموونی ئایدیۆلۆژیایی (بۆ نموونە بڵاوبوونەوەی ڕوانگە بۆرژوازییەکان لە نێوان هەموو خەڵکیدا) بە دیاردەکەوێت. بەپێی ئەم بۆچوونە چینێکی دیاریکراو لە بلۆکبەندی دەسەڵاتدا سەرکردەیی هەیە کە بە هۆی ئایدیۆلۆژییەکەوە خۆی بە سمبولی بەرژەوەندی گشتی نیشاندەدات و لە کۆمەڵگای مەدەنیدا پاڵپشتی چینی ژێر دەست و ملکەچ بوونیان بۆ خۆی بەدەستدێنێت.

بەڵام لە تیۆری دەوڵەت وەك بواری کێشمەکێشی چینایەتی سەرنجی سەرەکی لەسەر ئەم واتایە دایە کە کێشمەکێشمی و ململانێی چینایەتی لە سنووری کۆمەڵگای مەدەنییەوە دزەدەکاتە ناو ڕایەڵی دەوڵەتیشەوە و کاردەکاتە سەر سیاسەتەکانی دەوڵەت وەکو ڕەنگدانەوەی کێشمەکێش لە کۆمەڵگای مەدەنی. لەم شیکردنەوەیەی دەوڵەتدا ئەگەری کاریگەری دانانی چەند بەشێکی چینە ژێر دەستەکان (چینەکانی خوارەوە) لەسەر چەند بەشێکی دەسەڵاتی سیاسی بە مەحاڵ دانانرێت. بۆیە دەوڵەت وەکو چوارچێوەی دەسەڵاتی سیاسی یەکدەست و یەکپارچە نییە، گەرچی بە زۆری دەسەڵاتی چینی زاڵی ئابووری دەخاتەڕوو، بەڵام بە تەواوی بە دوورنییە لە کارتێکردنی چینەکانی تر. کاتێك کە چەند بەشێکی چینەکانی خوارەوە دەستیان دەگاتە چوارچێوەی دەسەڵاتی سیاسی بەشێوەیەکی سروشتی لەناو کارە گرنگ و سەرەکییەکانی دەسەڵاتی سیاسی واتە بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی چینە زاڵە ئابوورییەکاندا کێشە دروستدەکەن. ڕەنگە وەها کێشمەکێشێك لە ڕێگەی دەسەڵاتی سیاسییەوە تا ئاستی گۆڕانی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی (تەواوی سیستەم) درێژببێتەوە.





لەم تیۆرییەدا سەربەخۆییەکی رێژەیی زیاتر بۆ دەوڵەت لەبەر چاوگیراوە و بەشێویەکی گشتی گەڕانەوەیەکی زۆرتر هەیە بۆ شیکردنەوەی مارکسیستی لە هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی دەوڵەت و ململانێی چینایەتیدا.

## پەیوەستبوونی پێکهاتەیی دەوڵەت بەچینەوە

بەم جۆرە پۆلانزاس وابەستەیی دەوڵەت بە چینەکان بەپێی وابەستەیی پێکهاتەیی شیدەکاتەوە نەك بەپێی پێوەندی کەسیی نێوان بەرپرسانی سیاسی (کەسە حکوومییەکان) لە لایەکەوە و خاوەن سەرمایەکان لە لایەکی ترەوە. پۆلانزاس وەهاتێگەیشتنێك لە فرەیی سەرچاوەکانی دەسەڵات (پلۆرالیزم) پەسەندناکات. ئەو لە مشتومڕێکی نووسراودا لەگەڵ یەکێك لە مارکسیستەکانی سەردەمی خۆی کە لە چەند لێکۆڵینەوەیەکی فراواندا پێوەندی کەسیی نێوان دەسەڵاتداران و سەرمایەدارانی خستبوەروو و رەخنەی لەوەها تێگەیشتنێك لە پلۆرالیزم گرتبوو و رایگەیاندبوو کە دەوڵەت و چینە کۆمەڵایەتییەکان چەند پێکهاتەیەکی راستینەن و ناکرێت پەیوەندی نێوان ئەم دووە بۆ پێوەندی نێوان کەسە سەرمایەدارەکان و نوخبە سیاسییەکان کورت بکرێتەوە (بۆ نموونە بەم جۆرە بوترێت کە دەوڵەتێك لەو رووەوە دەوڵەتی سەرمایەدارییە کە سەرمایەدارەکان لەسەرووی دەزگای حکومییەکانیەوە). رەنگە لە کاتێکدا کە دەسەڵاتی حکوومی لە دەستی نوێنەرانی بۆچوونەکانی چینێکی تردایە دەوڵەت لە خزمەتی چینێکی زاڵی دیاریکراو دابێت. دەوڵەتە فاشیستییەکان نموونەی ئەم رەوشە بوون کە لە لایەن بۆچوون و گرووپە وردە بۆرژواکانەوە پێکهێنرابوون لە کاتێکدا کە لە خزمەتی بلۆکی سەرمایەداری گەورەدابوون.



## بەرەو تیۆریی پلۆرالیزم

پۆلانزاس لە نووسینەکانی ئەم دواییەی خۆیدا دیسان شوێنکی زیاتر بۆ ململانێی چینایەتی و رەنگدانەوەی لە پێکهاتەی دەوڵەتدا دیاریدەکات. لە نەرمبوونەوەیەکی زیاتردا کە بەم جۆرە لە تیڕوانینی پێکهاتەگەرایی پۆلانزاسدا بەرچاودەکەوێت دەوڵەت لە بنەڕەتدا وەکو کۆمەڵێك لە دەزگاکانی دابینکەری یککگرتووی سیستەمی کۆمەڵایەتی سەیردەکرێت. سەرەڕای ئەوەی کە دەوڵەت سەرنج دەداتە سەر بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی چینایەتی چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو لە هەمانکاتدا دەبێت یەکگرتووی کۆمەڵایەتیش بپارێزێت. لەناو خودی دەوڵەتیشدا پەیوەندی چینایەتی و ململانێی چینایەتی بوونی هەیە. دەوڵەت زاتێکی سەربەخۆنییە، بەڵکو بریتییە لە جۆرێك پەیوەندی، پەیوەندی لە نێوان چینەکان لە بواری دەسەڵاتی سیاسی و کاریگەری ئایدیۆلۆژییدا.

چینە کۆمەڵایەتییەکانیش وەکو شتەکان بوونیان نییە، بەڵکو لە کرداری ناکۆکییان لەگەڵ یەکتردا دەبنە خاوەنی شوناس. چین تەنها بە پێگەی لە پرۆسەی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێناندا دیاری ناکرێت بەڵکو هەروەها لە کاری سیاسی و لە ململانێ لەگەڵ چینەکانی تریشدا دیاردەبێت.

پۆلانزاس وەکو تیۆرداڕێژێکی لە جۆری هابرماس شیکردنەوە مارکسیستییەکانی بەرەو پێگەیەکی نوێی کامڵبوون بەرزکردەوە، بەڵام ئەو لە دەرەوەی فەرەنسا زۆر کەمتر لە مارکسیستەکانی دیکەی سەر بە تیۆری رەخنەیی ناسراوە.





## پاژی پێنجەم

# بنەما تیۆرییەکانی لیبرالیزم

### پێشەکی

ئەوەی کە بە لیبرالیزم ناسراوە بریتییە لە ڕەوتێکی هزری و فەلسەفی و سیاسی زۆر بەربڵاو و بەرفراوان کە گەلێك بیرمەند و تیۆرداڕێژ و قوتابخانە بە ناوەکەیەوە گرێدراون. لیبرالیزم نزیکەی چوار سەدە وەرچەرخانی لە هزری ڕۆژئاوادا تێپەڕاندووە و گۆڕاوە بۆ نەریتێکی هزری گەورە کە تەوژمێکی بەربڵاو لە تیۆری و بۆچوونە سیاسییەکانی لە خۆیدا پەروەردەکردووە. لەماوەی ئەو چوار سەدەیەی کە بەسەر سەرهەڵدانی لیبرالیزمدا تێدەپەڕێ چەندین بیرمەندی گەورە پەیدابوون کە بەردەوام ئەم ڕەوتە هزری و سیاسییەیان بەرەو بوارگەلێکی نوێ ئاراستە کردووە و ڕوانگەلێکیٚ نوێیان بۆ کردووەتەوە. گەلێك تیۆری بە تەوژمی میانڕەوی ڕادیکاڵی لەگەڵ بنەما فەلسەفییەکانی لیبرالیزمدا گرێدروان. بە جۆرێك کە لیبرالیزم لە ڕووی ئاراستەگیرییە سیاسییەکان لە لایەوەکەوە تا میانڕەوی و لە لایەکی ترەوە تاسۆسیالیزم هەنگاوی ناوە. بەرنامەگەلێکی سیاسی جۆراو جۆر هەر لە بازاڕی ئازاد و دەوڵەتی لایکەم و دەست تێوەرنەدانی دەوڵەتەوە بگرە تا ڕێکخستنخوازی ئابووری و دەوڵەتی خۆشگوزەران لە چوارچێوەی بۆچوونە لیبرالییەکاندا جێیان بووەتەوە. بیرمەندانێکی وەکو جەیمز میلی بەرگریکاری دیموکراسی بازاڕ و دەوڵەتی لایەنی کەم هەتا جان مینار دکینزی تیۆریداڕێژی ئابووری ڕێنمایی و دەوڵەتی



خۆشگوزەران دەخرێتە ناو چوارچێوەی هزرڤانانی لیبرالەوە. لە ڕووی بۆچوونە تیۆریی و فەلسەفییەکانیشەوە هەر لە بیرمەندانی بڕوادار بەناوگەرایی، و تاکگەرایی وەکو هۆبز بگرە تا بیرمەندانی بڕوادار بە عەقڵگەرایی و کۆمەڵگەرایی، وەکو گرین دەکەونە چوارچێوەی نەریتە هزرییەکانی لیبرالییەوە.

پرسیار لەوەدایە کە ئایا دەکرێت ئەم هەموو تیۆری و بیرمەندە جۆراوجۆرانە بخرێنە سنووری یەك ڕەوتی هزرییەوە بە ناوی لیبرالیزم؟ ئایا دەکرێت لیبرالیزم بە قوتابخانەیەکی گونجاو دابنرێت؟ یاخود ئەوەی کە بە لیبرالیزم ناودەبرێت بریتییە لە تیۆریگەلێکی پەرت و بڵاو کە لە هەندێك لە تایبەتمەندییە گشتییەکانی خۆی لە لایەکەوە لە میانڕەوی کە بەرگریکاری نەریتە لە لایەکی ترەوە لە مارکسیزم کە خوازیاری موڵکداری هاوبەشە جیادەبێتەوە؟ چەند وەڵامێکی جیاواز بۆ ئەم پرسیارە دراوەتەوە. نە یارانی لیبرالیزم باسیان لە ناڕێکی و نەگونجاوی لیبرالیزم کردووەو بە ئایدیۆلۆژیایەکیان ناوبردووە کە ناوەڕۆك و لایەنە سەرەکییەکەی بریتییە لە ئاراستەکردنی بەرژەوەندییەکانی بۆرژوازی وەکو چینێکی کۆمەڵایەتی. لە ڕاستیدا هەندێك لە بۆچوونە لیبراڵییەکانیش شتێك نییە جگە لە پاساو هێنانەوە بۆ بەرژەوەندییەکانی چینێك بەناوی بۆرژوازی و سیستەمێك بە ناوی سەرمایەداری. بە بۆچوونی ئەم توێژەرانە لیبرالیزم قۆناغی سەرکەوتن و پێشکەوتنی خۆی تێپەڕاندوە و ئێستا چووەتە خانەی بیرکردنەوەیەکی سواو و مردووەوە.

بەڵام هێشتا زۆرێك لە لیبراڵە ڕادیکاڵەکان بەلێکدانەوەی پێشکەوتنخوازانەی ئەم فەلسەفەیە و بەستنەوەی بە بەرزترین بەها گشتییە مرۆییەکان لەوانە ئازادی و یەکسانی لە ئازادی بە فەلسەفە و ئامانجێکی باڵای دادەنێین کە زیندووە و بە زیندوویش دەمێنێتەوە. ئەوەی کە لیبرالیزم کام یەك لەمانەیە تارادەیەك لە باسەکانی ئەم پاژەدا ڕوون دەبێتەوە. بەڵام هەرلێرەدا وەکو وەڵامێکی کورت دەبێت بڵێین کە لیبرالیزم بەپێی ئەو لێکدانەوەیەی کە تیۆرداڕێژانی سەر بەم ڕێچکە





هزرییە هەیانە دەتوانێت هەریەك لەو دوانە بێت. لیبرالیزم دەتوانێت قوتابخانەیەکی پەیوەست بە بەرزترین ئامانجە مرۆییەکانی وەکو ئازادی بێت و هەر بەگەڕانەوە بۆ ئەم بەرزترین ئامانجە مرۆییە پاساوهێنانەوەیەکی کورتبینانەی بەرژەوەندییەکانی چینێك و گرووپێك و سیستەمێکی ئابووری-کۆمەڵایەتی تایبەت بێت. هەر لەبەر ئەمەشە کە هەندێ کات لیبرالیزم لە بۆچوونە سیاسییەکاندا تامیانڕەوی دادەبەزی و هەندێ کاتی تر تاسۆسیالیزم سەردەکەوێت.

## شێوازی لێکۆڵینەوەی لیبرالیزم

ئێمە لەم بەرگەدا مامەڵە لەگەڵ هزر و تیۆرییە لیبرالییەکانی سەدەی بیستەم دەکەین. بۆیە زیاتر دەکەوینە خستنەڕووی و تیۆری و داهێنانەکانی هەندێك لە گەورەترین تیۆرداڕێژانی سەدەی بیستەم. بەم کارەش گرنگترین وەرچەرخانەکانی لیبرالیزم لە سەدەی بیستەمدا دەخەینە بەرباس. بۆیە بەر لە چوونە ناوباسکردن دەربارەی بیرمەندانی لیبرال و بۆچوونە لیبرالییەکان. سەرەتا پێویستە چەند باسێك دەربارەی لیبرالیزم وەکو رەوتێکی هزری و مێژوویی لە گشتێتی خۆیدا بخەینەڕوو. بەم جۆرە یەکەمین پاژی ئەم بەشە تایبەت دەکەین بە باسێکی چڕ دەربارەی بنەمای فەلسەفی وەرچەرخانە تیۆرییەکانی لیبرالیزم وەکو رەوتێکی هزریی. ئەو کات لە پاژەکانی پاشتردا باس لە هەندێك لە گەورەترین تیۆرداڕێژانی پەیوەست بەم رەوتە دەکەین.

ناکرێت بۆ ناسینی لیبرالیزم تەنها پشت بە بۆچوونە سیاسییەکانی سەرەکیترین تیۆرداڕێژنی ببەسترێت، چونکە ئەم بۆچوونانە بەپێی بیرمەندانی و بەپێی مێژووی وەرچەرخانی ئەم رەوتە هزرییە زۆر جۆرا و جۆر و هەندێ کات بە تەواوی لە یەکترجیاوازن. کەوابوو دەبێت باسەکە لەو بنەمایانەوە دەستپێبکرێت کە جەوهەر



و ناسنامەی لیبرالیزم دیاری دەکەن و لەو رەوتە هزریانەی تر جیای دەکەنەوە کە لە هەندێ لایەنەوە لەگەڵ بۆچوون و ئاراستە گیرییە سیاسییەکانی لیبرالیزمدا هاوبەشن. چونکە هەروەك باسمان کرد بۆچوونە سیاسیەکانی لیبرالیزم هەر لە میانڕەوییەوە تا سۆسیالیزم بەرفراوان دەبێتەوە. ئەم هێڵکارییەی خوارەوە پەیوەندی بەشەکانی کۆمەڵەی هزریی لیبرالیزم پێشاندەدات.

### بەشەکانی کۆمەڵەی هزریی لیبرالیزم و پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا



## ١- بنەما بوونناسی و فەلسەفییەکانی لیبرالیزم

لیبرالیزم بەو جۆرەی کە ناسراوە و زۆرێك ئاشنان پێی مامەڵە لەگەڵ بەهاگەلێکی وەکو ئازادی و یەکسانی و سەربەخۆ و سەربەخۆیی تاکەکەس دەکات. ئایا دەکرێت بڕوابوون بە بەهاگەلێکی وەکو ئازادی و یەکسانی و سەربەخۆیی تاکەکەسی و مافی گەڕان بە دوای خۆشبەختی بە بناغەی ناسین و پێناسەی لیبرالیزم دابنرێت؟ زۆرکەس وێنایەکی وەهایان هەیە. بەڵام راستییەکەی ئەوەیەکە زۆرێك لە رەوتە هزرییەکانی تر (لەوانە مارکسیزم کە بە ڕکابەری سەرەکی لیبرالیزم دەناسرێت) بڕوایان بەم بەهایانە هەیە. بۆیە دەبێت بۆ ناسینی ناسنامەی لیبرالیزم پەنا بۆ بنەماگەلێکی تر ببردرێت.

راستە کە زۆرێك لەو رەوتە هزرییانە بەهاگەلێکی وەکو ئازادی و یەکسانی و مافی گەڕان بە دوای خۆشبەختی و بەهاگەلێکی تری لەم جۆرەیان وەکو ئامانجی سەرەکی خۆیان رادەگەیەنن بەڵام ئەمانە بۆ پاساوهێنانەوەی ئیدیال بوونی ئەم ئامانجانە لە چەند خاڵێکی دەسپێکی جیاوازەوە دەستپێدەکەن و بەپێی ئەم خاڵانەی دەستپێکردن چەند رێگەیەکی جیاواز بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە پێشنیاردەکەن هەروەك چۆن خودی ئەم بەهایانەش گوزارشتگەلێکی جیاوازیان هەیە. ئەم خاڵە دەستپێکانە پەیوەستدەبن بە تێڕوانینی لایەنی بوونناسی و مەعریفەناسییەوە. هەر تیۆرییەکی سیاسی پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ناوەڕۆکی مرۆڤ و کۆمەڵگا. ئەم پێناسانە بە بنەماکانی بوونناسی یاخود بە واتایەکی تر بە بنەما میتافیزیکییەکان و (بەدەربڕینێکی سادەترین بنەما فەلسەفیەکان)ی رەوتی هزری یان تیۆری سیاسی دادەنرێن.

تاکگەرایی بنەماکانی بوونناسی لیبرالیزم پێکدەهێنێت. تاکگەرایی ناوەڕۆکی سەرەکی جیهانبینی لیبرالییە. لێرەوە لیبرالیزم بۆ نموونە لە مارکسیزم کە خاوەن جیهانبینی کۆمەڵگەرایییەو وەکو لیبرالیزم ئازادیی (بەگوزارشتی تایبەتی خۆی) بە ناوەڕۆکی بەها سیاسییەکان داناوە جیادەبێتەوە. لیبرالیزم بە دەست پێکردن لەم خاڵەوە واتە بڕوابوون



بە تاکگەرایی دەگاتە بەهاگەلێکی وەکو ئازادی تاکەکەسی و ئاسانکاری و مافە تاکەکەسییەکان و بۆ دابینکردنی ئەم بەهایانەش دەگاتە فەرمانڕەوایی یاسا و سنووورداری حکوومەت و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی و ئازادی ئەنجوومەن و چاپەمەنییەکان و هتد.

بەم جۆرە دەبێت لە ناساندنی لیبرالیزمدا لە سێ بابەت بکۆڵینەوە:

١- بنەماکانی بوونناسی-تاکگەرایی

٢- بەهالیبرالیەکان-ئازادی و یەکسانی و مافی تاکە کەسی و هتد.

٣- دامەزراوە سیاسییەکان بۆ پاراستنی ئەم بەهایانە-فەرمانڕەوایی

یاساو حکوومەتی سنووردار و هەڵبژاردنەکان و هتد. جگە لەمە دەبێت هەریەك لە رەوتە مەزنە هزری و سیاسییەکان لە دەقی وەرچەرخانە مێژووییەکان و هەلومەرجی وەرچەرخانی ئابووری-کۆمەڵایەتیدا تەماشابکرێن. هەر ئەم وەرچەرخانە مێژووییانەیە کە هەم رەوتی لیبرالیزمیان دەستپێکردووە و هەم گۆڕانیشیان بەسەردا هێناوە. بەپێی ئەم تێبینیانە سەرەتا ئالێرەدا ئاماژەیەك بە لایەنی مێژووی سەرهەڵدانی لیبرالیزم دەکەین و پاشان باس لە بنەماکانی جیهانبینی بەهاکان و ئامانجە لیبرالییەکان و سەرئەنجام دامەزراوە سیاسییەکانی جێی باسی لیبرالیزم دەکەین.

### چەند ئاماژەیەك بۆ پێشینەی مێژوویی لیبرالیزم

لیبرالیزم وەکو قوتابخانەیەکی هزری و ئایدۆلۆژیەك دروستکەری هەلومەرجێکی مێژووییەکە پەیوەستە بە لەناوچوونی پەیوەندیە فیوداڵییەکان و سەرهەڵدانی پەیوەندییە بۆرژوازییەکان و گەشەکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری. هەموو ئامانج و بەها سەرەکییە لیبرالییەکان وەکو ئازادی و یەکسانی و سەربەخۆیی تاکە کەسی





هەر هەمووی لەسەر بنەمای ئاراستەگیری دژ بە پەیوەندییە فیودالییەکانن بووە وەك ئیمتیازاتی ئاریستۆکراتی، ریزبەندی پلەو پایەکان و دابەشبوونی کۆمەڵگا بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی. بۆیە زۆرێك لە توێژەران پێیانوایە کە لیبرالیزم تەنها وەکو قاڵبی ئایدیۆلۆژی بۆرژوازی دەناسرێت[١]. لە کاتێکدا کە لایەنگرانی لیبرالیزم دەیانەوێت بەرزتر لە ئامرازی ئایدیۆلۆژیای چینێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی نیشانبیدەن و بەشتێکی پەیوەست بە بنەما گشتییە مرۆییەکان رابگەیەنن. هەروەها لیبرالیزم چیرۆکی بەگژداچوونی پاشایەتییە رەهاکانی ئەوروپا بووە بۆ گەیشتن بە حکومەتی سنووردار و بەگژداچوونی کلێسا بۆ گونجانی ئایینی و جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت.

لیبرالیزم کاریگەرە بە مرۆڤگەرایی رێنیسانس. تاکگەرایی وەکو بەشێکی جەوهەری لیبرالیزم لە تێڕوانینێکی نوێی مرۆڤی سەردەمی رێنیسانسەوە وەرگیراوە. لە بنەڕەتدا جیهانبینی لیبرالیی مرۆڤگەرایانە و تاکگەرایانەیە و ناوەڕۆکێکی دنیایی هەیە. بەڵام لە سەردەمی رێنیسانسدا بزووتنەوەی چاکسازی ئایینی و راستڕەوی ئایینزایی و پرۆتستانیزمیش هەروەك لە بەرگی دووەمدا باسکرا هاوئاراستە بوون لەگەڵ ئەم بەهایانەدا و بەشی خۆیان هاوکاریان کرد لە پێشکەوتنیدا.

## بنەماکانی جیهانبینی لیبرالی

ناوەڕۆکی سەرەکی لیبرالیزم بریتییە لە تاکگەرایی. گەلێك کەس ئەم تاکگەراییە بە تاکگەرایی بۆرژوازی ناودەبەن، چونکە تێگەیشتنێکی تایبەت لە خۆدەگرێت[٢]. تاکگەرایی لیبرالی (بە تێگەیشتنە بۆرژوازییەکەی) تێگەیشتنێکی بوونناسی و ئەخلاقی دیاری هەیە. بەپێی ئەو واتایە تاك لە پێشەوەی کۆمەڵگایە و لە ئەو



بنەڕەتی تر و واقعی ترە. لە روی ئەخلاقیشەوە، بەپێی ئەم روانگەیە تاك بەهایەکی بەرزتری لە هەموو کۆمەڵ یان گرووپ و یاخود تەواوی کۆمەڵگای هەیە. لە رووی فەلسەفیشەوە هەروەك لە تیۆرییەکەی هۆبز لۆکدا روونمان کردەوە[٣] بوونی تاك لە پێشترە لە سەرهەڵدانی کۆمەڵگای سیاسی. هەروەها چەمکی تاك لە لیبرالیزمدا جەخت کردنەوە لەسەر لایەنە جیاکەرەوەکانی تاك و جیاکردنەوەی ئەو لە کەسەکانی تریش لە خۆدەگرێت. لیبراڵە کلاسیکەکان جیاکردنەوە و سەربەخۆیی تاك بە چۆنیەتییە بنەڕەتییەکانی ژیانی مرۆڤ دادەنێن. گەلێك لە لیبراڵەکان (نەك هەموویان) تائەو جێیە بەرەوپێش دەچن کە کۆمەڵگا نەك تەنها بە لاوەکی بەڵکو لە بنەڕەتدا بەوەهمێکی دادەنێن.

هەروەها تاکگەرایی رەنگدانەوە تێڕوانینی ئەو زانستە نوێیەیە کە لەگەڵ رێنیسانسدا گەشەی کردوو روە بەرجەستەکەشی ئەم وتە دەستپێکەرەی دیکارتەکە: ((من بیردەکەمەوە کەواتە هەم!)) ئەم تێگەیشتنە لە رووی جۆری تێڕوانینی ئەرکی مرۆڤ و ئەخلاق واتای تایبەتی خۆی هەیە. بەو واتایەی کە بەپێی وەها تێگەیشتنێك بەهاکان پەیوەستن بە خواستی مرۆڤەوە نەك دنیای دەرەکی. بەر لەمەو لە سەدەکانی ناوەڕەستدا بەهاکان دەگەڕێندرانەوە بۆ جیهانی باڵا واتە سروشت و خوداوەند. دەوترا کە چاك یان خراپ لە لایەن خودا یاخود سروشتەوە دیاریکراوە لە کاتێکدا کە بەپێی تێڕوانینی نوێ چاك و خراپ دەبەسترێتەوە بە هەڵبژاردنی مرۆڤەوە.

تاکگەرایی کاری کردە سەر تێڕوانینی ئایینیش. لە ئایینزای پرۆتستاندا وتراکە نابێت تاك شوێن دەسەڵاتێکی ئایینی دانراو و دەرەکی بکەوێت، بەڵکو دەبێت گوێ لە بانگی خودا بگرێت کە راستەوخۆ لە رێگەی ویژدانی تاکەوە قسەی لەگەڵدا دەکات. دەبێت تاك خۆی بەهاکانی خۆی هەڵبژێرێت.

## ليبراليزم و پۆزتيڤيزم

بەوەی کە لەسەرەوە باسکرا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە ئایا دادوەریکردنی ئەخلاقی پشت بە هیچ شوێنێك نابەستێ؟ واتە خۆ بەخۆ و خۆویستە؟ لە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارەدایە کە لیبرالیزم لەگەڵ پۆزتیڤیزم وەك یەکێك لە رەوەتە هزرییە مەزنەکان لە چەرخی مۆدێرندا پەیوەندی پەیدا دەکات. لیبرالیزم هاوئاراستەیە لەگەڵ پۆزتیڤیزمدا دەڵێت کە دەبێت لە کاتی دادەوریکردنی ئەخلاقدا تاك بەو شێوەیە مامەڵە بکات کە لێکۆڵەرێك لەکاتی لێکۆڵینەوەی زانستیدا مامەڵە دەکات. بەم جۆرە کە بکەوێتە تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی راستی و بگاتە فۆرمبەندی بیروباوەڕێك. لە هەمانکاتدا وەها شێوەیەك ئەو ئەگەرە دەرەخسێنێ کە تاکەکان سەبارەت بە راستی بگەنە جۆرێك لە گونجانی ئەخلاقی. ئەوەی کە دەبێتە مایەی ناکۆکی بڕوای نێوان مرۆڤەکان بریتییە لە لەبەر چاونەگرتنی تەواوی راستی و نەگەیشتن بە حەقیقەت. هەر لێرەدا بوو کە بێنتهام (هەر وەك باسمان کرد) هەوڵیدا بە گۆڕینی تەواوی حەزەکان و بێزارییەکان بۆ هەستی چێژ و ئازار بیانگۆڕێت بۆ چەندێتی شیاوی پێوانەکردن.

پێکەوە لکاندنی دادوەریکردنی ئەخلاقی لەگەڵ گەڕانی زانستیدا لە لایەکی تریشەوە پەیوەندی هەیە لەگەڵ تیۆری ئەخلاقی لیبرالیدا. قبوولکردنی وەهاشتێك ئەو واتایە لەخۆ دەگرێت کە تاك ناچار نییە بۆ گەیشتن بە فەرمانە ئەخلاقییەکان پەیڕەوی لە دامەزراوەیەکی ئایینی تایبەت یان دنیایی کە سەرچاوەی فەرمانی ئەخلاقییە بکات، بەڵکو دەبێت خۆی بکەوێتە گەڕان. جگە لەمە پەیوەندییەکی پێویست نییە لە نێوان راستی و بەهادا، واتە ناتوانین لەوەی کە ((هەیە)) بگەینە ((دەبێت)) لەم رووەوە ئەخلاقی لیبرالی دەکەوێتە بەرامبەر ئەخلاقی ئایینی و ئەخلاقی مارکسیستی. لە ئەخلاقی ئایینی و مارکسیستیدا پاش ئەوەی وەلامی چییەتی جیهانمان دایەوە چۆنیەتی کارکردنی لێوە وەردەگرین. لیبرالەکان رەخنە لەم



جۆرە ئەخلاقە دەگرن کە لەم حاڵەتەدا دەکرێت بەپرسیارێتی کردار بدرێتە پاڵ فاکتەرێکی دەرەکی تر. بۆ نموونە مارکسیستەکان دەتوانن بە شتێك لە بەرپرسیارێتییە ئەخلاقییەکانی خۆیان بدەنە پاڵ مێژوو. هەروەك چۆن زۆرێك لە دیکتاتۆرە پاوانخوازەکان بە پەسەندکردنی پەیامی مێژووی بۆ خۆیان ویژدانی خۆیان لە ژێر باری ئەو تاوانانەی کەتووشی دەبن رزگار دەکەن. یاخود بە هەمان شێوە رەنگە دیکتاتۆرە ئاییندارەکانیش تاوانەکانی خۆیان بە ئەرکی ئایینی لەقەڵەمبدەن.

تێڕوانینی زانست و پەسەندکردنی رەخنە و گونجان و لێکۆڵینەوە و پێشکەوتن لە رێگەی ئەزموون و هەڵە چەند بەهایەکی تری لیبرالیزمن. لیبرالیزم لەسەر هەمان بنەماش سەیری ئەخلاق دەکات.

## عەقڵ و حەزەکان

لیبراڵە کلاسیکەکان کاری مرۆڤیان دەگەڕاندەوە بۆ ئارەزوو زاتییەکانی خۆی. بە بڕوای ئەوان ئارەزووەکان بەشێوەی وزەی سروشتی لە ناخی تاکەوە هەڵدەقوڵێت. تاك بۆ تێرکردنی ئەم ئارەزوانە سوود لە عەقڵ وردەگرێت. لە کاتی روونکردنەرەوەی تیۆرییەکانی هۆبزدا باسمان لەوە کرد کە چۆن حەزی پاراستنی زات بە سوود وەرگرتن لە عەقڵ دەگاتە دامەزراندنی دەوڵەت یان کۆمەڵگای سیاسی. هۆبز و هیۆم و بێنتهام ئارەزووەکانیان وەکو کەڵەکە بووی چەسپاوی سروشتی مرۆڤ بە سەربەخۆ دادەنا و پێیانوابوو کە دەبێت ئەخلاقیات و سیاسەت لەگەڵ ئەم حەزانەدا هەماهەنگ بکرێن. ئەم بنەڕەتە بۆ پێکهاتەی ئابووریش درێژەی پێدەدرێت و لێرەوە دەگەنە لە پێشتر بوونی ئابووری بازاڕ. عەقڵ گرنگترین توانایە کە تاك هەیەتی بۆ سەربەخۆی و وجودی خۆی. نەوەکانی یەکەمی لیبرالەکان عەقڵیان بە





تواناى هەژماركردن لێكدەدايەوە و بەخزمەتكارى ويستەكان و گەڕان بە دواى بەرژەوەندييەكانى خۆيانيان دادەنا. بەڵام لە سەردەمى رۆشنگەريدا لێكدانەوەيەكى نوێ بۆ عەقڵ دروستبوو. لەوانە كانت عەقڵى نەك بە تواناى هەژماركردن بەڵكو بە چرايەك دادەنا بۆ رێنماييكردنى خواستەكان. كانت بەپێى بنەڕەتى خودرێسايى و خۆبەدەستەوەنەدان لە بەرامبەر ناخودرێسايى پەيڕەوكردنى عەقڵى لە حەز روون كردەوە.

## كۆمەڵگا وەكو بوونێكى گريمانەيى

هەروەكو ئاماژەمان پێ كرد لە بووناسى ليبراليدا تاك لە كۆمەڵگا لە پێشترە و لەويش واقعيترە. تەنانەت هەندێك لە بۆچوونە ليبرالييەكان بە تەواوى كۆمەڵگا رەت دەكەنەوە. بێنتهام هەروەك لە بەرگى دووەمدا باسمان كرد كۆمەڵگا بەتەنها كۆكردنەوەى ژمارەيى تاكەكان دادەنێت، بۆيە بە ((چەند گريمانەيەكى لۆژيك))ى لەقەڵەمدەدات. ئايزايا بەرلين كە يەكێكە لە بيرمەندانى ئەم دواييە دەڵێت كە ((خەڵك)) لە چەمكە گشتييەكەيدا نەدەتوانێت سزا بدرێت و نەدەتوانێت ئازادبێت و نە (جگە لە واتا ئەبستراكتەكەى) دەتوانێت بوونى هەبێت هەڵبەتە هەموو ليبرالييەكان بوونى كۆمەڵگا بە گريمانەيى و بێ بنەما دانانێن. لەوانە جى.ئێچ گرينى بيرمەندى هيگڵگەراى ئينگليزى بڕواى وابوو كە ((بەبێ كۆمەڵگا تاكەكان بوونيان نابێت))[٤].

## تێڕوانينە فەلسەفييە سەرەكييەكان لە ليبراليزمدا

لە بەرگى دووەمدا بە درێژى باسمان لەو سيستەمە فەلسەفييانە كرد كە لە ماوەى مێژووى هزرى سياسيدا لە چوارچێوەى كۆمەڵەيەكى هزرى بنەما تيۆرييەكانى ليبراليزميان فەراهەم كردووە. هەر لەوێدا ئاماژەمان بەوە كرد كە دەكرێت لە پۆلێن كردنێكى گشتيدا سێ تێڕوانينى سەرەكى بووناسيدا بۆ هزرى سياسى نوێ



دەستنيشانبكرێت و دەكرێت بەپێى ئەم سێ تێڕوانينە ياخود ئەم سێ خاڵەوە دەسپێكە سێ نەريتى گرنگ لە بنەما هزرييەكانى ليبراليزمدا لێك جيابكرێنەوە ئەم سێ تێڕوانينە بريتين لە:

١- تێڕوانينى مافە سروشتييەكان كە هۆبز و لۆك لە ديارترين بيرمەندانى ئەم تێڕوانينەن.

٢- تێڕوانينى سوود و بەرژەوەندى كەسى كە بێنتهام و ميل لە ديارترين تيۆرداڕێژانين.

٣- تێڕوانينى عەقڵى و ئەخلاقى كە كانت لە دامەزرێنەران و بيرمەندانى ديارى ئەم تێڕوانينەيە.

تێڕوانينى مافە سروشتييەكان بەرەو نەريتى گرێبەستى كۆمەڵايەتى رۆيشت. تێڕوانينى سوود و بەرژەوەندى كەسى قوتابخانەى بەرژەوەندى گەرايى گەشە پێدراو تێڕوانينى عەقڵى و ئەخلاقيش بەرەوتى دەوڵەتى عەقلانى كۆتاييهات. ليبراليزم لەم كۆمەڵە هزرييەى كە بە درێژيى باسى لێوەكرا چەند پاڵپشتێكى هزرى و فەلسەفى گەورەترى بەدەستهێنا.

## ٢- ئامانجەكان و بەهاكانى ليبراليزم

ئەوەى كە لەسەرەوە باسكرا روانگە و تێڕوانينە مرۆڤناسييەكان يان بە زمانێكى سادەتر فەلسەفيەكانى ليبراليزم بوون. هەروەك باسمانكرد ناوەڕۆكى سەرەكى ئەم تێڕوانينە و ئەم فەلسەفەيە بريتييە لە تاكگەرايى. لەسەر بنەماى ئەم تاكگەراييە زنجيرەيەك بەهاو ئامانج دروستدەبێت كە گرنگترينيان بريتين لە ئازادى و ئاسانكارى و سنوورى تايبەتى و رێزدارى مرۆڤ و موڵكدارى تايبەتى و گەڕان بە دواى خۆشبەختيدا. لە باسەكانى خوارەوە بە كورتى باس لە هەريەك لەو بەهايانە دەكەين.





## ئازادی

دیارترین و بەرجستەترین بەهاو ئامانجی لیبرالیزم بریتییە لە ئازادی. لە راستیدا تەواوی بەهاکانی تری وەکو ئاسانکاری و سنووری تایبەتی و مافی گەڕان بە دوای خۆشبەختی تاکەکەسی و هتد لە راستیدا لە ئازادییەوە وەرگیراون، لە کاتێکدا ئەو دامەزراوە سیاسییانەی کە بە لای لیبرالەکانەوە مەبەستە بۆ پاراستنی ئەم بەهایە و ئەو بەهایانەی کەلێیەوە وەرگیراون. بۆ گەلێك لە لیبرالەکان مولکداری تایبەتی درێژەی لۆژیکی ئازادییە. ئازادی بۆ لیبرالیزم ئەوەندە گرنگە کە هەندێ کات لیبرالەکان قوتابخانەکەیان لە رێگەی وشەی ئازادییەوە پێناسەدەکەن. لەگەڵ ئەمشدا دەڵێین کە ئازادی چەمکێکی لاستیکییە و زۆرێك لە لیبرالەکان زۆر راستگۆنین لە ستایش کردنیدا.

هەروەك ئاماژەی پێکرا پشتبەستن بە بەهای ئازادی تایبەت نییە بە لیبرالیزم. هزرو ئایدیۆلۆژیگەلێکی تریش هەن کە پشت بە ئازادی دەبەستن. ئەوەی کە لەم رووەوە لیبرالیزم جیادەکاتەوە ئەوەیە کە بە بۆچوونی لیبرالەکان ئازادی ئامرازێك نییە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی بەرزتر، بەڵکو خۆی لە خۆیدا بەرزترین ئامانجی سیاسییە [٥]. بەم حاڵەوە چەمکی ئازادی بە دوورنییە لە تەمومژ و نادیاری. کاتێك کە باس لە ئازادی دەکرێت دەبێت بپرسین ((ئازادی لە چی و ئازادی بۆچی و ئازادی بۆکێ)) لە وەڵامی ئەم سێ پرسیارەدایە کە ناوەڕۆکی هزرێك یان ئایدیۆلۆژییەك یاخود قوتابخانەیەکی سیاسی بە دیاردەکەوێت.

ئەگەر بەپێی پۆلێن کردنێکی باو لیبرالیزم دابەشبکەین بۆ سێ قۆناغی لیبرالیزمی کلاسیك و لیبرالیزمی نوێ و نەولیبرالیزم ئەوا دەتوانین بڵێین کە لیبرالیزمی کلاسیك بەرەو دوکترینی (ئازادی نیگەتیڤ)) و لیبرالیزمی نوێ وبەرەو ((ئازادی



پۆزەتیڤ)) و نەو لیبرالیزم بەرەو گەڕانەوە بۆ چەمکی کلاسیکی واتە ئازادی نێگەتیڤ هەنگاویان ناوە و هەنگاو دەنێن.

ئازادی نێگەتیڤ: ئازادی نێگەتیڤ واتە هەبوونی هەلومەرجێك کە تیایدا تاك ناچارو پابەند نییە لە ژێر فشاردانییە و دەست لەکارەکانی وەرنادرێت. ئەم تێگەیشتنەی ئازادی واتە نەبوونی رێگرو بەربەست لە بەردەم ئەنجامدانی کاردا. لە بیرمەندانی کۆن هۆبز ئازادی بە واتای نەبوونی بەربەستە دەرەکییەکان لەبەردەم تاکدا بەکاردەبات و لە بیرمەندانی نوێش ئایزایا بەرلین ئازادی بەواتای بوارێك بەکاردەبات کە تیایدا تاك دەتوانێت بەبێ دروستکردنی بەربەست ئەوانی ترەوە کاربکات. لە راستیدا ئایزایا بەرلین ئازادی وەکو ((سنوورێك بە دوور لە دەست تێوەردان)) لێکدادەتەوەو دەڵێت هەرچەندە دەست تێوەردان کەمتر بێت ئازادی زۆرترە و هەر چەندە دەستتێوەردان زۆرتر بێت ئازادی کەمترە.

لە ژیانی سیاسیدا ئازادی بەواتای ئازاد بوون لە دەست تێوەردانی دەوڵەتە. بۆیە لێرەدا بە گشتی ئازادی دەکەوێتە بەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەت. دوو روویی لیبرالیزم لەوەدایە کە بەشێوەیەکی گشتی دەسەڵاتەکانیتر وەکو دەسەڵاتی سەرمایەداران و مۆنۆپۆلە ئابوورییەکان بە بەربەستی سنوردارکردنی ئازادی ئەوانیتر لە قەڵەمنادات، یاخود چاوپۆشی لێدەکات. ئەم دەسەڵاتانەش دەتوانن وەکو دەسەڵاتی دەوڵەت ئازادی سنووردار بکەن.

ئازادی پۆزەتیڤ: مەبەست لە ئازادی پۆزەتیڤ ئەوەیە کە دەبێت دەوڵەت بە دەستتێوەردانی پۆزەتیڤ (هەنگاونانی پۆزەتیڤ) هەلومەرجی بەهرەمەندکردنی تاکەکانی کۆمەڵگا لە ئازادی فەراهەمە بکات، هەڵبەتە بە بۆچوونی لیبرالەکان نابێت ئەم دەستتێوەردانە لە ئاستێکدا بێت کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان یان ناوەڕۆکی سیستەمەکە بگۆڕێت [٦]. بەپێی ئەم تێڕوانینە کاری دەوڵەت بریتی نییە





لە خستنەڕووی خۆشبەختی بۆ تاکەکان، بەڵکو تەنها فەراهەمکردنی ئەو هەلومەرجەیە کە تاکەکان بتوانن بەوەکارخستنی تواناکانی خۆیان بە دوای خۆشبەختیدا بگەڕێن. تی. ئیچ. گرینی بیرمەندی سەدەی نۆزدەیەم چەمکی «ئازادی پۆزەتیڤ»ی خستەڕوو. گرین پێیوابوو کە نابێت ئازادی تەنها بە ئازاد بوون لە کۆت و بەند یا زۆرداری لێکبدرێتەوە. بە بۆچوونی ئەو ئازادی راستەقینە ئەوەیە کە زۆرترین رێژەی تاکەکانی کۆمەڵگا لە زۆرترین توانا بەهرمەندبن تابتوانن باشترین رێگەکان بۆ ژیانی خۆیان هەڵبژێرن. بەم جۆرە گرین چەمکی نێگەتیڤی ئازادی واتەنەبوونی بەربەستی گۆڕی بە چەمکی پۆزەتیڤ واتە توانای ئەنجامدانی کار. هەروەها گرین ئەم بنەڕەتەشی هێنایە پێشەوە کە دەبێت هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا توانای هەڵبژاردنی باشترین رێگەکانیان هەبێت بۆ ژیانی خۆیان.

بەر لەوە کە گرین ئەو تیۆرییە دابنێت و راستیە ئابووری کۆمەڵایەتییەکان بەرەو دەستتێوەردانی دەوڵەت و دوورکەوتنەوە لە بنەڕەتی دەستتێوەرنەدان هەنگاویان نابوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هێشتا گەلێك لە لیبرالەکان خەریکی پیاهەڵدان بوون لەسەر بنەماکانی دەستتێوەرنەدان و بازرگانی ئازادو ئابووری بازاڕ کە کلاسیکەکان خستبوویانە روو. بە هەرحاڵ دوا بەدوای وەرچەرخانە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و گۆڕانی کارکردنی دەوڵەتە لیبرالەکان، هەروەها باسەکانی کەسانێکی وەك گرین، جەخت لەسەر ئەو خاڵە کرایەوە کە خەڵکی بۆ ئەوەی بەراستی ئازادبن دەبێت بتوانن باشترین سود لە تواناکان و هەلەکان و لێهاتوییەکانی ژیانی خۆیان وەربگرن. بەرنامەگەلێکی وەکو فراوان کردنی هەلی کارکردن و کەمترین هەقدەست و دڵنیایی بێکاری و تەندروستی بە چەند رێگەیەکی دابینکردنی ئەو خواستە دانراوە.



## ئازادی بۆکێ

ئەوەی لەسەرەوە باسکرا وەڵامی (ئازادی بۆچی) بوو. هەروەك باسکرا دەکرێت لەم ئاقارەوە بڕواداربین بە دوو جۆر ئازادی نێگەتیڤ و ئازادی پۆزەتیڤ. بەڵام سەبارەت بە پرسیاری «ئازادی بۆکێ» وەڵامی لیبرال ئەوەیە کە ئازادی بۆ تاکە. لە پەیوەندی لەگەڵ ئازادییەکانی تاك و بۆ مسۆگەر کردنی لە سنووری ماف و دامەزراوەکان و بە هاگەلێکی وەك ئازادی پێکهێنانی ئەنجومەن و کۆڕ و کۆبوونەوە و یەکێتییەکان و بڵاوکردنەوەی بیروڕا شوێنێکی تایبەتییان هەیە. هەڵبەتە لیبرالە سەرەتاییەکان هاوڕانەبوون لەگەڵ ئازادگەلێکی لە جۆری پێکهێنانی یەکێتی کرێکاران و ئەنجومەنەکان. هۆکارەکەشی (جگە لە کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم تیۆرییە لە بەرگریکردن لە بەرژوەندییەکانی بۆرژوازی کە لە راستیدا لایەنداربوونی تیۆری لیبرالەکان ئاشکرادەکات) ئەوە بوو کە ئەوان هەموو جۆرە دامەزراوەیەکی گرووپیان بە هەڕەشەیەك دەزانی دژ بە ئازادی تاکەکەسی. تەنانەت سەبارەت بە دەوڵەتیش رەشبین بوون و تەنها وەکو لایەنیکەمی پێویستی بۆ بەرگریکردن لە ئاسایشی تاکەکان قبووڵیان دەکرد.

بەڵگەهێنانەوە بۆ بەرگریکردن لە ئازادی تاکەکەسی

١- یەکێك لە پاساو هێنانەوە کلاسیکییەکانی لیبرالەکان بۆ جەخت لەسەر زەروورەتی ئازادی تاکەکەسی ئەوە بووە کە پەیوەندییەکی راستەوخۆ هەیە لە نێوان ئازادی و داهێنان و ئەفرێنەریدا هەیە. ستوارت میل ئەم حوکمەی بۆ بواری گەشانەوەی هونەریش گشتاند و وتی کە هونەر ناتوانێت بەبێ ئازادی گەشەبکات. ئێستا ئەم بۆچوونە زۆر جێی پەسەندی لیبرالەکان نییە سەرەڕای ئەوەش کە گەشانەوەی وێنەی هونەر و ئەدەبیاتی سەردەمی حکوومەتی تزارەکان و سۆڤیەتی سەردەمی ستالین، هەروەها گەشەی ئەدەبیاتی پیوریتانی لە بریتانیا





(پیوریتانەکان-یا مەسیحییە پرۆتستانتە راستڕەوەکان- ئاییندارانێکی توندڕەوبوون) پێچەوانەیەکی گرنگی ئەم بۆچوونەیە.

٢- دووەمین بەڵگە بۆ پاساو هێنانەوەی ئازادی تاکەکەسی ئەوەیەکە تەنها لە باسی ئازادی نێوان خاوەن روانگە جیاوازەکانە کە حەقیقەت ئاشکرادەبێت.

٣- سێیەمین بەڵگە بۆ بەرگریکردن لە ئازادی تاکەکەسی ئەوەیە کە ژیانی تاك پەیوەستە بە خۆیەوە. هەموو تاکەکان مافی بنەڕەتی و سروشتی ژیان و بیرکردنەوە و هەبوون بڕوای تایبەت بە خۆیان هەیە.

رەخنەگرانی ئەم تیۆروانینە وەها بەڵگە دێنێنەوە کە ئەم تێگەیشتنە توندڕەوانەیە لە ئازادی ناتوانێت بەردەوام بە ئاراستەی گەشانەوەی کەسێتی مرۆڤ بێت چ بگات بەوەی کە بە پێچەوانەوە هەڕەشەیەك بێت بۆ سەر تەندروستی کەسێتی تاك. شیکردنەوەی پرشنگداری دۆرکیم کۆمەڵناسی گەورەی فەرەنسی دەربارەی خۆکۆشتن کە سەرچاوەکەی بەبێ رێسایی هەڵدەسەنگێنێت پاڵپشتی ئەم بۆچوونەیە ئەوە دەردەخات کە بەردەوام رێسا کۆمەڵایەتییەکان کۆت و بەندێك نین بۆ مرۆڤ بەڵکو رۆڵی پۆزەتیڤیان هەیە لە تەندروستی کەسێتیدا.

لیبرالیزم لە سەدەی نۆزدەیەم (کەبە لیبرالیزمی نوێ ناوی دەرکرد) دوورکەوتەوە لە تێگەیشتنی توندڕەوانە لە ئازادی تاکەکەسی، هەروەك لە خستنەڕووی بۆچوونەکەی گریندا باسمانکرد بە فەرمی دانینا بە واقیعی پەیوەندی بەرامبەری تاك و کۆمەڵگاو چەمکی پۆزەتیڤی ئازادیدا. لیبرالەکانی پەیوەست بەم تێگەیشتنە وەها بەڵگەیان هێنایەوە کە ئازادی تاکەکەسی تەنها دیوی ژیانی کۆمەڵایەتییە و رووەکەی تری واتە کاری گرووپی بەلای کەمەوە هێندەی ئازادی تاکەکەسی جێی گرنگی پێدانە.





## پێکەوە گونجان (ئاسانکاری) و فرەیی

پاساوهێنانەوەی عەقلانیی پرەنسیپی پێکەوە گونجان ئەوەیە کە ناسینی مرۆیی سنوردارە و هیچ کەسێك ناتوانێت لە ئایین و ئەخلاقدا بانگەشەی زانستی یەقینی بکات و بڵێت کە راستی تەنها لە لای ئەوە و بەس. پێکەوەگونجان دوکترین و بەهایەکە بۆ پەرەپێدانی بەهای ئازادی و تەواو کردنی. پێکەوە گونجان ئەرکێکە لەسەر ئەو بنەمایەی کە نابێت رێ لە دەربڕینی بیروڕاو ئەنجامدامی ئەو کارانە بگیردرێت کە زیان بە مافی بەرامبەری خەڵکی ناگەیەنێت.

پرەنیسپی فرەیی چەمکێکی نوێترە. لە فرەگەرییدا خاڵی جەختکردنەوە لە جۆرا و جۆری تاکەکانەوە دەگوازرێتەوە بۆ جۆراو جۆری کۆمەڵەکان. فرەگەرایی جەخت لەسەر پەرت و بڵاوی سروشتی کۆمەڵگاو نەبوونی بەرژەوەندییە گشتییەکان و ویستی گشتی بەواتا رۆسۆییەکەی دەکاتەوە. بەپێی ئەم پرەنسیپە کۆمەڵگا پێکهاتەیەکی هاوجۆری نییە و لە پێکەوەبوونی گرووپە جیاوازەکانەوە دروستبووە کە هەریەك بە دوای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا دەگەڕێن و هەر کاتێك کە پێکدادان لە نێوان ئەم بەرژەوەندیانەدا دروستدەبێت ئەوا چارەسەرەکەی ئەوەیە کە لەگەڵیەکدا رێکبکەون، نەك ئەوەی یەکێك بەسەر ئەویتردا زاڵبێت. (سەبارەت بە بنەماکانی فرەگەرایی لە پاژەکانی پاشتر روونکردنەوەی زیاتر دەخەینەروو).

دەتوانین لە هەڵسەنگاندنی ئەم بۆچوونەدا بڵێین کە هەڵبەتە ئەگەر ناکۆکی لەسەر سوود و بەرژەوەندییەکان بێت رەنگە بکرێت پەنا بۆ رێکەوتن ببرێت، بەڵام کاتێك کە ناکۆکی لەسەر بنەماکانە ئەوا کێشەکە بەو ئاسانییە نییە. بۆ نموونە ئایا دەکرێت بگونجێیت لەگەڵ لێدوانی کەسێك کە دەبێتە مایەی وروژاندنی هەستی کۆمەڵێك لە دژی کۆچبەران و لە کۆتاییدا دەبێتە مایەی بەد رەفتاری کردن لەگەڵ ئەواندا؟

## ٣- ئۆرگانەکان و شێوازە پێویستەکانی بۆ گەرەنتی کردنی ئازادی

بۆ گەرەنتی کردنی ئازادی پێویستمان بە حکوومەت و چەند ئۆرگانێك هەیە کە تیایدا ئازادی تاکەکەسی، ئاسایش، بنەمای پێکەوەگونجان، سنووری تایبەتی و هەموو ئەو شتانەی کە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەمانەدا پێویستن دابینبکات و بیانپارێزێت. بۆ گەرەنتی کردنی ئەم مەبەستەش بنەمای سەروەری یاسا، سنووردار بوونی حکوومەت، بە هەڵبژاردن بوونی رابەرانی سیاسی، وەڵامگۆبوونیان، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و دابینکردنی مافەکانی هاوڵاتییان لە دەستووردا گرنگترین رەهەندەکانی پێکدەهێنن.

### سەروەری یاساو سنووردار‌بوونی حکوومەت

یەکێك لە پێش گریمانەکانی لیبرالیزم ئەوەیە ئەو بەهایانەی کە پەیوەستن بە ئازادی تاکەکەسییەوە لە لایەن حکوومەتەوە لە هەڕەشەدایە و یەکێك لە رێگاکانی رووبەڕووبوونەوەی ئەم هەڕەشەیە ئەوەیە کە دەسەڵاتی حکوومەت بە سەروەری یاسا سنووردار بکرێت. یەکێك لە رێگەکانی سنووردارکردنی دەسەڵاتی حکوومەتیش ئەوەیە کە رەوایی حکومەت پەیوەست بێت بە رەزامەندی و رێکەوتنی گشتییەوە. حکوومەت پێکهاتەیەکی سەربەخۆنییە و دەبێت وەڵامگۆبێت لە بەرامبەر ئەرك و کارەکانی خۆیدا. هەڵبژاردن یەکێکە لە رێگەکانی وەڵامگۆکردنی حکوومەت.

بەڵام حکوومەت دەبێت لە بەرامبەر چ کەسانێکدا وەڵامگۆبێت؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە وەرچەرخانی هزرو دوکترینەکانی لیبرالیزم دەخاتە روو، نەوە یەکەمەکانی لیبراڵەکان رەزامەندی و وەڵام وەرگرتنەوەیان دەبەستەوە بەکەمینەیەك لە



دەوڵەمەندەکان کە لە باسکردنی تیۆرییەکانی لۆکدا بەم بابەتە ئاشنا بووین[٧]. دەستووریش یەکێکە لە ئامادەکارییەکانی سنووردارکردنی دەسەڵاتی حکوومەت.

### جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان

یەکێك لە رێگەکانی سنووردارکردنی دەسەڵات بریتییە لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کە خۆی لە خۆیدا گرەنتییەکە بۆ جێبەجێکردنی دەستوور. هەروەك باسمانکرد سەرەتا مۆنتسکیۆ بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی خستەڕوو. بۆچوونی مۆنتسکیۆ ئەوە بوو کە دەبێت بۆ رێگرتن لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات، دەسەڵات بە دەسەڵات سنووردار بکرێت. ئەوەی کە رەنگە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان ببێتە مایەی لاوازکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت و لەناوچوونی توانایییەکەی بابەتێك نەبوو کە نەوەی یەکەمی لیبراڵەکان نیگەران بکات، چونکە بە بۆچوونی ئەوان ئەوەی کە دەبوو لێی بترسن زۆر بوونی دەسەڵاتی حکوومەتە نەك کەم بوونی.

### موڵکداری

بەشێوەیەکی ئاسایی لیبرالیزم ئازادی و موڵکداری بە پەیوەستی یەکتر دادەنێت. ((هەر مرۆڤێك بە تاکە خاوەنی کەسی خۆی دادەنرێت و ئەمە موڵکدارییەکە کە هەرگیز هەڵناوەشێتەوە))[٨]. موڵکداری شتە دەرکییەکان درێژەدان و پەرەپێدانی موڵکداری کەسە بە سەرخۆیدا. لە لایەکی ترەوە لیبرالیزم موڵکداری بە مەرجێکی گرنگ لەقەڵەمدەدات بۆ گیانی شارستانی هاوڵاتییان. گەلێك لە لیبراڵەکانیش موڵکداری بە مەرجی پێویستی پێشکەوتن دادەنێن.





## ٤- رەخنەگیری لە لیبرالیزم

### سنووردارێتیە مێژووییەکانی لیبرالیزم

لیبرالیزم لە لایەکەوە وەکو هزر و ئایدۆلۆژیای چینێکی کۆمەڵایەتی تایبەت و لە لایەکی ترەوە بە راگەیاندنی زنجیرەیەك بنەما و رێسایی گشتی چووە ناو بواری ژیانی هزری و کۆمەڵایەتی و سیاسی. ئەم راستیەش هەم خاڵە لاوازەکان و هەم خاڵە بەهێزەکانی لیبرالیزم دیاریدەکات. خاڵە لاوازەکان لیبرالیزم دەگەڕێنەوە بۆ لایەنگیرییە چینایەتییەکەی و خاڵە بەهێزەکانیشی دەگەڕێنەوە بۆ بنەما گشتییەکانی. لیبرالیزم لە بەرامبەر کۆت و بەندەکانی سیستەمی فیۆدالی بنەمای ئازادی و لە بەرامبەر ئیمتیازە چینایەتییەکانی دەرەبەگەکانی بنەمای یەکسانی و لە بەرامبەر تاکڕەویی پاشاکان بنەمای سەروەری یاساو لە بەرامبەر کاروباری کۆمەڵایەتی سیستەمی فیودالی بنەمای رێزداری مرۆیی و لە بەرامبەر ئایینداری ئۆرگانیزە کراو (کلێسا) بنەمای ئازادی ویژدانی خستەڕوو. بەم جۆرە لیبرالیزم بانگەشەی زنجیرەیەك بنەمای زانستی مرۆیی گونجاو لەگەڵ ئاستی مرۆیی و خۆشبەختی گشتیدا دەکرد. بەڵام لیبرالیزم هەموو بنەما گشتییانە بە پێی پێویستەکانی چینێکی تایبەت (بۆرژوازی) و سیستەمێکی تایبەت (سەرمایەداری) و فەرمانڕەوایی و حکوومەتی ئەم چینە خستبووەڕوو. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم بنەما گشتییانە (ئازادی و یەکسانی و رێزداری مرۆیی و دەسەڵاتدارێتی خەڵك) توانایەکی ئازادیبەخش و پێشکەوتنخوازیی زۆریان تیادا بوو کە گەلێك لە قازانجی تەسك بینانەی ئەم چینە کۆمەڵایەتییە (بۆرژوازی) لە پێشتر بوون. بەم جۆرە لیبرالیزم وەکو شمشێرێکی دوو دەم وابوو کە هەم دەکرا بۆ پاساو هێنانەوە بۆ قازانجی تەسك بینانەی چینێك سوودی لێوەربگیرێت و هەم بە



پێچەوانەشەوە لە دژی کاربپێبکرێت. رەنگە بتوانین بڵێین هەر لەبەر ئەمەش هزر و تیۆرییە لیبرالەکان گەلێك ناسازگاری دەخەنەڕوو.

لە بەرگی دووەمدا و لەکاتی خستنەڕووی بۆچوونی گەلێك لە تیۆردارێژانی گەورەی لیبرال وەکو هۆبز و لۆك و بێنتهام و کانت بەپێی توانا ئەو رەخنانەمان خستەڕوو لە تیۆرییەکانیان گیراون. لێرەدا پاش ئەو شتەی کە ناساندنی لیبرالیزمدا وەکو رەوتێکی هزری گشتی وتمان ئاماژە بە هەندێك لە خاڵە گشتیترەکانی رەخنەی لیبرالیزم دەکەین. لە لایەکی تریشەوە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەش بەرەخنەی تیۆرییە نوێترەکانی بیرمەندانی لیبرال دەکەین.

### ناکۆکی ناوخۆیی لیبرالیزم

لیبرالیزم لە ناوخۆیدا ناکۆکییەکی گرنگی تیادابوو، چونکە لە لایەکەوە بە بەرزەفڕەیی بە دوای ئازادی مرۆڤدا دەگەڕا و لە لایەکی تریشەوە پەیوەست بوو بە دروستبوون و کامڵبوونی سیستەمێك کە بووە مایەی دروست بوونی دیارترین شێوەی نامۆبوون (لەو جۆرەی کە لە تیۆرییەکەی مارکسدا باسمانکرد). لیبرالیزم لە بەرگریکردن لە قازانجە چینایەتییەکانی بۆرژوازی بووە پاساودەری نایەکسانی و ستەمکارییە ئاشکراو شاراوەکان و بووە بەرگریکاری سیستەمێك (بۆرژوازی) کە بە جەمسەر بەندی توندی هەژاری و سامان و دروستبوونی پرۆلیتاریا کۆتایی هات. ئەگەر لەوەها سیستەمێکدا نەدارەکان بیانەوێت ئازادی خۆیان بفرۆشن و دەوڵەمەندەکانیش هەوڵبدەن ئازادی خەڵکی (بۆ نموونە دەنگەکانیان) بکڕن چی رووەدات؟ یەکێك لە شورشگێرە فەرەنسیەکان دەڵێت هەلومەرجێك هەیە کە تیایدا جوتێك پێڵاو بە بەهاترە لە بەرهەمەکانی شکسپیر.

## پارادۆکسی ناوخۆیی تیۆری موڵکداری

گەلێك لە لیبراڵەکان هەبوونی ئاستێکی دارایی بە پێویست دەزانن بۆ بەهێزکردنی بنەماکانی پابەندبوونی هاوڵاتی. پرسیار لەوەدایە کە ئایا دەکرێت ئەمڕۆکە ئەم حوکمە بگشتێنرێت بۆ هەمووان؟ ئەگەر بمانەوێت ئەم حوکمە بگشتێنین ئەوا دەبێت سەبارەت بە کۆمەڵی گەورەی بە پرۆلیتاریا بوو واتە ئەو کۆمەڵەی کە خاوەنی هیچ جۆرە موڵکداریەك نییە چ بڕیارێك بدەین؟ لە هەلومەرجی ئەمڕۆدا گشتاندنی ئەم حوکمە لە راستی دەرەوەدا نابێتە شتێکی دیکە جگە لە سۆسیالیزم. چونکە کۆمەڵگای ئەمڕۆ زۆر دوورکەوتنەوە لەو هەلومەرجەی کە رۆسۆ بۆ دیموکراسییە ئایدیالییەکەی خۆی وێنای دەکرد. رۆسۆ دیموکراسییە راستەوخۆکەی خۆی لە کۆمەڵگایەکدا بە گونجاوە دزانی کە لە خاوەنی کەرەستەی بەرهەمهێنانە بچووکەکان (پیشەگەران و جوتیاران) پێکهاتووە. بۆچوونی رۆسۆ وابوو کە موڵکداری بچووك هاندەری سەربەخۆی تاکە کەسییە. گەلێك لە لیبراڵەکانیش هەمان بۆچوونیان هەیە. بەڵام ئایا کۆمەڵگای ئەمڕۆ هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەم ئایدیالەدا هەیە؟ ئەمڕۆ کە خاوەن مەیدانە سەرەکییەکانی ئابووری و سیاسی کۆمپانیاگەلێکن کە داهاتەکانیان لە داهاتی هەندێك لە وڵاتانیش زیاترە.

بابەتێکی تر بنەمای یەکسانی هەلەکانە. لە هەلومەرجێکدا کە هەمووان هەلی یەکسانیان هەیە ئەو کات خۆشبەختی و بەدبەختی تاکەکان پەیوەستە بە خۆیانەوە. بەدبەختەکان خۆیان بەرپرسی رەوشی نالەباری خۆیانن و هەموو جۆرە پشتگیرییەکی دەوڵەت بۆ ئەمانە وەکو هاندانی تەمبەڵی و نەنگی وایە. گەلێك لە لیبراڵەکان وێڕای دەربڕینی ئەم بۆچوونە لە هەمانکاتدا کۆکن لەسەر گواستنەوەی موڵکداری لە رێگەی میراتەوە. لە کاتێکدا کە بنەمای یەکسانی هەلەکان هەر هیچ نەبێت ناکۆکە لەگەڵ گواستنەوەی موڵکداری بەشێوەی میراتگری. لەوەها حاڵەتێکدا گەلێك لە خەڵکی هەلومەرجی خۆشبەختی و بەدبەختی خۆیان بە میرات وەردەگرن. لە کۆتاییشدا گشتاندنی لۆژیکی بنەمای یەکسانی هەلەکانیش بە سۆسالیزم کۆتایی دێت.



بەم چەند ئاماژەیە کۆتایی بەرەخنەی لیبرالیزم دێنین و لێرەدا بواری باسکردنی دوور و درێژمان نییە. لە شوێنی خۆیدا و لە کاتی باسکردنی تیۆرییەکانی بیرمەندانی لیبرالی قۆناغەکانی پاشتر هەندێك ئاماژەی تریش دەخەینەڕوو.

## هاوسازیی و ناهاوسازی لیبرالیزم

لیبرالیزم بە هۆی پەیوەست بوونی بە چینەکان و بابەتە چینایەتییە تایبەتەکان لە لایەك و گەڕانەوە بۆ بنەما گشتییەکان لە لایەکی ترەوە لە ماوەی قۆناغی گەشەکردنی خۆیدا چەندین پارادۆکسی لەناو خۆیدا دوستکردووە. هەوڵی بەردەوامی گەروەترین بیرمەندان و تیۆرداڕێژان نەیان توانیوە سەربکەون بەسەر ناهاوسازییە خۆییەکانی ئەم سیستەمە هزریەدا. لەگەڵ ئەمەیشدا هێشتا بیرەمەندانێك هەن کە لیبرالیزم بە قوتابخانەیەکی هاوساز دادەنێن. بەپێی هەڵسەنگاندنی ئەم بیرمەندانە دەتوانین خاڵێکی گرنگ بە تەوەری رەوتی هزری لیبرالیزم و بە مایەی رێکی هاوسازی ئەو دابنێن. ئەم خاڵە بریتییە لە بەڵێنداربوونی بەردەوامی لیبرالیزم بەرامبەر بە مافی یەکسانی سەبارەت بە ئازادی. لیبرالیزم سەرەڕای ئەو وەرچەرخانە پڕهەڵبەز و دابەزەی کە لەماوەی قۆناغە جۆراو جۆرە مێژووییەکاندا هەیبووە بەردەوام لەناو جەوهەری ویستەکانی خۆیدا بە دوای ئەم بەهایەدا گەڕاوە. هەر ئەم تایبەتمەندییەشە کە لیبرالیزم لە میانڕەوی جیادەکاتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم شرۆڤەکارانە دەتوانن بە بەهای پاڵنانی لیبرالیزم بەرەو گۆڕەپانەکانی رادیکالیزم بەرگری لە خۆی و لە رێکییەکەی بکەن. ئەگەر بەهای سەرەکی لیبرالیزم بە مافی یەکسانی سەبارەت بە ئازادی دابنێین، لەم حاڵەتەدا رەنگە تاسۆسیالیزم بەروەپێشەوە بچین. بە هەرحاڵ هەروەك لە داهاتوودا دەبینین هەر ئەم بەهایە سۆسیال دیموکراتیزم لە هەڵوێست وەرگرتنە کۆمەڵایەتییەکانیدا بەرەو پێشەوە دەبات و رێگەدەدات کە چەندین تیۆری و تیۆرداڕێژی نوێ لەم بوارەدا سەرهەڵبدەن لە کاتی ناساندنی بیرمەندانی وەکو پۆپەر و راڵز زیاتر بەم بابەتە ئاشنادەبین.





**یادداشتەکان:**


1- Robrt Eccleshall et al political Ideologies, An Introduction, London-Newyork, Routledge, Third edition 2003, P.19.

٢- آنتونی أربلاستر، لیبرالیسم ازظهورتا سقوط، ترجمه عباس مخبر، تهران، نشر مرکز، چاپ سوم، ص ١٩.

٣- بەرگی دووەم پاژی ٢ و ٣.

٤- پێشو، أنتونی أربلاستر، ص ٤٤١.

٥- هەمان سەرچاوە، ل ٨٣.

٦- روژە بوردو، لیبرالیسم، ترجمە عبدالوهاب احمدی، تهران، نشرنی، ١٣٧٨، ص ٥٨.

٧- بەرگی دووەم، پاژی ٣.

٨- هەمان سەرچاوە، ل ٨١.

٩- پێشو، أنتونی أربلاستر، ص ٣.




# پاژی شەشەم

## فریدریش هایك و بەڵگەیەكی نوێ بۆ بەرگریكردن لە لیبرالیزمی كۆن

### ژیان و بەرهەمەكانی هایك

فریدریش هایك (١٨٩٩-١٩٩٢) لە تیۆرداڕێژە كۆمەڵایەتییە ناودارەكانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمە. لە نەمسا لە دایكبووەو سەرەتا وەكو ئابووریناسێكی دیاری نەمسا ناوی دەركرد. لە ساڵی ١٩٣١ وەكو زۆربەی رۆشنبیرانی ئەڵمانی و نەمسایی ناچار بوو ولاتەكەی بەجێ بهێلێت. بۆ ئەم كارەش رووی كردە بەریتانیا و لەوێدا مایەوەو بووە هاولاتییەكی ئەو ولاتە. لە ساڵی ١٩٥٠ لە زانكۆی شیكاگۆ و لە ساڵی ١٩٦١ لە زانكۆی فرایبۆرگ دەستی بەوانە وتنەوەكرد. لە سەردەمی سەرۆك وەزیری مارگێت تاچردا (١٩٧٩-١٩٩٠) بیروڕاكانی كاریگەرییەكی زۆری هەبوو لەسەر بریتانیا و چەندین جار مارگرێت تاچر پشتی بە بۆچوونەكانی ئەو دەبەست.

یەكەمین كتێبی هایك بریتی بوو لە رێگەی كۆیلایەتی (١٩٤٤) كە بووە هۆی دژایەتی كردنی كۆمەڵێكی زۆر لەگەڵ ئەودا. لە ساڵی ١٩٦٠ كتێبی (پەیڕەوی ئازادی)ی بلاوكردەوە كە بە یەكێك لە گەورەترین بەرهەمەكانی هایك دادەنرێت. كتێبێكی گرنگی دیكەی هایك بریتییە لە ((یاسا، یاسادانان و ئازادی)) كە لە ساڵی ١٩٨٢ دا بلاوكرایەوە. دوو كتێبی دیكەی هایك واتە ((سەرابی دادپەروەری كۆمەلایەتی)) (١٩٧٦)و ((سیستەمە رامیارییەكانی خەڵكی ئازاد)) (١٩٧٩) پێشتر بلاوكرابوونەوە. كتێب و نوسراوە گەورەكانی هایك كە باس لە بوارە جیاوازەكانی زانستی كۆمەلایەتی دەكەن هەموو یەك رێگە (كەلە كۆتاییدا بریتییە لە بەرگریكردن لە پێگەكانی لیبرالیزم) دەپێوون.

## ژیاندنەوەی لیبرالیزمی کلاسیک

نووسینەکانی هایك هەروەك کەشوهەوای گشتی سەردەمی ئەو لە رۆژئاوا باس لە دووبارە گرنگیدان بە لیبرالیزمی کلاسیك دەکات. لیبرالیزمی کلاسیك کە خەریك بوو لە ژێر رەخنەی قووڵ و رووخێنەرەکانی کۆتایی سەدەی نوزدەیەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بە مێژوو بسپێردرێت، بەڵام بە نووسین و تیۆرداڕێژییەکانی هایك گیانێکی نوێی هاتەوە بەر. هایك بەشێوەیەکی نوێ و بە بونیادنانی سیستەمێکی هزریی نوێ دەستی دایە بەرگریکردن لە بانگەشە سەرەکییەکانی لیبرالیزمی کلاسیك و لەوانە بەهاگەلێك وەکو پلەی تاکێکی مرۆڤ، لە پێشتربوونی ئەخلاقی ئازادی، باشەکانی بازاڕی ئازاد، بنەماکانی حکوومەتی سنووردار، دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریدا. لەم رووەوە هزر و تیۆرەکانی هایك خاوەن پتەوی و هاوسازییەکی تایبەتین و پلەی تیۆرداڕێژێکی گەورەیان پێ بەخشیوە. هایك توانیویەتی بە قووڵ بوونەوەیەکی هەمەلایەنە لە بەشە زانستییە جیاوازەکانی وەك ئابووری و فەلسەفە و فەلسەفەی ماف و مێژووی هزر سیستەمێکی هزری نوێ دابمەزرێنێت کە ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە بەڵگە هێنانەوەیەکی نوێ بۆ سەلماندنی بنەماکانی لیبرالیزمی کلاسیك.

## سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆڕسک

تەوەری سەرەکی سیستەمی هزری هایك بریتییە لە چەمکێك بەناوی سیستەمی خۆڕسك یاسیستەمی خۆڕسك خۆبزۆین. هەموو نوسراوە گەورە و دوور و درێژەکانی هایك لەم تیۆرە دەکۆڵنەوە و ئێمەش لەم باسە کورتەدا زیاتر بۆچوونی خۆمان لەسەر ئەم تیۆرە، کە لە دەستکەوتە گرنگەکانی هزری هایکە چڕدەکەینەوە. بانگەشەی سەرەکی ئەم تیۆرە ئەوە کە هەموو سیستەمەکان لە وانەش سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی خۆڕسك و بەپێی چەند رێسایەك دروستدەبن کە



دەکەونە دەرەوەی ویستی رێکخراوی ئێمەی مرۆڤ. ئەو هەوڵانەی کە دەخرێنەگەڕ بۆ رێکخستنی کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان، چ لە رەهەندە گەورەکانی لە جۆری بۆلشەڤیکی و چ لە رەهەندە بچووکەکانی لە جۆری سۆسیال دیموکرات و تەنانەت لیبرال دیموکراتیش چەند هەوڵێکی بێهودەن کە جگە لە گاڵتەجاڕ بوونی بانگەشە گەورەکانیان تەنها دەتوانن زیان بە سیستەمی خۆڕسکی بازاڕ بگەیەنن، کە لە دەوەرەی دەسەڵاتی عەقڵ و ویستی ئێمە گەورەترین خزمەتی بەرهەمهێنانی سەرمایەدەکات.

لە باسەکانی دواتردا زیاتر باس لەم تیۆرەی هایك دەکەین وەکو یەکێك لە دەستکەوتە گرنگەکانی هزری سیاسی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم.

## فەلسەفەی ناسینی هایک

ئاماژەمان بەوەکرد کە هایك بەشێوەیەکی نوێ بانگەشەکانی لیبرالزمی کلاسیك دەخاتەڕوو و بەڵگە دروستیی بۆ دەهێنێتەوە. بەشێکی ئەم نوێبوونە دەگەڕێتەوە بۆ مەعریفەناسی یان بەواتایەکی تر بنەماکانی ئێپیستمۆلۆژیای هایك. هایك لە بۆچوونی ئێپیستمۆلۆژیای خۆیدا کاریگەری کانتی لەسەرە، یان بە واتا باوەکەی کانتییە. بە تایبەتی لەو خاڵە گرنگەی کە کانت ناسینی خودی کاروبارەکان یان ((بوون)) بەمە حاڵە دەزانێت و توانای ناسین بە سنووردار دەزانێت لە چوارچێوەی ((روخسار))دا. لەسەر ئەم بنەمایە هایك دەڵێت کە ئێمە ناتوانین شتەکان بەو جۆرە بناسین کە هەن، لەوانەیە ئەو سیستەمەی کە ئێمە لە جیهانی دەرەوەدا بە رواڵەت دەیبینین لە راستیدا وێنای هەستی ئێمەیە و بەرهەمی چالاکی ئافرێنەرانەی زەینی ئێمەیە نەك ئەو شتەی کە بەراستی لە واقیعیەتی دەرەوەدا بوونی هەیە[١]. بۆیە بە بۆچوونی هایك (هاوئاراستەی لەگەڵ چەمکی ناسینی





کانتی) ئەو تێگەیشتنەی کە ئێمە هەمانە دەربارەی جیهان و ئەو چەمکانەی کە بۆی دروستدەکەین هەموو بەرهەمی زەینی ئێمەیە و لە ئەزموون و حەزە مرۆییەکانی ئێمەوە دروستبووە. تەنانەت لە تێگەیشتنە هەستییەکانی خۆشماندا (بینین و بیستن....) بە جۆرێکی هەڵبژاردەیی کاردەکەین. هەندێك لە شتەکانی لەبەر چاودەگرین و بەشێکی زۆری شتەکانیش فەرامۆش دەکەین. بۆیە بەم جۆرە ناسینێکی ئێمە دەبێتە ناسینێکی ئەبستراکت. لە لایەکی ترەوە ناسینی ئێمە کردەییە، بەو واتایەی  کە بەشێوەیەکی ناچاریی لە ڕێساکانی کاردا بەرجەستە دەبێت.

هایك لەسەر ئەم بنەمایەو بە پاڵپشتی قوتابخانەیەکی ئابووری بە قوتابخانەی نەمسایی ناسرابوو بڕاوی بە تیۆری زەینی بوونی بەها هەبوو. بەپێی ئەم تیۆرە بەها وەکو چەمکێکی بنەڕەتی لە زانستی ئابووریدا لە تایبەتمەندییە زاتی و ناوەکییەکانی کاڵاکان یاخود سەرچاوەکان نییە، بەڵکو بەهایەکی زەینییە. ئەوەی کە بەها دەبەخشێتە کاڵاکان و سەرچاوەکان کاری لە پێشتر دانانی زەینی ((کارکەرەکان))ە. لە ڕاستیدا ئەم دیدگایە خاڵی کۆتایی تیۆرە ئابووریە کلاسیکەکان و کەسانێکی وەك ئادەم سمت هەتا مارکسە کە هەموویان بەهایان وەکو شتێکی زاتی و بینراو لە بەرچاوەگرت. هایك دەیوت کە ناتوانین دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو پارە و سەرمایە و کەرەستەکانی بەرهەمهێنان بەشێوەیەکی فیزیاوی و لەسەر بنەمای تایبەتمەندییە فیزیاییەکان شیبکەینەوە. چونکە ئەمانە بڕواو وێناکانی ئێمەی مرۆڤن کە لە پەیوەندی فۆرمەکانی ژیانی مرۆییدا سەریانهەڵداوە.



**ڕەخنەی عەقڵگەرایی مۆدێرن**

خاڵی دەستپێکی تیۆری سیستەمی خۆڕسك و ڕەتکردنەوەی ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە دەکرێت بەشێوەیەکی بنەڕەتی کۆمەڵگا بکرێتە شوێنکەوتووی ڕێکی بەرنامەدار و ڕێکخستنی هۆشیارانە بریتییە لە ڕەخنەی نەریتی عەقڵگەرایی ڕۆژئاوا. بنەمای ئەم عەقڵگەراییەش بریتییە لە جیاوازی دیکارتی نێوان زەین و بینراو. جیاوازی نێوان بینراو (جیهانی دەرەوە) زەین (توانای تێگەیشتن و ناسینی مرۆیی) لەسەر ئەو هزرە دامەزراوە کە جەوهەرێکی سەربەخۆ بەناوی زەین هەیە کە دەکەوێتە دەرەوەی جیهانی سروشت و کۆمەڵگاوە و سەرگەرمی ناسینی ئەوانە. هایك لەو بڕوایەدایە کە ئەم وێنا دوو فاقییە دیکارتییە (جیاوازی نێوان زەین و بینراو) توشی ئەو هەڵەیەمان دەکات کە وەك بڵێی  دەکرێت بەشێوەیەکی بەرنامەدار کۆمەڵگاو ئۆرگانەکانی ڕێك بخەین.

هایك دەڵێت ئەم هەڵەیە و ئەم بۆچوونە لەو شوێنەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئێمە وەکو پرۆسە فیزیاییەکانی ئۆرگانیزمی مرۆڤ تەماشای پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان دەکەین. واتە وەها وێنای دەکەین بەهەمان شێوە کە مێشك و دەمارەکانی کارە جەستەییەکانی ئێمە بەڕێوە دەبەن دەکرێت لەناوەندێك (ناوەندی بەرنامە دڕێژی)یشەوە کۆمەڵگا و پرۆسەکانی بەڕێوەببرێن. لە کاتێکدا کە ئەمە بۆ خۆی خەیاڵێکی زیانبەخشە. وەها گومانێکی هەڵەیش ڕیشەکەی لەناو ڕەگە دوور و درێژ و کاریگەرەکانی هزری ڕۆژئاوادایە کە دەگەڕێتەوە سەر هزری ئەفلاتوونی و مەسیحی سەرانسەری کەلتووری ڕۆژئاوا. بەپێی ئەم نەریتە وادادەنرێت کە عەقڵێك لە دەرەوەی جیهانی یاخود لەناو جیهان و یان لەناو گیانی مرۆییدا فەرمانڕەوایی بەسەر جیهان و مرۆڤەوە دەکات. دەکرێت وەها بۆچوونێك بە بڕوابوون بە ((عەقڵی بنیاتگەر)) دابنرێت. وەها وێنایەکە کە بناغەی وێنای ((بنیاتگەراکان))





دروستدەكات. هایك دەڵێت كە بنیاتگەراكان نازانن كە خودی عەقڵ پەیوەستە بە سیستەمێكی خۆڕسك لە ژیانی زەینیدا.

### ڕێكی پلاندار (پلان بۆ دانراو) و ڕێكی بێ پكلان (پلان بۆ دانەنراو)

هەر ڕێكیەك بریتییە لە كۆمەڵە ڕەگەزێك كە بە جۆرێكی سیستەمدار (نەك بەرێكەوت) بەیەكەوە نوساون. دەكرێت ئەم ڕێكی یان سیستەمە بە گشتێكی تاك دابنرێت. دەكرێت وەها سیستەمێك بە بەرنامە و پلاندانانی بكەر یاخود كارگوزارێكی خاوەن هۆش دروستبووبێت وەكو ئامێرێك و دەكرێت بە جۆرێكی خۆڕسك دروستبووبێت وەكو ئۆرگانیزمێكی بیۆلۆژیك (بوونەوەرێكی زیندوو). تیۆرەكەی داروین سەبارەت بە كامڵبوونی سروشتی نموونە سیستەمێكی سروشتی خۆڕسك یان بێ پلانە. هایك بەڵگە بۆ ئەوە دەهێنێتەوە كە سیستەمێكی كۆمەڵایەتییەكانیش لەم جۆرەن واتە وەكو سیستەمی سروشتی بەو جۆرەی كە لە تیۆرەكەی داروینیدا ڕەنگیداوەتەوە خۆڕسك و بێ پلانن.

نكۆڵی كردن لەو هزرەی كە دەكرێت سیستەمی كۆمەڵایەتی بكرێتە شوێنكەوتووی پلاندارێژێكی عەقڵانی چەقی هەموو باسەكانی هایكە. هایك دەڵێت كە كودەتا و سیستەمە پاوانخوازەكانی وەكو بۆلشەڤیزم و فاشیزم لەم هەڵە گەورەیەوە دروست بوونەو بەرهەمی ئەمانە شتێك نییە جگە لە تێكشكاندنی بنەماكانی ئازادی تاك و شكستی ئەو بانگەشانەی كە لەسەر بنیاتگەری دامەزراون.

### سیستەمی خۆڕسكی كۆمەڵگا

هایك بەباشی ئاگادارە لە جیاوازی نێوان ڕاستی سروشتی و ڕاستی كۆمەڵایەتی. لەگەڵ ئەمەشدا بڕوای وایە كە هەر بەو جۆرەی كە سیستەمێكی خۆڕسك و بێ



پلان زاڵە بەسەر سیستەمی سروشتیدا، سیستەمێكی بێ پلان و خۆڕسكیش زاڵە بەسەر كۆمەڵگادا. ڕوونترین تیشكی سیستەمی خۆرسك لە كۆمەڵگادا بازاڕ و ئاڵوگۆڕە. ئەگەر بازاڕ بەحاڵی خۆیەوە وازی لێبهێنرێتخود بە خود حەز بە هاوسەنگی دەكات و بەهاوسەنگی دەگات. گەشەی زمان و كامڵبوونی یاساكان و پەیدابوونی و كامڵبوونی ڕێسا ئەخلاقییەكان چەند نموونەیەكی تری سیستەمی خۆڕسكن. قازانج و زیان لە ئابووری بازاڕدا هەمان میكانیزمی هەیە لە دروستكردنی ڕێك و پێكییەكی خۆڕسك لە سیستەمی سەرمایەداریدا كە بنەڕەتی ململانێی مانەوە و هەڵبژاردنی گونجاوتر هەیەتی لە كامڵبوونی سروشتیدا. بەپێی یاسای قازانج و زیان كارە ئابوورییە ((گونجاوتر))ەكان لە شوێنی خۆیاندا دەمێننەوە و كارە ئابوورییە ((ناگونجاوتر))ەكان وەلاوە دەنرێن. بەم جۆرە ئەو جۆرانەی بەهەرمهێنان كە بتوانن پارێزگاری لە كۆمەڵێكی زۆرتر بكەن مانەوەیەكی زیاتر لە خۆنیشاندەدەن لە بەرامبەر ئەو جۆرانەی كە بێ بەشن لەم توانایە.

### سەرچاوەی سیستەمی خۆڕسك لە ئەخلاق و یاسادا

ئەخلاق و یاساش وەكو زمان چەند درەوشانەوەیەكی سیستەمی خۆڕسكن. ئەمانە بەشێوەیەك خاوەنی نەخشەی پێشوەخت دیاریكراونین و لە دڵی ژیانی مرۆڤەكانەوە سەریان دەرهێناوە. داب و نەریتە نەئەخلاقییەكان وردەوردەو بەشێوەیەكی هەستپێنەكراو بەپێی پێداویستی و هەلومەرجی مرۆڤەكان دەگۆڕێن. بە هەمان شێوە یاسایش لە ڕەفتاری بەرامبەری مرۆڤەكان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا دروستدەبێت. بۆیە پێشینەی ((مێژوو)) یاسا هێندەی پێشینەی خودی كۆمەڵگایە. بە پێچەوانەی وێنای باوی خەڵك، یاسا ئافرێنراوی سەرچاوە حكوومییەكان نییە، بەڵكو لە ڕەهەندە زاتی و ناوخۆییەكانی ژیانی كۆمەڵایەتییەوە سەرچاوەیان وەرگرتووە. یاسادانراوەكان لەم یاسا شاراوانەوە سەرمەشق وەردەگرن.





## ڕەخنەی ئابووری چەقبەستوو و پلاندار

بەشێکی سەرەکی سەرگەرمی هایك بریتییە لە ڕەخنەی ئابووری چەقبەستوو و بەرنامە بۆ دارێژراو کە دیارترین جۆری لە یەکێتی سۆڤیەتدا هەبوو. هایك سەرکەوتنی ئابووری پلانداری سۆسیالیستی بە مەحاڵ دەزانی و لەم بارەیەشەوە لە هەندێ ڕووەوە بۆچوونەکەی بەکردەوە سەلماند.

مەحاڵبوونی ئابووری پلاندار لە ڕووی ئیپیستمۆلۆژیاوە لەو تێزەی هایکەوە سەرچاوەدەگرێت کە هیچ ئۆرگانێکی بەرنامە ڕێژی ناتوانێت تەواوی زانیارییە پێویستەکانی لە بەردەست دابێت بۆ بەرنامە ڕێژییەکی بەنرخ و گونجاو. بۆچی بە دەست هێنانی وەها زانیاریگەلێك مەحاڵە؟ چونکە ئەم زانیارییانە لە سروشتی خۆیاندا پەرت و بلاو و ناوچەیی و بگۆڕن. هیچ کەسێك یان هیچ ئۆرگانێك ناتوانێت بەدروستی بزانێت کە کۆمەڵی گەورەی سەرچاوە و داهات و ئەولەویات و هەلەکان لە تەواوی ئابووری ولاتێکدا چۆن دابەشکراون. ئالۆزی ئەم زانیارییانە لە لایەك ودینامیکییەت و گۆڕانی بەردەمیان لە لایەکی ترەوە ئەگەری بەدەستهێنانی زانیارییە گشتگیرەکان مەحاڵدەکات. جگە لەمە، ئەم جۆرە ناسینەی کە لە لێهاتووە کردەییەکاندا هەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خستنەڕوویان لەسەر کاغەز بێ واتابکات.

ئەو ئابوورییەی کە مارکس باسی لێوەدەکات و وەك بلێی دەکرێت لە ڕێگەیەوە زاڵبین بە سەر ((پاشاگەردانی)) بازاڕدا لەسەر بنەمای ئەم تێگەیشتنە نادروستەی ناوەڕۆکی ناسینی مرۆڤ بنیات نراوە[٢].

## بازاڕ و سیستەمی خۆڕسك

ئەگەر هیچ کەسێ یان ئۆرگانێك ئەم زانیارییانەی لە بەردەستدا نییە، لە بەرامبەردا بازاڕ لە بەردەستیدایە. بازاڕ هەموو ئەو زانیارییە پەشۆکێنەرانەی



لەناوخۆیدا هەیە کەهیچ ئۆرگان یان هیچ کۆمەڵێك لە بەرنامەدارێژان ناتوانن بە دەست بێنن. لە لایەکەوە بازاڕی ڕکابەری بەشێوەیەکی دۆزینەوەیی کاردەکات. ڕاستی بازاڕی ئازاد ئەوەیە کە تیایدا داتاکان (زانیارییەکان) دیارنین و پێویستە بدۆزرێنەوە. هەڵوەشاندنەوەی بازاڕی ئازاد و شوێنگرتنەوەی بە بەرنامەدانانی چەقبەستوو وەکو هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی خۆرسك وایە و لە ڕاستیدا شێتییەکی ئابوورییە.

یەکێك لە میکانیزمەکانی بازاڕ بریتییە لە چەمکی ((بەریەککەوتنەوەی نیگەتیڤ)) کە بەشێوەیەکی زیان و تێشکانی هەندێك لە تاك و دامەزراوەکان بە دیاردەکەوێت. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە زیان و شکستیانە کە بە بەریەککەوتنەوەی نێگەتیڤ ناودەبرێت ڕۆڵی پۆزەتیڤیان هەیە. بۆیە هەنگاونان لە پێگەی بەرنامەرێژی و ڕێکخستنەوە بۆ ڕێگرتن لەم جۆرە زیان و شکستیانەی لە ئابووریدا ڕۆڵێکی زیانبەخشی هەیە.

## ئازادی و موڵکداری تایبەتی

لە دووروەوە موڵکداری تایبەتی شیاوی گرنگپێدانە. یەکەم لە ڕووی ئەو پێگەیەی کە هەیەتی لە سیستەمی خۆڕسك و لەم ڕێگەیەوە دەکرێت کە سەرچاوەکان بە باشترین شێوە تایبەت بکرێن و بڕیاردانی ناچەقبەستوو ڕۆڵی کاریگەری خۆی بخاتە ڕوو، دووەم لە ڕووی ئەو پێوەندییەی کە هەیە لە نێوان موڵکداری تایبەتی و ئازادی تاکدا. موڵکداری ئۆرگانێکی پێویستە بۆ دیاریکردنی چوارچێوەی ئازادی و سنووری تاك.

هایك کۆمەڵگای ئالۆزی نوێ کە بەشێوەیەکی خۆڕسك هاتووەتەکایەوە بە خاڵی جیاوازی کۆمەڵگاکانی پێشوو ((کۆمەڵگای گەورە)) یان ((کۆمەڵگای مەزن)) ناودەبات. گەشەکردنی ئۆرگانی موڵکداری تایبەتی لە هەلومەرجەکانی کامڵبوونی





کۆمەڵگای گەورە یان کۆمەڵگای نوێیە کە باسمانکرد پەیوەندییەکی زەروری هەیە لەگەڵ ئازادی تاکدا. لێرەدا ئەم پرسیارە سەرهەڵدەدات کە ئایا بە لەبەرچاوگرتنی پەیوەندی زەرووری ئازادی لەگەڵ موڵکداری تایبەتیدا دەتوانین بڵێین کە ئەو کەسانەی کە لە موڵك و سامان بێ بەشن لە ئازادیش بێ بەشن. وەڵامی هایك بۆ ئەو پرسیارە نەخێرە. ئەو دەڵێت کە پەرت و بڵاوبوونی موڵکداری تایبەتی بە جۆرێك کە هیچ کەس یان هیچ ئۆرگانێك ئەو توانایییەی نەبێت کە ئەوانیتر بۆ بژێوی خۆیان وابەستەبن بە چەند تاك و ئۆرگانێکی تایبەتەوە بەسە بۆ ئەم مەبەستە. وەها هەلومەرجێك (پەرت و بڵاوی بەرفراوانی موڵکداری) لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا هەیە لە کاتێکدا کە لە کۆمەڵگای سۆسیالیستیدا نەبووە.

## دادپەروەری دابەشکەرانە

هایك یەکێکە لە نەیارە سەرسەختەکانی داد پەروەری. ئەو پێیوایە کە وشەی دادپەروەری میراتی قۆناغەکانی یەکەمی مێژووی مرۆڤە، واتە ئەو قۆناغانەی کە ژیانی کۆمەڵایەتی لە چەند کۆمەڵەیەکی بچووکی مرۆیی پێکهاتبوون. ئەم کۆمەڵانە چەند مەبەستێکی هاوبەشیان هەبووە و هەربۆیەش هەستی پێکەوە بوونێکی بەهێز لە نێوانیاندا هەبووە. بەڵام لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا پرسەکە بە تەواوی گۆڕاوە. لەم کۆمەڵگایانەدا، کە هایك بە کۆمەڵگای گەورە ناویان دەبات، هەر تاکێك جگە لە گەڕان بە دوای مەبەستەکانی خۆیدا پەیوەستە بە هەوڵ و زانستەکانی ملیۆنەها تاکی ترەوە کە هەرگیز نایانناسێت و ئەوانیش ئەم ناناسن. ناتوانین لەوەها کۆمەڵگایەکدا خوزیاری دادپەروەری بین بێ ئەوەی کە داوایی گیانی پاوانخوازی بکەین لە جۆرە ستالینی فاشیزمییەکەیدا. بۆیە خەونی



دادپەروەری کۆمەڵایەتی و دادپەروەری دابەشکردن تەنها خەیاڵێکی مەحاڵ نییە، بەڵکو حەز و ویستێکی مەترسیداریشە.

سەرەڕای ئەمەش هایك بە پێچەوانەی لایەنگرە توندڕەوەکانی ئابووری ئازادی هاوشێوەی کەسانێکی وەك ئۆکشات و نازیك، بڕوای وایە کە دەبێت بەلای کەمەوە کەمترین داهات بۆ بێ بەختترین کەسانی سیستەمی خۆڕسك لەبەرچاو بگیرێت. بەڵام دەڵێت کە ئەم کارە هیچ پەیوەندییەکی نییە بە چەمکی دادپەروەرییەوە.

## چەند ئاماژەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی تیۆرەکەی هایك

بەهۆی رووخانی یەکێتی سۆڤیەتەوە، کە بەشی سەرەکی ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ ناکامییە ئابوورییەکانی ئەم سیستەمە، بۆچوونەکانی هایك سەبارەت بە ناکارایی ئابوورییە چەقبەستوو بەرنامەدارەکان بەهێزتر بوو.

بەڵام رەخنەگەران دەڵێن بە پێچەوانەی بانگەشەکان هایك ناتوانین ئەم رووداوە وەکو پشتگیری تەماشا بکەین بۆ بانگەشەکانی لیبرالیزمی کلاسیك و تیۆرەکانی ئابووری کلاسیك. ئەمانە تەنها ناکارایی ئابووری بەرنامە بۆ دارێژرا و دەسەلمێنن و هیچی تر.

بەڵام رەخنەی گرنگتر پەیوەستە بە تەوەری تیۆرەکەی هایکەوە، واتە سیستەمی خۆڕسك و لەوانەش خۆڕسکبوونی بازاڕەکانی سەرمایەداری. یەکێك لە شرۆڤەکاری کە ناوی کارك پولانییە بەپشتبەستن بە واتاتێروتە سەلەکان پیشانیداوە کە بازاڕە ئازادەکان دیاردەگەلێکی خۆڕسك نین[3]. ئەوان دروستکراوی دەسەڵاتی دەوڵەتن. یەکەمین دەوڵەتی سەرمایەداری بازاڕی ئازاد لە بریتانیاو بە حوکمی حکوومەتە بەهێز و ستەمکارە پەرلەمانییەکان دروستبوو. بۆ نموونە لە بریتانیادا لە





چوارچێوەی ڕووداوی مێژووی پەرژین کردندا مافی موڵکداری دروستکرا یان هەڵوەشایەوە.

هایك لەسەر ئەم شێوازە سیستەمە یاساییەکانی لە چاو سیستەمی یاسای عورفی ئینگلتەرا بە سیستەمگەلێکی خۆڕسك دەناسێنی. ئەمە لە کاتێکدایە کە دەوڵەتەکانیش ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە دروستبوونی ئەم سیستەمانەدا. بۆ نموونە لە تورکیادا کەمال ئەتاتورك وەکو ڕابەرێکی سیاسی لە بناغەوە سیستەمێکی سیاسی نوێی بنیاتنا. ئەم گەواهییانە زیانێکی گەورە بە تیۆرەکەی هایك دەگەیەنن.

**یادداشتەکان:**


١- حسین بشیریە، تاریخ اندیشە سیاسی درقرن بیستم، جلد ٢، تهران، نشرنی، چاپ چهارم ١٣٨٢. ص ٨١.

٢- جان گری، اندیشە سیاسی فون هایك، ترجمە خشایار دیهیمی، تهران، طرح نو، ١٣٧٩. ص ٥٢-٥٣.

٣- مایکل لسناف، فیلسوفان سیاسی قرن بیستم، ترجمە خشایاردیهیمی، تهران، نشرکوچك، ١٣٧٨، ص ٢٤٦.

4- Karl polany; The Great Transformation: The political and Economic Origins of our time, Bostom, Eacon press, 1957.




## پاژی حەوتەم

## ((لیبرال دیموکراسی))

**ئاماژە:**

لەبەر ئەوەی لیبرال دیموکراسی لە بەشێکی سەرەکی بنەما تیۆرییەکانی خۆیدا پێوەندییەکی هەمەلایەنەی لەگەڵ نەریتی گەورەی لیبرالیزمدا هەیە هەر بۆیە ئێمە لێرەدا پاژێکی تایبەتمان بۆ تەرخان کردووە و لەو بارەیەوە تیۆری سیاسی هەندێك لە هزرڤانە مەزنەکانی سەدەی بیستەمان خستۆتەڕوو. ئەم کارەش بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر هەندێك لە ڕەهەندە تایبەتییەکانی ئەو ڕەوتەی کە بەناوی لیبرال دیموکراسی ناوبانگی دەرکردووە و هەروا بۆ جیاکردنەوەی ئەو بیرمەندانەیە کە وێڕای پەیوەست بوونیان بە بنەما هزرییەکانی لیبرالیزم لە سیاسەتە لیبرالییەکان، بەواتا کلاسیکەکەی دوور کەوتوونەتەوە و ناتوانین سیستەمە ئیدیالەکانی ئەوان بەواتای تەواوی وشەبە سیستەمی لیبرال ناوببەین. لەو بیرمەندانە دەتوانین ئاماژە بە کارل پۆپەر و جۆن ڕالز بکەین کە تیۆرەکانیان لە ژێر سەردێری لیبرال دیموکراسیدا خراونەتە ڕوو و ناسێندراون.





## واتای لیبرال دیموكراس

لیبرال دیموكراسی له پاڵ ركابەرەكەی خۆی سۆسیال دیموكراسی ئەمڕۆ بە سیستەمی سیاسی باو لە هەندێك لە وڵاتانی پێشكەوتوو دادەنرێت. ئێمە لە كاتی باسكردن لە هزری ماركسیستی هەندێك باسمان لەسەر سۆسیال دیموكراسی كردووە. لێرەدا دوا بەدوای پاژێك دەربارەی بنەما تیۆرییەكانی لیبرالیزم دەبێ چەمكی لیبرال دیموكراسیش بە كورتی وەك شێوازی زاڵی ژیانی سیاسی لە رۆژئاوادا بناسێنین.

لیبرال دیموكراسی هەروەك لە خودی زاراوەكە دیارە لە دوو وشەی لیبرال و دیموكراسی پێكهاتووە. پەیوەست بوونی ئەم دوو وشەیە ئاماژە بە سیستەمێك دەكات كە رەهەندێكی بریتییە لە لیبرالیزم و رەهەندەكەی تریشی بریتییە لە دیموكراسی. بۆ ئێمە كە لە رۆژهەڵاتدا دەژین رەنگە ئەگەر بە تەواوی ورد نەبینەوە ئەو دوو وشەیە یەك واتا یا واتایەكی نزیك لەیەك لە زەینماندا دروست بكەن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین كە ئەم دوو رەوتە هزریی و سیاسییە لە رۆژئاوا هەر یەك نەریت و مێژووی تایبەت بە خۆیان هەیە. ئەم دوو نەریتە وێڕای هاوبەش بوونیان لە هەندێ رەهەنددا (وەك جەختكردنەوە لەسەر ئازادییە سیاسییەكان، دەسەڵاتدارێتی خەڵك و دابەشكردنی دەسەڵاتی سیاسی) لە هەندێ رەهەندی دیكەدا (وەك جەختكردنەوە لەسەر یەكسانی، شێوازی تێگەیشتن لە دەسەڵاتدارێتی خەڵك و شێوازی بەشداری هاوڵاتیان لە كاروباری سیاسی) نەك تەنها لە یەكتر دووردەكەونەوە بەڵكو هەندێ جاریش رێك لە بەرامبەر یەكتردا رادوەستن. تەنها پێویستە ئاماژە بەوە بكەین كە تێگەیشتنێك لە دیموكراسی (كە لە رووی زانستی و ئەخلاقییەوە زۆریش بێ بنەما نییە) بۆ سیستەمی سۆسیالستی، ئەنجامەكەی بە رەتكردنەوەی پرەنسیپی موڵكداری تایبەتی كۆتایی پێدێت، لە كاتێكدا كە بناغەی دەوڵەتە لیبرالەكان لەسەر پاراستنی موڵكداری تایبەتی بنیاتنراوە.



## تێكەڵاوی لیبرالیزم و دیموكراسی

لیبرال دیموكراسی لە تێكەڵاو بوونی لیبرالیزم لەگەڵ دیموكراسی لە بواری كردار و لە بواری تیۆری و هاوئاراستە لەگەڵ زەرورەتە مێژووییەكاندا دروستبووە. هەندێك لە رەهەندە هزری و كردارییەكانی دیموكراسی لە یۆنانی كۆن و رۆمی كۆن و لە كۆتایی سەدەكانی ناوەڕاست لە كۆمارە ئۆتۆنۆمییەكانی ئیتالیادا هەبووە. دەتوانین هەندێك لە رەهەندەكانی دیموكراسی زیاتر لەمەش بەرەو پاشەوە ببەین و لە یەكەمین پێكهاتەكانی گرووپە سەرەتاییەكان (دیموكراسی سەرەتایی، تیرەیی، خێڵەكی) بەدوایدا بگەڕێین. بەڵام ئەم دیموكراسییانە، دیموكراسی لیبرال نەبوون. ئەم دیموكراسییانە بە شێوازی خۆیان لەگەڵ هەندێ دیاردەی وەك دابەشكردنی دەسەڵات، بەشداریكردنی لیبرالی خەڵك لە كاروباری گشتی و هەڵبژاردن ئاشنابوون بەڵام لەگەڵ بنەماكانی لیبرالیزمدا ئاشنانەبوون كە بە هزرێكی مۆدێرن لەقەڵەمدەدرێ.

لیبرالیزم دیاردەیەكی نوێیە. ئەم دیاردەیە هەم لەگەڵ سەرهەڵدانی سیستەمی ئابووری و كۆمەڵایەتی نوێ واتە سەرمایەداری، و هەم لەگەڵ گەشەكردنی چینە نوێیەكان، واتە چینی ناوەنجی، و هەم لەگەڵ وەرچەرخان لە بیروباوەڕی ئایینی و ئەخلاقی و سیاسی خەڵك (پرۆتستانیزم) لە چەرخی نوێ لە پێوەندیدایە. ئێمە لە پاژەكانی پێشوو باسمان لە لیبرالیزم و هەروا ئەو پرسانەش كردووە كە ئێستا ئاماژەمان پێكرد.

سیستەمە بنیاتنراوەكان لەسەر نەریتی لیبرالی و دەوڵەتە لیبرالەكان لەسەدی حەڤدەهەم لە ئەوروپا بە هێزبوون. ئەم سیستەمانە و دەوڵەتە پەیوەستەكانیان هاوڕێ لەگەڵ وەرچەرخانی مێژوو قۆناغ بە قۆناغ هەندێ رەهەندی دیموكراسییان





وەرگرت و سەرئەنجام لە تێکەڵبوونی ئەم دووانە ئەو شتە دروستبوو کە بە لیبرال دیموکراسی، یا دیموکراسی لیبرال ناودەبرێت.

ئەم تێکەڵاوبوونە لە گرنگترین رەهەندی خۆیدا هەردوو پرەنسیپی ئازادی (کە لە بنەڕەتدا پەیوەستە بە نەریتی لیبرالیزم) و پرەنسیپی یەکسانی (کە پتر پەیوەستە بە نەریتی دیموکراسی) لە خۆدەگرێت.

## پێوەندی مێژوویی لیبرالیزم و دیموکراسی

پرۆسەی بە لیبرالی بوون و ئینجا بە دیموکراتی بوون لە سەدەی حەڤدەم سەرەتا لە بواری کردەیی و هاوئاراستە لەگەڵ ئەویشدا لە بواری تیۆری سەرەتا لە ئینگلتەراوە دەستیپێکرد. پاش شۆڕشی ئەمەریکا، زنجیرە شۆڕشەکانی فەرەنسا و ئەوروپای رۆژئاوا، ئەم پرۆسەیە رەوتێکی خێرای بەخۆیەوە گرت[1]. بنەڕەتی ئەم رەوتە بریتیبوو لە تێکەڵاو بوونی ئازادییە لیبرالییەکان لەگەڵ پەرەسەندنی بەردەوامی مافی دەنگدان بە توێژ و گرووپە نوێیەکان. لیبرالیزم هەڵگری سێ ئازادی بوو، ئازادی حیزب و ئەنجومەن و کۆبوونەوە، ئازادییەکانی تاك، ئازادی بیروباوەڕ و ئاسانکاری ئایینی. دەوڵەتی لیبرال کە دەبوو هەلومەرجی گەشەکردن و پەرەسەندنی سەرمایەداری ئاسان بکات لە بەرامبەر چینە باڵا دەستەکانی پێشوودا پێویستی بەم ئازادییانە و دامەزراوە پەیوەستەکانی بوو، بەڵام کەڵك وەرگرتن لەم ئازادییانە سەرەتا تایبەت بوو بە هەندێ توێژی بچووکی کۆمەڵگا و کرێکارە رۆژمزەکان، ژنان و هەژاران لەم ئیمتیازانە بێبەش بوون. لە قۆناغەکانی دواتردا بە هاتنی گرووپی روو لە گەشەی چینی کرێکار بۆ گۆڕەپانی سیاسی و داخوازیی مافی دەنگدان و ئیمتیازەکانی سەرەوە لە لایەن ئەم چینەوە گوشارێکی روو لە زیاد بوون خرایە سەر دەوڵەتە لیبرالەکان و ئەم دەوڵەتانەش ناچار بوون لە بەرامبەر ئەم گوشار پەرەسەندووانەدا پاشەکشە بکەن و مافی دەنگدانی دیموکراتی و



لەوانەش مافی دەنگدانی گشتییان پەسەند کرد[2]. هەڵبەت مەبەست لە یەکسانی تەنها یەکسانی یاسایی یا رواڵەتی نەبوو کە لیبرالەکان بەرگرییان لێدەکرد بەڵکو یەکسانی ئیمکانیاتەکان بوو بۆ گەشەکردنی شایستەیی و توانا مرۆییەکان. ئەم چەمکە لە یەکسانی هەڵگری مافی یەکسانی تاکەکان بوو بۆ دەستەبەر کردنی ژیانێکی شایستەی مرۆیی بۆ هەموو رەنجدەران. بەم جۆرە لە چەمکی دیموکراسیدا یەکسانی لە مافی بەشداریکردن و یەکسانی لە دەستەبەرکردنی ئیمکانیات هەردووکیان رەچاو دەکران.

## بنەماکانی لیبرال دیوکراسی

لە هەموو تیۆرییەکانی لیبرال دیموکراسی بنەماکانی دیموکراسی نوێنەرایەتی، هەڵبژاردنی رێبەرانی سیاسی بەشێوەی دەزگایی، پشتگیری دەوڵەت لە ئازادییە مەدەنییەکان و ئازادییە سیاسییەکان، جیاکردنەوەی چوارچێوەی تایبەتی و چوارچێوەی گشتی و پارێزراوبوونی چوارچێوەی تایبەتی لە دەست تێوەردانی دەوڵەت، پلورالیزمی ئەخلاقی و سیاسی و تاکگەرایی نێگەتیڤ پەسندکران.

بەڵام لەم بنەمایانەدا کە تێپەڕین لە پاساو هێنانەوەی بنچینە ئەخلاقییەکانی لیبرالیزم و روونکردنەوەی مێژوو بۆ تێڕوانینی فەلسەفەی لیبرالیزم جیاوازی و فرەییەکی زۆر بەدی دەکرێت. ئەگەر بمانەوێ بۆ ئاسانتر بوونی تێگەیشتن لەم کێشانە بۆچوونە جۆراوجۆرەکان وەك جەمسەرەکانی دژبەیەك دەستەبەندی بکەین دەتوانین بڵێین لە لایەکەوە کەسانێك هەن کە پتر جەخت لەسەر لایەنە لیبرالییەکان دەکەنەوە و لە لایەکیترەوە کەسانێکی تر هەن کە پتر پێ لەسەر لایەنە دیموکراتییەکان دادەگرن، لە لایەکەوە کەسانێك هەن کە پشت بە ئازادییە نیگەتیڤەکان (لە رەهەندەکانی لیبرالیزم) دەبەستن و لە جەمسەری بەرامبەریشدا





کەسانێك هەن کە پشت بە ئازادیە پۆزەتیڤەکان (لە رەهەندەکانی دیموکراسی) دەبەستن[٣]، لە لایەکەوە بیرمەندانێك هەن کە باوەڕیان بە کامڵبوونی پاکبوونەوەی مرۆڤ و هاوڕێ لەگەڵ ئەویشدا چاکبوونی خەسڵەتەکانی مرۆڤ و سیستەمە پەیوەستەکانی هەیە، لە لایەکی تریشەوە کەسانێك هەن کە بەرامبەر بە چاکبوونی خەسڵەتەکانەی مرۆڤ رەشبینن و رێز لە ئامادەکاریی پشتگیرانە و لەوانەش پێویستی پاراستنی ئازادییەکانی تاك دەگرن، لە جەمسەرێك جەخت لەسەر دابەشکردنی هەرچی پتری دەسەڵات و لە جەمسەرێکی تر جەخت لەسەر سنووردارکردنی دەسەڵات دەکرێتەوە.

لە نێوان خودی لیبرالەکانیش جیاوازی بۆچوون هەیە لە تیۆری لیبرال دیموکراسیدا و لەم بارەیەوە لیبراڵە رادیکالەکان لە لیبراڵە میانڕەوەکان جیادەبنەوە. لیبراڵە رادیکاڵەکان زیاتر بۆچوونی دیموکراتیان هەیە. لە ناوەڕاستی ئەو چوارچێوەیەی کە سەرێکی لیبرالیزمە و سەرەکەی تری دیموکراتیزمە، دیموکراتە لیبرالەکان یا لیبراڵە دیموکراتەکان لێك نزیکترن. (جیاکردنەوەی ئەم هزرانە کە لە رووی بۆچوونی سیاسییەوە لێك نزیکن پشت بە فەلسەفە و خاڵی دەستپێکیانەوە دەبەستێ). بەم جۆرە لیبراڵە میانڕەوەکان و دیموکراتە نالیبرالەکان زیاترین مەودایان لەگەڵ یەکتردا هەیە.

## بنەما فەلسەفییەکانی لیبرال دیموکراسی

ئەو بنەما تیۆرییانەی کە بۆ پاساو هێنانەوەی لیبرال دیموکراسی بەکارهاتوون تائەو جێگایەی کە پێوەندی بە توخمی لیبرالی ئەم چەمکەوە هەیە بریتین لە فەلسەفەی سوودگەرایی، پرەنسیپی سوود باوەڕی و پرەنسیپی زیادکردنی سوود کە لە هزرەکانی بێنتهام و چاکسازی کراوەکەشی لە هزرەکانی جۆن ستوارت میل



لەبەرچاو گیراون و لە بەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا باسمان لێوەکردوون[٤]. رەگ و ریشەی دوورتریشی دەگەڕێتەوە بۆ هزری مافی سروشتی کە لەو بارەیەشەوە ئاماژەمان پێکرد. تیۆری دیموکراسی نوێنەرایەتی بە تایبەت باسکردنی لە تیۆری ستوارت میل بە یەکێك لە کۆڵەکە گرنگەکانی تیۆری لیبرال دیموکراسی دادەنرێت. ئەو شتەی کە لە یاسای سروشتیدا بۆ پاساو هێنانەوەی لیبرال دیموکراسی وەرگیراوە ئەوەیە کە مرۆڤ تەنها بە هۆی مرۆڤ بوونەوە هەندێ مافی هەیە کە نابێ پێشێلبکرێت. ئەم مافە سەروو سیاسییە (پێش سیاسی) واتە لە بنەڕەتدا بەر لەوەی کە مرۆڤ کۆمەڵگای سیاسی دابمەزرێنێت یابچێتە ناو کۆمەڵگای سیاسییەوە ئەم مافانەی هەبووە.

تێڕوانینی سوودگەراییش باس لەوە دەکات کە مرۆڤ لە جەوهەری خۆیدا بوونەوەرێکی عەقڵانییە و بە ئاراستەی شادی و خۆشی تاکەکەسی خۆی هەولدەدات.[٥] درێژی ئەم هزرە بەم جۆرە بەردەوام دەبێ کە خواستەکانی مرۆڤ بێ سنوورن بەڵام ئامرازەکانی بە دیهێنانی ئەم خواستانە سنووردران (پرەنسیپی دەگمەن). بۆ ئەوەی کە لە هەلومەرجی دەگمەنی سەرچاوەکاندا هەوڵی مرۆڤ بگاتە ئەو پەڕی خۆی باشترین ئامادەکاری بوونی بازاڕی ئازادو ئازادی ئابوورییە. بازاڕی ئازاد ئەو هەلە دەڕەخسێنێ کە تاکەکان لە هەوڵی خۆیان زیاترین بەهرەببەن. سیستەمی بازاڕ بە جۆرێك بەرهەمهێنان و دابەشکردنی کاڵاکان رێکدەخات کە هەموو سوودی لێدەبینن.

بناغەی تیۆری دیموکراتیزم (واتە بەشەکەیتری لیبرال دیموکراسی) لە شێوازی مۆدێرنیدا بە تیۆرییەکانی رۆسۆ داڕێژرا (کە لەگەڵ هزرەکانی ئەودا ئاشنا بووین). بەڵام دیموکراسی بەو جۆرەی کە رۆسۆ لە تیۆرەکەی خۆیدا پاساوی بۆ هێنابووەوە پتر بۆ یەکە سیاسییە بچووکەکانی وەك دەوڵەتشارەکانی یۆنانی کۆن یا کانتۆنەکانی سویسرا دەگونجا. لە ئەنجامدا ئەو وڵاتە گەورانەی کە ئەمڕۆ یەکە





سیاسییەکانی جیهانی ئێمە پێکدەهێنن بەکارهێنانی ئەم تیۆرییەیان بە دژوار زانی بە تایبەت کە سیستەمی سەرمایەداری لە بنەڕەتدا دیموکراسی ناڕاستەوخۆ یا دیموکراسی نوێنەرایەتی پتر لەگەڵ سروشتی خۆیدا بە گونجاو دەزانی[٦].

ئەو تیۆرییانەی کە بە جۆرێك لەگەڵ لیبرال دیموکراسیدا هاوئاراستە بوون لە بنەڕەتدا بۆ تیۆرییەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لۆك، سوودگەرایی ستوارت میل و دیکترینی خۆ-یاسادانەریی کانت دەگەڕێتەوە. ئێمە لە باسکردنی تیۆرییە لیبرالییەکاندا باسمان لە هەندێ سەرچاوەی هزری نوێ کردووە کە بۆ گەنجینە تیۆرییەکان زیادکراون و داوا لە خوێنەران دەکەین بۆ بە دەستهێنانی زانیاری پتر لەسەر بنیاتە تیۆرییەکانی لیبرالیزم بۆی بگەڕێنەوە. دۆزینەوەکانی جۆن ڕاڵز لە بەردەوامی و چاکسازیکردن لە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی گرنگترین دەستکەوتی تیۆرییە لە پاڵنانی لیبرالیزم بەرەو لیبرال دیموکراسی. هەورەك لە داهاتوودا دەبینین ڕاڵز تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی کلاسیکی بە شێوازێکی نوێ بۆ پاساو هێنانەوەی لیبرال دیموکراسی بەکاردەهێنێ. هزرەکانی کانتیش لە لایەن تیۆرداڕێژە نوێیەکانەوە بۆ بوارە تازەکان فراوان کراوە و گەشەی پێدراوە[٧]. لەوانەش فراوانکردنی تیۆری خود-ڕێسایی کانت و ڕێزگرتن لە شکۆمەندی یەکسانی مرۆڤەکان کە یارمەتی نەهێشتنی ئەو کەموکوڕیانە دەدات کە لە تیۆری میلدا (بەهۆی بێ توانا بوونی پاساو هێنانەوە بۆ گونجاو بوونی دیموکراسی) هەیە. (هەروەك لە هەڵسەنگاندنی تیۆری سوودگەراییدا گوتمان لە ڕوانگەی لۆژیکییەوە پرەنسیپی زیاتر کردنی سوود نابێتە هۆی دروستبوونی حکوومەتی دیموکراسی).



**لیبرال دیموکراسی و هاوسەنگی لە نێوان ئازادی و یەکسانیدا**

لیبرالیزم و دیموکراسی هەردووکیان بە دوو هزر دەربارەی دەسەڵاتی دەوڵەت دادەنرێن. لیبرالیزم جەخت لەسەر سنوورداربوونی دەسەڵاتی دەوڵەت و دیموکراسی جەخت لەسەر دابەشکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکاتەوە. ئەم بنەما لیبرالییە کە دەڵێ دەوڵەت دەبێ کاری خۆی بۆ لانی کەمی پێویستییەکانی کەمبکاتەوە بۆ دیموکراتییە کۆنەکان بێواتا بوو. بەد گومانی بەرامبەر بەدەسەڵاتی دەوڵەت و حکوومەتی خەڵك لەگەڵ هزری لیبرالی لە پێوەندیدایە. پرسی پێوەندی چەمکەکانی ئازادی و یەکسانی لەگەڵ هەردوو چەمکی دیموکراسی ڕواڵەتی و دیموکراسی ناوەڕۆکی لە پێوەندیدایە. دیموکراسی لە چەمکە ڕواڵەتییەکەیدا، کە بە چەمکی یاسایی دیموکراتیش ناو دەبرێت، بریتییە لە زنجیرەیەك ڕێسا دەربارەی حکوومەت لە لایەن خەڵکەوە. بەڵام دیموکراسی لە چەمکی ناوەڕۆکی خۆیدا جەخت لەسەر یەکسانی کۆمەڵایەتی دەکاتەوە. ئەم چەمکە لە دیموکراسی لەگەڵ ئامانجی حکوومەت بۆ خەڵك لە پێوەندیدایە. دیموکراسی لە چەمکی کلاسیکدا ئەم هەردوو بەشە دەگرێتەوەو هەر بۆیە لە ئەنجامدا دەگوترا کە دیموکراسی بریتییە لە حکوومەتی خەڵك بە دەستی خەڵك و بۆ خەڵك.

ئەم دوو چەمکە لە دیموکراسی واتە چەمکی ڕواڵەتی و یاسایی لە دیموکراسی لە لایەکەوە و چەمکی ناوەڕۆکی لە لایەکی ترەوە، بابەتی گەلێك مشتومڕبووە. بۆچوونە لیبرالییەکان پتر سەرنج دەدەنە سەر چەمکی یەکەم و بۆچوونە دیموکراتییەکان پتر سەرنج دەدەنە سەر چەمکی دووهەم. لیبرالەکان بە هۆی پشتبەستن بە تاکگەرایی پتر سەرنجی خۆیان دەدەنەسەر سەربەخۆیی تاك و کامڵبوونی کەسایەتی تاك و بەپشتبەستن بەم بەهایانە نایەکسانی بێ ڕێسا لە هەژاریی سامان بەشتێکی سووك لەقەڵەمدەدەن. لە بەرامبەر ئەواندا یەکسانخوازەکان هەن کە سەرنج دەدەنە سەر یەکسانی هەل و ئیمکانیات بۆ هەمووان، تەنانەت ئەگەر ئەم کارەش بە بەهای سنووردار بوونی هەندێ لە ئازادییەکانی تاکیش تەواوبێت.

لە سەردەمی ئێمەدا لیبرالەکان و دیموکراتەکان هەردووکیان لەسەریەك پرەنسیپ ڕێککەوتوون کە تێکەڵاوێکە لە هەردوو بەهای ئازادی و یەکسانی، ئەویش پرەنسیپی یەکسانییە لە ئازادی. پرەنسیپی یەکسانی لە ئازادی بەو واتایە کە هەر کەسێك دەبێ تا ئەو جێگایە ئازادبێت کە زیان بە ئازادی کەسانی تر نەگەیەنێت. بەڵام جیاوازییەکان لەسەر راڤەکردنی ئەم پرەنسیپە هەر بەردەوامە.

بەم حاڵەش لە لیبرال دیموکراسی دا ئەم بنەمایە پەسندکراوە کە یەکسانی دیموکراتی پێویستی بەوەیە کە ئاستێك لە یەکسانی ئابووری بەدیبێت. لیبرالەکانیش بەرەبەرە ئەم بنەمایە و لەوانەش هەلومەرجی ئابووری یەکسانی هەلەکانیان پەسندکرد. بەم جۆرە پرەنسیپی یەکسانی هەلەکان بۆ پرەنسیپی یەکسانی یاسایی (یاروالەتی) زیادکرا. هەر بۆیە دوو بەشی لیبرالی و دیموکراتی بەشێوەیەکی بەرامبەر تەواوکەری یەکترن. لیبرال دیموکراسی بۆ پاسەوانی لە مافە بنەڕەتییەکانی تاك شێوازە دیموکراتییەکانی پەسەندکردووە. لە بەرامبەریشدا لەم لاوە دیموکراتەکان بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامە دیموکراتییەکان لە بنەماکانی خۆیاندا پاراستنی مافەکانی تاکیان ڕەچاو کردووە. ئەم چاکسازییانە بوونە هۆی ئەوەی کە لیبرال دیموکراسی لە تەسك بینییەکانی لیبرالی و توندڕەوییەکانی دیموکراتی پارێزراو بێت، سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا تا جێبەجێکردنی ئیدیالی ئەم دوو بنەمایە لە گۆڕەپانی کردار مەودایەکی زۆرماوە کە ئەمەش بۆ خۆی باسێکی ترە.





بەهەرحاڵ لیبرال دیموکراسی و لە راستیدا دیموکراسی مۆدێرن کە بە دیموکراسی دەستووریی ناودەبرێت لە رووی تیۆرییەوە تووشی دژە یەکبوونێکی لۆژیکی یا لانیکەم پارادۆکسێك هاتووە. لە راستیدا هەروەك گوتمان تێکەڵاوبوونی بنەماکانی لیبرالی لەگەڵ بنەماکانی دیموکراتیدا لە پرۆسەیەکی مێژوویی و بە هۆی پێویستییەکی کردەییەوە هاتۆتە ئاراوە. هەر بەم هۆیە لە لیبرال دیموکراسی تەنانەت بەشێوەیەکی گشتی تر لە دیموکراسی دەستووریی دوو بنەمای دژ بەیەك لەگەڵ یەکتردا کۆبوونەتەوە. ئەم دوو بنەمایە برتیین لە ((حکوومەتی یاسا)) و ((دەسەڵاتدارێتی خەڵك)). بنەمای حکوومەتی یاسا کۆی هاوڵاتیان ناچاردەکات کە لە یاسادانەریی و دامەزراوە سازیی خۆیاندا ئەو چوار چێوە دیاریکراوە لە بەرچاوبگرن کە لە پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤدا هاتوون و تێیدا مافی بنەڕەتی هاووڵاتیان پێناسەکراوە. لەو لاشەوە بنەمای دەسەڵاتدارێتی خەڵك ڕێگای ئەوەیان پێدەدات. هەر شتێك کە خەڵك دەیانەوێت (بەبێ هیچ تێبینییەکی پێشوەتر) ببێتە یاسا، بەم جۆرە بە ڕەچاوکردنی ئەم دوو پرەنسیپە لە راستیدا پشت بە دوو سەرچاوەی ڕەوایی دەبەسترێت: یەکەم مافی مرۆڤ و یاسا و ئەویتر ویستی گشتی خەڵك. ئەم دووانەش لە بەرامبەردا یەکتر مەرجدار و سنووردار دەکەن.

هابرماس کە بۆ خۆی دەرگای باسێکی بەسەر ئەم پارادۆکسەدا کردۆتەوە[٨] هەوڵیداوە لە تیۆرداڕشتنێکدا ئەم پارادۆکسە نەهێڵێ و پاساو بۆ پێکەوە گونجان و تەنانەت پێویستی پێوەندی نێوانیان بهێنێتەوە [٩].

یادداشتەکان:


١- نوبرتو بوبیو، لیبرالیسم و دیموکراسی، ترجمە بابك گلستان، تهران، نشر چشمە، ١٣٧٦، ص ٦١.

٢- سی. بی. مکفرسون، جهان واقعی دموکراسی، ترجمە علی معنوی تهرانی، تهران، نشراگە، ١٣٧٩، ص ٨٤.

3- Frank Cunningham, Theories of Democracy, a critical Introduction, London, Rout Ledge, 2002, p 45.

٤- تاریخ اندیشە سیاسی درغرب، ازماکیاول تا مارکس، فصل ٥.

٥- سی. بی. مکفرسون، پیشین، ص ٨٩.

6- John Rowls, political Liberalism, Newyork, clumbia University press, 1996.

7- Will Kymlikav Liberlism, community and culture, oxford, Clarendon press, 1989.

8- Jürgen Habermas, constitutional Democracy, a paradoxical Union of contradictory principles, political Theory, Vol 29, No 6, December 2001, 766-781.

٩- یورگن هابرماس، اشاراتی دبارە مشروعیت از طرق حقوق بشر، در جهانی شدن و آنیدە دموکراسی، ترجمە کمال پولادی، تهران، نشر مرکز، ١٣٨٠.




## پاژی هەشتەم

# کارل پۆپەر
# تیۆری ئەندازیاری کۆمەڵایەتی پلە بە پلە

### ژیان و بەرهەمەکانی پۆپەر

کارل پۆپەر بە یەکێك لە گەورەترین فەیلەسووفەکانی سەدەی بیستەم لە بواری مەعریفەناسی و هزری سیاسیدا دادەنرێت. ئەو لە ساڵی ١٩٠٢ لە نەمسا لەدایکبوو و لە ساڵی ١٩٩٤ لە بریتانیا کۆچیکرد. لە بنەماڵەیەکی چینی ناوەندی و بەرەچەڵەك جووڵەکە لە دایکبوو. لە سەردەمی نەوجەوانیدا سوودی لە ئیمکانیاتی خوێندن و پێشکەوتن وەرگرت بەڵام پاش جەنگ وەکو گەلێك لە خەڵکی نەمسا تووشی هەژاریی بوو. لە قۆناغی خوێندکاریدا رووی کردە هزری چەپ و سەردەمێك خۆی بە مارکسیست لەقەڵەمدەدا. تەنانەت ماوەیەکیش هاوکاری حیزبی کۆمۆنیستی نەمسای کرد. بەڵام لە دەیەی ١٩٢٠دا لە مارکسیزم هەڵگەڕایەوە و تەنانەت لە یەکەمین نووسینەکانی خۆیدا رەخنەیەکی لەسەر مارکسیزمیش نووسی. لە زانکۆی ڤیەننا وەکو گوێگر لە گەلێك لەوانەکاندا ئامادەبوو و لە هەندێ بەشی وەك فیزیا، بیرکاری و دەروونناسی خەریکی خوێندنەوە بوو. ماوەیەکی کورتیش پێوەندی بە ئەندامانی ((بازنەی ڤیەننا))وە کرد، ئەو کەسانەی کە لە مەعریفەناسیدا ناویان لەگەڵ پۆزەتیڤیزمدا گرێدراوە. لە ساڵی ١٩٣٧دا بە هاتنە





سەرکاری نازییەکان رۆیشتە نیوزیلەندا و لە زانکۆ خەریکی وانەوتنەوە بوو. لەوێ چەندین ساڵی بە هەژاری و نەداری بردە سەر و لەسەر خوێندنەوەکانی خۆی بەردەوام بوو. هەر لەوێ کتێبەکانی هەژاریی مێژووگەرایی و کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی نووسی. ئینجا رۆیشت بۆ بریتانیا و لەوێ لەسەر وانەوتنەوە و خوێندنەکانی خۆی بەردەوام بوو.

گرنگترین کتێبەکانی پۆپەر بریتین لە (لۆژیکی دۆزینەوەی زانستی/١٩٣٤) کە دەروازەیەکی مێژوویی نوێیە لە فەلسەفەی زانستدا. کتێبی هەژاریی مێژووگەرایی یەکەمین نووسینی پۆپەرە. ئەم کتێبە وەڵامدانەوەیەکە بۆ کتێبی هەژاریی فەلسەفەی مارکس. کتێبی (کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی/١٩٤٩)[١] تێروتەسەلترین نووسینی پۆپەرە کە فەلسەفەی سیاسی ئەو لە خۆ دەگرێت. (گومانەکان و بەتاڵەکان)، (ناسینی راستینە و جیهانی کراوە: بەڵگەیەك بۆ پەسندکردنی نادیارگەرایی)[٢]، (ئەفسانەی چوار چێوە)[٣]، (سەرچاوەکانی زانایی و نەزانی)[٤]، (واقیعیەتگەرایی و ئامانجی زانست)[٥] لە بەرهەمەکانی دیکەی پۆپەرن.

### نەخشەی گشتی تیۆری سیاسی پۆپەر

رێگامان بدەن بەر لە سەیرکردنی هزری سیاسی پۆپەر سەرەتا وێنەیەکی گشتی لە تیۆری سیاسی ئەو بخەینە روو. هزری سیاسی پۆپەر وێڕای ئەوەی کە رەنگدانەوەی پرسەکان، نیگەرانییەکان، بۆچوونەکان و مشتومڕە سیاسییەکانی سەردەمی خۆیەتی (بەواتایەکی تر سەرانسەری سەدەی بیستەم) هەڵقوڵاوی تیۆرییەکانی ئەوە لە مەعریفەناسیدا کە ناسێنەری قوتابخانەیەکی نوێیە لە ناسیندا. دیارترین دیکترینەکانی پۆپەر لە مەعریفەناسیدا بریتین لە پرەنسیپی هەڵە پەسندی و عەقڵگەرایی رەخنەگرانە. جەوهەری تیۆری سیاسی پۆپەر لەم دیکترینە مەعریفەناسانەوە هەڵێنجراوە. پرەنسیپی هەڵە پەسندی بە پێگەی ئەزموون و هەڵە



و سووچ پەسندی مرۆڤ لە مەعریفەی کۆمەڵایەتی و تیۆری ئەندازیاری کۆمەڵایەتی بە نکۆڵی لێکردن لە تیۆرییەکانی پەیوەست بە بنیاتی گشتی کۆمەڵگا وەك تیۆری ئەفلاتوون، هیگڵ، مارکس کۆتایی پێ دێت. پۆپەر ئەم جۆرە تیۆرییە گشتگەرایانە دەداتە بەر رەخنە کە بانگەشەی دۆزینەوەی بنەمایەکی گشتی دەکەن بۆ پێکهاتەگەرایی سەرانسەری کۆمەڵگا. پۆپەر لە کتێبی هەژاری مێژووگەرایی بە تێروتەسەلی رەخنە لەم تیۆرییانە دەگرێ، لەوانەش تیۆرییەکانی هیگڵ و مارکس کە لە فەلسەفەی مێژووەوە هەڵقوڵاون. ئینجا لە کتێبی کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی ئەم رەخنەیە فراوانتردەکات و لە باتی تیۆری سەر لە نوێ سازکردنەوەی گشتی و سەرانسەری کۆمەڵگا تیۆری ئەندازیاری بەش بە بەش و پلە بە پلە دەخاتە ڕوو. بەپێی ئەم تیۆرییە هەوڵی ئێمە لە بری سەر لە نوێ سازکردنەوەی سەرانسەری کۆمەڵگا (کە لە راستیدا بەپێی ناوەڕۆکی مەعریفەی مرۆیی و دینامیکیەتی کۆمەڵگای مرۆیی مەیسەرنییە) دەبێ سەرنج بداتە سەر نەهێشتنی پلە بە پلە و بەش بەشی کەموکورتییەکانی کۆمەڵگا. پۆپەر بۆ سەر لە نوێ سازکردنەوەی کۆمەڵگا دوو بنەمای تێڕوانینی سوودخوازانەی نێگەتیڤ[٦] (سوودگەرایی نێگەتیڤ) و پشتیوانگەرایی دەخاتە روو. هەروەك چۆن تیۆری ئەندازیاری بەش بە بەش و پلە بە پلە لە بەرامبەر تیۆری سەر لە نوێ سازکردنەوەی سەرانسەری مارکسدا رادوەستێ تیۆری سوودگەرایی نێگەتیڤیش لە بەرامبەر تیۆری سوودگەرایی بێنتهامدا رادەوستێ. بەپێی پرەنسیپی بێنتهامی کاری دەوڵەت دابینکردنی زیاترین چاکەیە بۆ زیاترین ژمارەی هاوڵاتیان. پۆپەر لە جیاتی ئەم پرەنسیپە نەهێشتنی زیاترین خراپەی پێشگیرانە دەخاتە روو، پۆپەر بەپێی بنەمای پشتیوانگەرایی خۆی دەڵێ کە دەوڵەت لەسەریەتی کە پاسەوانی لە ئازادییەکانی تاك بکات و ئەمەش پێویستی بەوەیە کە پشتیوانی لەو توێژە هەژارانە بکرێت کە ئازادییان لەبەردەم هەڕەشەی جۆرا و جۆردایە.





# ١- بنەماكانی تیۆری سیاسی پۆپەر

## مەعریفەناسی پۆپەر

پۆپەر پتر لەوەی کە وەك تیۆردارێژێكی سیاسی بە ناوبانگ بێت بەهۆی خستنەرووی تیۆرییە نوێیەکانی و بنیاتنانی رەوتێكی نوێ لە مەعریفەناسیدا ناوبانگی دەرکردووە. هەروەك ئاماژەی پێکرا، فەلسەفەی سیاسی و تیۆری سیاسی پۆپەر، لەگەڵ فەلسەفەی ناسین یا مەعریفەناسی ئەودا پێوەندییەکی ئۆرگانیکی هەیە. مەعریفەناسی پۆپەر بەهۆی جیاکەرەوە سەرەکییەکەی بەناوی «عەقڵگەرایی رەخنەیی» ناوزەدکراوە. لێرەدا سەرەتا ئاماژە بە تایبەتمەندی سەرەکی مەعریفەناسی پۆپەر دەکەین، پاشان بە دوای ئەو رەوتە دادەچین تابە فەلسەفەی سیاسی ئەو کۆتایی پێدێت.

تیۆری مەعریفەی پۆپەر بەش بە حاڵی خۆی درێژە پێدەری تیۆری بوونناسی پۆپەرە کە ئاماژە بە ئەویش دەکەین. پۆپەر لە بوونناسیدا لەو باوەڕەدایە کە بوون لە راستیدا لە سێ جیهان پێکهاتووە. جیهانی یەکەم جیهانی سروشت یا جیهانی فیزیاییە. ئەم جیهانە بریتییە لە حاڵەتە فیزیاییەکان. جیهانی دووەم جیهانی زەینییە. ئەم جیهانە لەناو حاڵەتە زەینییەکانی مرۆڤدایە. سەرئەنجام جیهانی سێهەم جیهانی مەعقوولەکان یا هزرەکانە. تیۆرییەکان، بەڵگەهێنانەوەکان و پێوەندییە لۆژیکییەکان دروستکەری ئەم جیهانەن. ئەم سێ جیهانە وێڕای ئەوەی کە لەگەڵ یەکتر لە پێوەندیدان بەڵام ناتوانین هیچ یەکەیان تا ئاستی ئەویتریان نزم بکەینەوە. بۆ وێنە ژمارە سروشتییەکان سەر بە جیهانی هزرەکانن واتە جیهانی لە جۆری سێهەمن. بەڵام پێوەندی و راستییە بینراوەکانی ئەم ژمارانە چ هاتبنە ناو چوار چێوەی هۆشیاری ئێمەوە و چ نەهاتبن لە راستیدا هەن و بەشتێکی نەبوو لە قەڵەم نادرێن.



پۆپەر لە بواری هۆشیاری مرۆڤیشدا لەو باوەڕەدایە کە مرۆڤەکان بوونەوەرگەلێکی عەقڵانین و لە عەقڵانیەتێکی راستینە و هاوبەشدا بەشدارن، یادەتوانن بەشداربن. لە راستیدا بەم جۆرەیە کە باس و بەڵگەهێنانەوەی عەقڵانی و رێککەوتنی عەقڵانی مومکین دەبێ.

## هەڵە پەسندی لە مەعریفە

پۆپەر لە مەعریفەناسی شێوازی لێکۆڵینەوەدا بنەمایەکی نوێ دەهێنێتە ئاراوە کە بە بنەمای شیاوی بەتاڵکردنەوە بە ناوبانگە. پرەنسیپی شیاوی بەتاڵکردنەوە لە بەرامبەر پرەنسیپی شیاوی سەلماندن رادەوەستێ. پرەنسیپی شیاوی سەلماندن لە دیکترینە سەرەکییەکانی لایەنگرانی پۆزەتیڤیزمە کە لەسەردەمی پۆپەر لە بواری مەعریفەناسیدا دەسترۆیییەکی زۆری هەبوو و لەو بروایەدابوو بە پێی پرەنسیپی شیاوی سەلماندن بایەخ و بەهای تیۆرییەکی زانستی لەوەدایە کە شیاوی سەلماندن بێت. هەر بڕیار و فەرمانێکی زانستی دەبێ لە رووی ئەزموونی بە گەڕانەوە بۆ بەڵگەراستینەکان و لە رێگای پشکنینەوە (استقرا) شیاوی سەلماندن بێت. پۆپەر رەخنەی لەم پرەنسیپە گرت و لە بەرامبەریدا پرەنسیپی شیاوی بەتاڵکردنەوەی هێنایە ئاراوە. بەپێی ئەم پرەنسیپە بەهای هەر گریمانە یان بڕیارێکی زانستی بەوەوە بەستراوە کە شیاوی بەتاڵکردنەوەبێت.

پۆپەر بەو جۆرە بەڵگەی هێنایەوە کە پرەنسپی شیاوی سەلماندن کە بناغەی کاری پۆزیتیڤیزمە تووشی پارادۆکسێکی ناوخۆیی هاتووە. چونکە لە رووی لۆژیکییەوە ناتوانین بڕیارێکی زانستی و گشتی لە شتە لاوەکییەکان هەڵێنجنین. پۆپەر گوتی کە پرەنسیپی پشکنین بەهایەکی زانستی نییە. ئێوە ئەگەر دەیان هەزار کۆتر ببینن کە رەنگیان سپی بێت ناتوانن بگەنە ئەو ئەنجامەکە ((هەموو کۆترەکان سپین)) ئێوە ناتوانن هەموو کۆترەکان ببینن تابگەنە بڕیارێکی لەو جۆرە (کەکۆتر باڵندەیەکی





سپییه). به پێی بنەمای مەعریفەناسی پۆپەر هەموو یاسا زانستییەکان گریمانە گەلێکی نەسەلمێنراون. هەڵبەت ئێمە کۆمەڵێك یاسای گشتیمان هەیە کە کەڵکیان لێوەردەگرین بەڵام هیچ کاتێك ناتوانین بڵێین کە ئەمانە بە تەواوی راستن. پێشکەوتنی زانستی هەرگیز ناگاتە کۆتایی خۆی. شیاوی گوتنەکە پۆپەر تەنها باوەڕێ بە هەڵە پەسندی مەعریفەی ئێمەیە نەك رێژەگەرایی. ئەو لە هەمانکاتدا سەر بە گومانگەراکان نییە کە مەعریفە بەشتێکی نامەیسەر دەزانن.

## عەقڵگەرایی رەخنەگرانە

پرەنسیپی هەڵە پەسندی گرنگی رەخنەش لە خۆدەگرێت. لەم بارەیەوە تیۆری پۆپەر هەم لە رووی میتۆدۆلۆژی و هەم لە رووی بۆچوونە سیاسییەکانەوە لە بەرامبەر تیۆری میانڕەوەکان و لەوانەش ئۆکشات رادەوەستێ.

میانڕەوەکان و لەوانەش ئۆکشات لەو باوەڕەدان کە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، ئەخلاقیات و بیروباوەڕەکانی ئێمە بە زۆری بۆماوەیین. کاولکردنی هەموو شتێك و سەر لە نوێ دەست پێکردنەوەی هەمووشتێك هەم مەحاڵە و هەم کردەوەیەکی شێتانەیە و جگە لەسەر گەردانی هیچ ئەنجامێکی دیکەی بە دواوە نابێت. پۆپەر تەنها تاڕادەیەك لەگەڵ ئەم بۆ چوونەی میانڕەوەکان هاو دەنگە. ئەو دەڵێ کە ئێمە جگە لەم هەموو شتانە شتێکی دیکەشمان بە بۆماوەیی بۆ دەمێنێتەوەو ئەویش تێڕوانینێکی رەخنەگرانەیە بۆ بیروباوەڕە کلاسیکەکان. هەر نەوەیەك لە زانایان لە نەوەی پێش خۆیان بیر و باوەڕەکانیان بە میرات بۆ دەمێنێتەوە، بەڵام ئەوان ئەم تێڕوانینەشیان بە میرات بۆ دەمێنێتەوە کە دەبێ تیۆرییە بۆماوەییەکان بە رەخنەیەکی عەقڵانی هەڵبەسەنگێندرێت.



رەخنەی عەقڵانی لە تیۆری پۆپەردا تەنانەت پێگەیەکی لەمە زیاتریشی هەیە و لەراستیدا پێوەندی بە تیۆرییەکەی ئەوەوە هەیە دەربارەی هۆکارەکانی دینامیکییەتی شارستانیەت. پۆپەر لە کتێبی کۆمەڵگای کراوە ئەوە روون دەکاتەوە کە چۆن یۆنانییە کۆنەکان یەکەمین خەڵکانێك بوون کە بیروباروەڕ و دامەزراوە کلاسیکی و سەقامگیرەکانیان دایەبەر رەخنەی عەقڵانی و هەر ئەم رەخنەگرتنە عەقڵانییە لە نەریتەکان (بەو جۆرەی کە لەبەرگی یەکەمدا باسمانکرد) ئەو توانایییەی بەوان بەخشی کە لە چەرخی ناسینی بنیاتنراو لەسەر ئەفسانە بەرەو چەرخی ناسینی فەلسەفی و عەقڵانی تێپەڕبین.

## رەخنەگرتن لە هزری مێژووگەرایی

لەسەردەمی پۆپەر تێڕوانینی مێژووگەرایانە چ لە بۆچوونە چەپەکان و چ لە بۆچوونە راستەکاندا نفووزێکی زۆری هەبوو. مێژووگەرایی، بەو جۆرەی کە پۆپەر لێی تێدەگەیشت، تیۆرییەك بوو کە لەسەر ئەم هزرە بنیات نرابوو کە مێژوو خاوەن رەوتێکی یاسامەند و ئاراستەیەکی دیاریکراوە کە سەربەخۆیە لەویستی ئێمە[٧]. هیگڵ و مارکس لەو بیرمەندە دیارانەن کە ئەم هزرەیان پەروەردەکردووە. پۆپەر دەڵێ ئەم تێگەیشتنە لە مێژوو بووەتە هۆی خستەڕووی تیۆرییەکانی پێوەندیدار بە ئەندازیاری کۆمەڵایەتی گشتگەراو یۆتوپیاگەرا. ئەو دەڵێ کە هەوڵدان بۆ سەر لە نوێ دروستکردنەوەی سەرانسەری کۆمەڵگا هەروەك ئەزموونی سۆڤیەت پیشانی داوە دەبێتە هۆی دروستبوونی سیستەمگەلێکی پاوانخواز. (نازیزم) یش لە ئەڵمانیا بە جۆرێکی تر پێوەندی لەگەڵ گۆشەنیگای مێژووگەراییەوە هەبوو. بەم جۆرە مێژووگەرایی پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ پاوانخوازیدا هەیە.





## ٢- كۆمەڵگای كراوە و دوژمنەكانی

### كۆمەڵگای كراوە و كۆمەڵگای داخراو

جیاوازی و ڕووبەڕوو بوونەوەی كۆمەڵگای كراوە لەگەڵ كۆمەڵگای داخراو بە یەكێك لە بەشە سەرەكییەكانی فەلسەفەی سیاسی پۆپەر دادەنرێت.

كۆمەڵگای كراوە كۆمەڵگایەكە هەم لە واقیع و مێژوودا هەیە و لە تیۆرییە سیاسیەكانیش و لەوانەش ئەو سیستەمانەی كە گەورەترین فەیلەسووفە سیاسیەكانی ڕۆژئاوادا وەك ئەفلاتوون، هیگڵ و ماركس باسیان لێوەكردووە. كۆمەڵگا خێڵەكییەكان كۆمەڵگایەكی داخراون. لەم كۆمەڵگایانەدا دامەزراوە كۆمەڵایەتی و كردارە كۆمەڵایەتییەكان ڕەقن و تارادەیەك سەقامگیرو یەكدەستن و پلە و پایەی تاك لە پێشدا دیاریكراوە. پۆپەر دەڵێ هۆیەكەی ئەوەیە كە جۆری بیركردنەوە لەم كۆمەڵگایانەدا بیركردنەوەیەكی جادوویيە نەك عەقڵانی. ئەو شتەی كە بەسەر ئەم كۆمەڵگایانەدا زاڵن تابۆكان كە بە زۆری سروشتێكی ئایینیان هەیە و نادرێتە بەر ڕەخنە. بەپێی ئەم جۆرە بیركردنەوەیە هەموو شتێك ملكەچی ویستی خوداوەندییە. مرۆڤ ئازادییەكی كەمی بۆ هەڵبژاردن هەیە.

یۆنانییە كۆنەكان یەكەمین كەسانێك بوون كە هەنگاوە سەرەتاییەكانیان هەڵگرت بۆ ڕەخنەگرتن لە كۆمەڵگای كلاسیكی و دەستیان دایە دروستكردنی كۆمەڵگایەكی كراوە. یۆنانییەكان بە ڕەخنە گرتنی عەقڵانی لە بیروباوەڕو دامەزراوە كلاسیكی و سەقامگرتووەكان دەستیان دایە دروستكردنی كۆمەڵگای كراوە. بزاڤەكەی ئەوان قووڵترین شۆڕش بوو لە مێژووی مرۆڤدا. ئەوان ڕێگایەكیان دەستپێكرد كە بە شارستانییەتی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا كۆتایی پێهات.



ئێمە لە بەرگی یەكەمدا وێڕای باسكردن لە تێپەڕبوون لە جیهانی ئەفسانەوە بۆ جیهانی فەلسەفە باسمان لەم وەرچەرخانە گەورەیە كردووە لە مێژووی هزری مرۆڤدا و لەكاتی ئاماژەكردن بە وەرچەرخانە كۆمەڵایەتی و سیاسییەكان لە دەوڵەتشارەكانی یۆنان و لەوانەش سروشتی بزاڤە دیموكراتییەكان باسمان لە هۆكارەكانی كردووە[8]. هەندێك لە تایبەتمەندییەكانی كۆمەڵگای كراوە بریتین لە پەرەسەندنی بێ وێنەی ئازادییەكان لە بوارە جۆراوجۆرەكان، ئازادی هزر و ئازادی تاك لە هەڵبژاردنی شێوەی ژیانی خۆی و پێوەندی تایبەتی و پیشەی خۆی. دانانی جیاوازی لە نێوان ڕاستی و بەها، هەڵبژاردنی ئەخلاقی بەبێ سەر مەشق وەرگرتن لە مۆدیلە سەقامگیرەكانی پێشوو لە تایبەتمەندییەكانی دیكەی كۆمەڵگای كراوەن. دیموكراسی، ئازادی یەكسانی لەگەڵ ڕۆحی كۆمەڵگای كراوەدا دەگونجێن.

### دوژمنەكانی كۆمەڵگای كراوە

سەرهەڵدانی فەلسەفە لە یۆنان لە ڕەنگدانەوە سەرەكییەكانی كۆمەڵگای كراوە بوو. دەست پێكردنی فەلسەفە لە ڕاستیدا كۆتایی پێهێنانی ئەفسانە بوو كە بۆ خۆی لە ڕاستیدا كتێبی ئاسمانی نەریت بوو. بەڵام سەرهەڵدانی فەلسەفە پرۆژەیەكی دژ بەیەك بوو چونكە لە لایەكەوە بەشێكی زادەی كۆمەڵگای كراوە بوو و لە لایەكی تریشەوە لە سیستەمی هزری یەكەمین و گەورەترین دروستكەری خۆی واتە ئەفلاتوون بووە گەورەترین دوژمنی كۆمەڵگای كراوە. ئەفلاتوون بە كتێبی كۆمار و بە تیۆری دەسەڵاتدارێتی فەیلەسووف-شاو كۆمەڵگا یۆتۆپیاییەكەی خۆی سیستەمێكی گشتگەراو پاوانخواز (تۆتالیتر)ی خستەڕوو. تێڕوانینە بنیاتنراوەكان لەسەر گشتگەرایی (واتە پێشنیار كردنی پرۆژەیەكی سەرانسەری بۆ سەر لە نوێ دروستكردنەوەی هەموو ڕەهەندە مەزنەكانی كۆمەڵگا) و پاوانخوازی (واتە

باوەڕمەندبوون بە ئەندازیاری هەموو ڕەهەندەکانی سیستەمی کۆمەڵگا لە لایەن دەوڵەتەوە) لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی هزری داخراو و پڕۆژەی کۆمەڵگای داخراون. پاش ئەفلاتوون هیگڵ بەرادەیەکی زیاتر و مارکس بەرادەیەکی کەمتر لە بەرگریکارانی کۆمەڵگای داخراو و دوژمنانی کۆمەڵگای کراوە بوون. بەرای پۆپەر ئەگەر چی فەلسەفەی هیگڵ بە قسە فەلسەفەی عەقڵ و ئازادییە بەڵام لە ڕاستیدا دوژمنی سەرسەختی عەقڵ و ئازادی و (هەڵبەتە بەبێ ئەوەی کە خۆی بیەوێت) ئیلهام بەخشی فاشیزم بووە. مارکسیش هەرچەندە خۆی بەرگریکاری کۆمەڵگای داخراو نەبوو و پڕۆژەیەکی تێروتەسەلی بۆ کۆمەڵگا سۆسیالیستیەکەی خۆی نەخستەڕوو بەڵام سیستەمی هزریی و شێوازی کاری لایەنگرانی دژ بە ئاراستەی کۆمەڵگای کراوە بوون. هەڵەی مارکس لەوەدا بوو کە وایدەزانی کۆمەڵگای سەرمایەداری بە ئاراستەی جەمسەربەندی و ناکۆکی حەتمی لە نێوان سەرمایەداران و کرێکاراندا دەڕوات. لە کاتێکدا کۆمەڵگای سەرمایەرداری وەك کۆمەڵگایەکی کراوە هەر چەندە گەلێك کەموکورتی تێدایە بەڵام بە گشتی نەرمییەکی زۆری لە خۆی پیشانداوە.



## ٣- ئەندازیاریی بەش بە بەش و پلە بە پلەی کۆمەڵگا

### ئەندازیاریی کۆمەڵگای کراوە

پۆپەر لە کتێبی کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی بە تێروتەسەلی تیۆرییەکانی پەیوەست بەسەر لە نوێ دروستکردنەوەی سەرانسەری و گشتی کۆمەڵگا دەداتە بەر ڕەخنە و لە جیاتی ئەو ئەندازیاریی پلە بە پلە و بەش بە بەشی کۆمەڵگا پێشنیار دەکات. هەروەك ئاماژەمان پێکرد تیۆری مەعریفەناسی ئەو و دوکترینە تایبەتەکانی وەك بنەمای هەڵە پەسندی لە ناسین و ئەزموون و هەڵە لە پێشکەوتنی زانستیدا بە پاڵپشتی تیۆری ئەم تێگەیشتنە دادەنرێت. پۆپەر لەگەڵ ڕەخنەی مارکس لە کۆمەڵگای سەرمایەداری و پێوەندی سیستەمی سەرمایەداری لەگەڵ نادادپەروەرییە جۆراوجۆرەکاندا بە تەواوەتی هاوڕایە. بەڵام ئەو ڕێگا چارەیە پەسندناکات کە مارکس بۆ ئەم ئازارە دایناوە. پۆپەر لە بری دروستکردنەوەی سەرانسەری، چاکسازی پلە بە پلەی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشنیار دەکات. لە ڕاستیدا بەرای ئەو تەنها چاکسازی پلە بە پلە و بەش بە بەش دەرفەتی ڕەخسانیان هەیە کە لەگەڵ ناسینی لاوەکی مرۆڤدا دەگونجێن و لەگەڵ ئەزموون و هەڵەدا هاوڕێن. دارشتن و سەر لەنوێ دروستکردنەوەی سەرانسەری لەگەڵ ئیمکانیاتی زەینی مرۆڤ لە ناکۆکی تەواو دایە. لە کاتێکدا کە چاکسازی بەش بە بەش و پلە بە پلە لەگەڵ تواناییە زەینی و کردەییەکانی مرۆڤدا یەکدەگرێتەوە.

هەردوو بنەمای پشتیوانگەرایی و سوودگەرایی نەرێی ئەو دوکترینانەن کە پڕۆژەکەی پۆپەر لەمەڕ ئەندازیاری پلە بە پلەی کۆمەڵگای سەرمایەداری دەخەنەڕوو. بنەمای پشتیوانگەرایی بۆ نەهێشتنی کەموکورتییەکانی ئابووری لیبرال بە هۆی ئەو زیانانەیە کە ئەم ئابوورییە بۆ ئازادی هەیەتی.





راستیەکەی ئەوەیە لەو سیستەمانەی کە لەسەر بنەمای لیبرالی بنیات نراون ئازادی سیاسی لەگەڵ ئازادکردنی ئابووری لە دژایەتیدا دەبن بەو واتایە کە سیاسەتی ئازادکردن کە تەوەرەی لیبرالیزمی کلاسیکە دەبێتە هۆی جەمسەر بەندی هەژاریی و دەوڵەمەندیی بەو رادەیەی کە هەژارەکان ناچاردەبن کە ئازادییەکانی خۆیان لە بەرامبەر ئیمتیازە ئابوورییەکاندا بفرۆشن. ئازادی بەربڵاو بۆ دژەکەی خۆی دەگۆڕێت. کاتێك کە ئازادی کۆت و بەندی نەبێت دەستی زۆربێژەکان ئاوەڵادەکات بۆ ئەوەی لاوازەکان دیل بکەن. لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا کۆمپانیا گەورە مۆنۆپۆلەکان لە رێکخراوێکی پەتی ئابووری دەردەچن و دەبنە رێکخراوگەلێکی نیوە سیاسی. ئینجا ئازادی دەبێتە ئامرازێك بۆ سنووردارکردنی ئازادی ئەوانیتر.

کەوابوو دەبێ ئازادی بپارێزرێت. هەروەك چۆن نابێت دەستی دەوڵەت بۆ دەستتێوەردانی ئابووری بەرادەیەکی زۆر بەکراوەیی بهێڵرێتەوە بەهەمان شێوەش دەبێ بەرگری لە ئازادی توێژە زیان لێکەوتووەکان بکرێت.

## سوودگەرایی وەك بناغەی ئەندازیاریی کۆمەڵگا

«سوودگەرای نێگەتیڤ» دوکترینی سەرەکی پۆپەرە لە ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی پلە بە پلەدا. ئەم دوکترینە لەگەڵ دوکترینی پشتیوانگەرایی لە پێوەندیدایە. چەمکی سوودگەرایی نێگەتیڤ لە بەرامبەر دوکترینی سوودگەرایی یا قازانجخوازی بێنتهامدا رادەوەستێ کە بە «سوودگەرایی پۆزەتیڤ» ناودەبرێت. بەپێی سوودگەرایی پۆزەتیڤ لە تیۆری بێنتهام کاری دەوڵەت دابینکردنی زیاترین سوود یا زیاترین شادمانییە بۆ زیاترین ژمارەی هاوڵاتیان. لە بەرامبەر ئەم پرەنسیپە بێنتهامییەدا، سوودگەرایی نێگەتیڤ ئەم رێبازە لەبەرچاو دەگرێ کە کاری



دەوڵەت نەك دابینکردنی زیاترین سوودە بۆ زیاترین ژمارەی هاوڵاتیان بەڵکو رێگەگرتنە لەو زیاترین ئازارەی کە دەکرێ لێی دوور بکەوینەوە. ئەم پرەنسیپەش چوارچێوەیەکی ئەوەندە کورتی نییە، بۆ وێنە دابینکردنی هەلومەرجی خوێندنی باڵا بۆ هەمووان دەتوانێ بەشێك بێت لە بەرنامەی رێگەگرتن لەو زیاترین ئازارەی کە دەکرێ لێی دوور بکەوینەوە.

پۆپەر هەروا دەست تێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری بۆ کۆنترۆڵکردنی سەرمایەداری بێ کۆت و بەند پەسنددەکات، بەڵام جەختدەکاتەوە کە ئەم دەست تێوەردانە نابێ لە ئاستێکدا و بە جۆرێك بێت کە ئازادی هەڵبژاردنی بەکارهێنەر لە بازاڕ یا رکابەری نێوان بەرهەمهێنەران بۆ راکێشانی کڕیار خەوشدار بکات.

## ناوەڕۆکی حکوومەتی ئیدیال لە کۆمەڵگای کراوە

لە سیاسەتیشدا وەك بواری زانست خستنەڕووی پرسیار بەشێوازێکی دروست بە بەشی سەرەکی پرسەکە دادەنرێت. دەربارەی حکوومەت و ناوەڕۆکەکەشی خستنەڕووی دروستی پرسیار بە پرسی سەرەکی دادەنرێت. پۆپەر بەو جۆرە بەڵگە دەهێنێتەوە کە هەتا ئێستا پرسیاری پێوەندیدار بە دەسەڵاتداریێتی و حکوومەت لە راستیدا بەشێوەیەکی خراپ خراوەتە روو و چونکە بە خراپی خراوەتە روو، وەڵامەکەشی بە خراپ هاتۆتەوە. تاکو ئێستا بیرمەندان، چ خاوەن بۆچوونی لیبرالی و دیموکراسی و چ هەر بۆ چوونێکی تر، پرسی دەسەڵاتداریێتی و حکوومەت بەم جۆرە دەخەنە روو کە دەسەڵاتدار کێیە؟ یا بە وتەیەکی تر دەسەڵاتی کۆتایی دەبێ بە دەستی چ کەسێکەوە بێت و سەرچاوەی کۆتایی دەسەڵاتداریێتی و دەسەڵاتی فەرمانڕەوا لە کوێیە. لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا هەندێك گوتوویانە کە دەسەڵاتداریێتی هی خودایە. گرووپێکی تر گوتوویانە بۆ عەقڵ دەگەڕێتەوە،





دەستەیەکی تر گوتوویانە بۆ خەڵك دەگەڕێتەوە، مارکس گوتوویەتی هی پرۆلیتاریایە. بەم جۆرە خوداوەند، نەتەوە، یاسا یا مێژوویان بە سەرچاوەی دەسەڵاتدارێتی زانیوە[٩] پۆپەر ئەم پرسیارانەی سەرەوە و لە ئەنجامدا وەڵامەکانیشی لە رەگوریشەوە بە نادروست دەزانێ. ئەم پرسیارە لەسەر بنەمای ئەم گریمانە نادروستە بنیات نراوە کە عەقڵانییەت موڵکی تاك یا تاکەکانە. لە کاتێکدا نابێ لەناو تاك یا تاکەکاندا بە دوایدا بگەڕێین. عەقڵانییەت بەرهەمی شێوازی باسکردنی رەخنەگرانەیە[١٠]. هەر بۆیە لە بری ئەوەی کە بپرسن چ کەسێك دەبێ فەرمانڕەوایی بکات دەبێ بپرسین چۆن دەبێ فەرمانڕەوایی بکرێت و چۆن دەبێ دەسەڵاتداریی بخرێتە ژێر سیستەمێکی چاودێرییەوە.

پۆپەر پاش خستنەڕووی ئەم سەرەتایانە لە راستیدا دیموکراسی وەك شێوازێکی حکومەت دەبینێ و بۆ کۆمەڵگای کراوە بە باشترین شێوازی بەڕێوەبردنی کاروباری لەقەڵەمدەدات. پێناسەی ئەو لە دیموکراسیش بریتییە لە شێوازێکی حکوومەت کە چوارچێوەیەکی دەزگایی شیاو دەستەبەر دەکات بۆ رەخنەگرتن لە دەسەڵاتداران، ئەنجامدانی چاکسازی و گۆڕینی حکوومەت بەشێوازێکی ئاشتیانە. هەر حکومەتێك هەر چەندە دەنگی زۆرینەشی لە پشتبێت دەبێ بەردەوام لەبەر رەخنە و چاودێریی هەمووواندا بێت.

## چەند ئاماژەیەک بۆ رەخنەگرتن لە هزری سیاسی پۆپەر

پۆپەر شێوازێکی نوێی لە تۆژینەوەی سیاسی و تیۆرییەکی پڕ مەغزای بۆ بەرگری لە دیموکراسی خستەڕوو، ئەو رەخنەیەکی توند و تیژی لە ئەندازیاری کۆمەڵایەتی یۆتۆپیایی گرت کە بەسەر بەشێکی گەورەی ئایدۆلۆژیا سیاسییەکانی سەدەی بیستەم هەر لە فاشیزمەوە بگرە هەتا بۆلشفیزم زاڵببوو. بەم حاڵەش لەم بوارەدا



هەندێ رەخنە لە تیۆری پۆپەر گیراوە کە خراپ نییە لێرەدا ئاماژەیەکیان بۆ بکەین.

١- پۆپەر سەرەڕای رەخنەیەکی تێروتەسەل لە ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی یۆتۆپیایی و باسێکی تێروتەسەل لە مەڕ رێگاکانی بەدیهاتنی ئەندازیاری کۆمەڵایەتی پلە بە پلە لە رەهەندەکانی بوونناسی باسێکی سەرنجراکێش لەمەڕ ناوەڕۆکی ژیانی مرۆڤ و چۆنیەتی سیستەم و پێکهاتەکەی ناخاتە روو. بە وتەیەکی تر، ئەو بیردۆزە سیاسییەکانی خۆی بە دیدگای جێگای پەسند لە بواری مرۆڤناسیدا پشتئەستور نەکردووە. بۆ وێنە خۆی لە قەرەی ئەم پرسیارانە نەداوە کە ژیانی مرۆڤ چۆن رێکدەخرێت، مرۆڤەکان چۆن سیستەمی دەسەڵاتی هاوبەشی خۆیان پێکدەهێنن، بە چ شێوەیەك کەسانێك دەتوانن بەسەر کەسانێکدا فەرمانڕەوایەتی بکەن و سەرئەنجام ئەوەی کە تاکەکان چۆن دەتوانن ببنە خاوەنی ئازادی لەناو ئەو سیستەمەی کە داخوازیی جۆرا و جۆریان لێدەکات.

٢- پۆپەر کە هێرشی کردۆتە سەر یۆتۆپیای ئەفلاتوون، هیگڵ، مارکس و ئەوانیتر خۆی لە ئەنجامدا عەقڵگەرایی کردووەتە یۆتۆپیایەکی نوێ. ئەو سیاسەت بە جۆرێك دەبینێ کە دەڵێ شێوازێکە لە چارەسەری عەقڵانی پرسەکە لە بواری مەعریفەدا. لە روانگەی ئەوەوە سیاسەتی عەقڵانی بریتییە لە ناسینی پرسەکان، پێناسەکردنیان بە وتەیەکی روون و رەخنەگرتن لە رێگا چارەکانیان. بەڵام لە واقیعی ژیاندا پرسە سیاسییەکان بەم جۆرە بەڕێوەناچن. بۆ وێنە ئایا دەتوانین بە پێی بەرژەوەندی و لێکدانەوەی عەقڵانی داوا لەو کرێکارانە بکەین کە خوازیاری بەرزکردنەوەی هەقدەستەکانیانن واز لەم داخوازییەی خۆیان بهێنن[١١].

٣- پۆپەر هەروەك چۆن فەلسەفەی زانستی بۆ تەکنیك و شێوازی پێشکەوتووی زانست گواستۆتەوە فەلسەفەی سیاسیشی بۆ ئاستی تەکنیکی ئەندازیاریی





کۆمەڵایەتی دابەزاندووە. کۆمەڵگا دەڵێی ماشینێکە کە دەبێ بەشێوازی ئەزموون و هەڵە لێی بکۆڵرێتەوە و بەش بە بەش چاك بکرێت. لە کاتێکدا کە پرسە سیاسییەکان لە رەهەندێکی مەزن و لەسەر ئاستی هەموو کۆمەڵگا سەرهەڵدەدەن و جیاکردنەوەی بەشەکان و چاککردنی بەش بە بەشی کارێکی دژوارە. هەر بۆ وێنە خودی پرەنسیپی کەمکردنەوەی ئەو ئازارانەی کە شیاوی خۆ لێ دوورخستنەوەن پێویستی بە کردارێکی بەربڵاو هەیە لەسەر ئاستی گشتیدا.



**یادداشتەکان**

١- جامعه بازو دشمنانش، ترجمه عزت الله فولادوند، تهران، انتشارات خوارزمی، جلد اول ١٣٦٤، جلد دوم ١٣٦٥، جلد سوم ١٣٦٦ و جلد چهارم ١٣٦٩.

٢- جهان باز، برهانی درتأیید نامعینگری، ترجمه احمد ارام، تهران، سروش، ١٣٧٥.

٣- اسطوره چهار چوب، ترجمه علی پایا، تهران، طرح نو، ١٣٧٩.

٤- سرچشمه های دانایی و نادانی، ترجمه عباس باقری، تهران، نشرنی، ١٣٧٩.

٥- واقعیگری و هدف علم، ترجمه احمد ارام، تهران، انتشارات سروش، ١٣٧٢.

٦- معادلهای فارسی و مفاهیمی کەدراین فصل آمدەاست از ترجمه های عزت الله فولادوند که مشخصات أنها در بالاآ مدەاست برگرفتەشده است.

(بۆ بەرامبەری فارسی و ئەو چەمکانەی کەلەم پاژەدا هاتووە سوود لە وەرگێڕانەکانی عیزەتوڵڵا فوولادوەند وەرگیراوە کە تایبەتمەندییەکانیان لەسەرەوە هاتووە).

٧- رجوع کنید به مجلد دوم این مجموعه (بگەڕێوە بۆ بەرگی دووهەمی ئەم کتێبە).

٨- جرمی شی یرمر، اندیشه سیاسی کارل پۆپەر، ترجمه عزت الله فولادوند، تهران، طرح نو، چاپ دوم، ١٣٧٨، ص ٥٦.

٩- تاریخ اندیشه سیاسی درغرب از سقراط تا ماکیاولی، فصل اول.

١٠- بیخو بارخ، متفکرین سیاسی معاصر، ترجمه منیر سادات مادرشاهی، تهران، نشر سفیر، ١٣٧٩، ص ٢٠٤.

١١- همان، ص ٢٢١.

## پاژی نۆیەم

## جۆن راڵز

### دادپەروەریی لیبرالی و سیستەمی لیبرال دیموکراسی

جۆن راڵز (١٩٢١-٢٠٠٣) بە یەکێك لە دیارترین تیۆردارێژانی سیاسی هاوچەرخ دادەنرێت. ئەو لە بالتیمۆر لە دایکبووە و سەرانسەری ژیانی خۆی بە وانە وتنەوە لە زانکۆ جۆراوجۆرەکانی ئەمەریکا بەسەر بردووە. راڵز لەسەرانسەری ئەم ماوەیەدا بە فەلسەفەوە خەریك بووە. کتێبە گرنگەکانی ئەو بریتین لە تیۆری دادپەروەری (١٩٧١) و لیبرالیزمی سیاسی (١٩٩٣). ناوەڕۆکی سەرەکی تیۆری راڵز لە ساڵی ١٩٥٨ لە وتارێکدا بەناوی (دادپەروەری وەك دادگەری) بڵاوکرایەوە. هەر لە کاتی بڵاوبوونەوەی ئەم وتارە تاکوو ئێستا تیۆری دادپەروەری راڵز یەکێك لەو تیۆرییانە بووەوە کە گەلێك مشتومڕی لەسەر کراوە و رەخنە و راڤەکردن و خوێندنەوەیەکی بەربڵاوی لەسەر کراوە.

ئێمە لەم کورتە باسەی خوارەوە هەوڵمانداوە وێنەیەکی هەر چەندە گشتی لە تیۆری سیاسی جۆن راڵز بە تایبەت لە پێوەندی لەگەڵ تیۆری دادپەروەری ئەودا بخەینەڕوو. هەر چەندە راڵز لە کتێبی گەورەی دووهەمی خۆیدا واتە لیبرالیزمی سیاسی هەندێ گۆڕان و چاکسازی لە تیۆرییەکەی خۆیدا کردووە بەو جۆرەی کە لە کتێبی تیۆری دادپەروەریدا هاتبوو، بەڵام چاوپۆشی لەو جیاوازییانە دەکەین کەلەم دوو کتێبەدا هاتووە و تیۆری راڵز وەك سیستەمێکی یەکپارچە دەناسین.





### سەر لە نوێ دروستکردنەوەی فەلسەفەی لیبرالی

هەرچەندە تیۆری راڵز لە ئەنجامدا لەگەڵ بنەماکانی بەرگری لە لیبرال دیموکراسی هاوئاراستەیە بەڵام لە لایەکی ترەوە دەبێ ئەو بە یەکێك لە گەورەترین تیۆردارێژەرانی هاوچەرخ دابنێین کە گیانێکی تازەی کردە بەر جەستەی نەخۆشی لیبرالیزم. لیبرالیزم گەلێك خاڵی لاوازی بە تایبەت لەمەڕ تێگەیشتن لە بنیاتە کۆمەڵایەتییەکان هەبووە. تاکگەرایی رەها و ئازادی نێگەتیڤ لە تیۆرییەکانی لیبرالیزمی کلاسیك لە ئەنجامدا بە تیۆرییەکی نێگەتیڤ دەربارەی ئەخلاق کۆتایی پێ دێت و ئەمەش بە کەموکورتییەکی گەورە لەقەڵەمدەدرێت. تیۆری راڵز بەسەر ئەم کەموکورتییە گەورەیە لە فەلسەفە و تیۆری لیبرالیدا زاڵبووە. راڵز دامەزراوەیەکی گەورە و یەکپارچەی فەلسەفی خستۆتە روو کە تێیدا هەندێ بەهای گەورەی وەك ئازادی، بەرامبەری، ئەخلاق و دادپەروەری لەگەڵ یەکتردا پێوەندییەکی ناوەکی و سیستماتیکیان هەیە. بەم جۆرە راڵز تیۆرییەکی پۆزەتیڤ بۆ ئەخلاقی لیبرالی دادەرێژێت.

### تیۆری دادەپەروەری

تیۆری دادپەروەری تەوەرەی سەرەکی تیۆری راڵز پێکدەهێنێ. ئەم تیۆرییە بە یەکێك لە دیارترین تیۆرییە سیاسییەکان، لە بواری فەلسەفەی ئەخلاق و سیاسەت لە سەدەی بیستەم دادەنرێت. تیۆری دادەپەروەری راڵز لە ریزی نوێترین تیۆرییەکانە لە بواری فەلسەفەی سیاسیدا و ئەم تیۆرییە کارەکەی ئەوی هێنایە ئاستی کاری کەسانێکی وەك هۆبز، رۆسۆ، کانت، هیگڵ، مارکس[1].

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمیش پێگەی راڵز لە فەلسەفەی سیاسی لە پاڵ کەسانێکی وەك هانا ئارنت، میشیل فۆکۆ و یورگن هابرماس دادەنرێت. راڵز لە

تیۆری دادپەروەریدا هەوڵیداوە بە تیڕوانینێکی گشتگەرایانە و بە پشتبەستن بە شێوەی تیۆردارِشتن وێڕای ئیلهام وەرگرتن لە شێوازی هۆبز و تێڕوانینی کانت وەڵامێك بۆ پرسی دادپەروەری و بناغە و پرەنسیپەکانی بدۆزێتەوە. راڵز پاش دۆزینەوەی ئەم وەڵامە بۆ گەلێك لە پرسە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی وەك یەکسانی، ئازادی، رەوایی سیاسی، دامەزراوە یاسایی و سیاسییەکان و جۆری حکومەتی ئیدیال بەشێوازی خۆی وەڵامگەلێکی گونجاو و جێی سەرنجی دۆزیوەتەوە. بەم جۆرە چەمکی دادپەروەری لە تیۆری راڵزدا چەمکێکی رێکخەرە، بەو واتایە کە هەموو پێگە، واتاو تایبەتمەندی خۆیان بەدەستدەهێنن، هەر بۆیە راڵز دادپەروەری بە تەوەری سەرەکی تیۆرییە فەلسەفییەکەی خۆی دادەنێت و بە بەرزترین فەزیلەتی کۆمەڵگای سیاسی لەقەڵەمدەدات. لە باسەکانی خوارەوەدا سەرەکیترین بەشەکانی ئەم تیۆرییە دەناسێنین.

### رەوشی سەرەتایی

راڵز لە دوا دەیەکانی سەدەی بیستەمدا دوو نەریتی گەورەی فەلسەفەی سیاسی زیندووکردووە کە ماوەیەك بوو لە بیرکرابوون. یەکێك لەم نەریتانە بۆ فەلسەفەی ئەخلاق دەگەرێتەوە کە لە سوکراتەوە تا کانت رێڕەوێکی هەوراز ئاسای پێوابوو. ئەویتر لەگەڵ نەریتی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە پێوەندیدا بوو کە بەکاری مەزنی هۆبز دەستپێکرد بوو و لە کارەکانی لۆك و رۆسۆدا بەردەوامبوو. راڵز بنەمای کارەکەی خۆی لەسەر ئەم دوو نەریتە هزرییە بنیات دەنێت و وێڕای ئەمەش لە لایەکی ترەوە ئەم نەریتانەش دەژێنێتەوە.

ئێمە لەگەڵ شێوازی شیکاریی لایەنگرانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە تیۆردارِشتندا ئاشنابووین[٢]. هەروەك بینیمان، هۆبز، کۆمەڵگای سیاسی، دامەزراوە



سیاسییەکان و سیستەمی سیاسی بە دەستپێکردن لە بنەما سەلمێنراو و بنچینەییەکان وەك ئارەزووی پاراستنی گیان یا مافی پاراستنی گیان بەشێوازێکی شیکاریی راڤەکرد بوو. هۆبز سەرەتا رەوشێکی سروشتی وەهای خستبووە بەرچاو کە تێیدا هەموو مرۆڤەکان ناچارن بۆ پاراستنی خۆیان ملکەچی جەنگی هەمووان دژ بە هەمووان بن. ئەم تاکانە کە بە دوای ئاسایشدا دەگەڕێن سەر ئەنجام بە پشتبەستن بە گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی و سپاردنی پاراستنی ئاسایش بە دەسەڵاتدارێکی رەها هەوڵی دروستکردنی کۆمەڵگای مەدەنی دەدەن.

راڵزیش پشت بەشێوازی شیکاریی هۆبز دەبەستێ. ئەویش رەوشێکی گریمانەیی لەبەرچاو دەگرێ کە هەورەك رەوشی سروشتی هۆبز دەتوانین بە رەوشی سەرەتایی ناوی لێ ببەین. رەوشی سەرەتایی هەروەك رەوشی سروشتی یەکەی بنچنەییە. بەڵام ئەم رەوشە جیاوازییەکی گرنگیشی لەگەڵ رەوشی سروشتیدا هەیە. جیاوازی گرنگی ئەوان لەمەدایە کە مرۆڤەکانی رەوشی سەرەتایی مرۆڤەکانی بەر لە شارستانیەت نین بەڵکو هەمان مرۆڤەکانی رەوشی شارستانیەتن. راڵز نایەوێ مرۆڤەکانی بەر لە شارستانییەت بکاتە بنەمای شیکردنەوەکەی خۆی.

بەرهەر حاڵ گریمانەی راڵز ئەمەیە کەلەم رەوشە سەرەتاییەدا تاکەکان دەیانەوێ وەك لایەنەکانی رێککەوتنێك بڕیار لەسەر بنەماکانی هەڵسوکەت و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای داهاتووی خۆیان بدەن. ئەم مرۆڤانە هێشتا نازانن لەو کۆمەڵگایەی کە دروستدەبێ خۆیان بە روونی چ بارودۆخێکیان هەیە، بۆ وێنە ئایا دەبنە کەسانی دارا و خاوەن سامان و سەرمایە یا دەبنە نەدار و کرێکارو هەژار. راڵز ئەم بێ ئاگاییە گریمانەییە بە پەردەی نەزانی یا داپۆشەری نەزانی ناودەبات.

## گەڕان بە دوای بنەماكانی دادپەروەریدا

هەروەك رالز دەڵێت كۆمەڵگای مرۆیی بە دوو تایبەتمەندی سەرەكی دیاری دەكرێت كە بریتین لە ناكۆكی قازانجەكان و هاوبەشی قازانجەكان. لە هەر كۆمەڵگایەكدا هەم ناكۆكی قازانجەكان هەیەو هەم هاوبەشی قازانجەكان. ناكۆكی قازانجەكان ئەو واتایە لە خۆدەگرێت كە هەر كەسێك دەیەوێت بە هاوكاریكردنی لەگەڵ ئەوانیتردا زیاترین پشك بەدەستبهێنێ و هاوبەشی قازانجەكان لەم راستییەوە سەرچاوە دەگرێت كە لە هەلومەرجی هاوكاری كۆمەڵایەتیدا هەمووان لە ژیانێكی باشتر كەڵك وەردەگرن. بۆ رێكخستنی بارودۆخی كۆمەڵگا دەبێ كۆمەڵێك رێساو بنەما رێك بخرێن كە بە سەرنجدان بە هەردوو پاڵنەری ناكۆكی و هاوكاری باشترین شێوازی دابەشكردنی سەرچاوەكان و سامانی بە دواوەبێت كە ئەم بنەمایانە بە بنەماكانی دادپەروەری كۆمەڵایەتی ناودەبەین.

لەم رەوشە گریمانەییە كە بەرەوشی سەرەتایی ناومان برد تاكەكان وەك لایەنەكانی رێككەوتن دەیانەوێت لەمەڕ بنەماكانی دادپەروەری و ئەوەی كە دادپەروەریی و نادادپەروەری چییە بگەنە رێككەوتن. چونكە ئەم بنەمایانە نەتەنها بنیاتەكانی ماف و ئەركن بەڵكو هەموو شتێك و لەوانەش هەلومەرجی ئابووری، كۆمەڵایەتی، هەل و ئیمتیازەكانیش (جیاوك) دەگرێتەوە و دەتوانین بڵێین كە بنەماكانی دادپەروەری كۆمەڵایەتی بەم جۆرەی كە باسكرا نەتەنها دادپەروەری بە چەمكە گشتییەكەی بەڵكو دادپەروەری سیاسیش دەگرێتەوە. بەم جۆرە ئەو بنەمایانەی كە مەبەستن پێكهاتە كۆمەڵایەتییەكانیش لە خۆدەگرن.

رالز بەم جۆرە لەسەر چیرۆكەكەی خۆی بەردەوام دەبێ: لایەنەكانی رێككەوتن لە ژێر پەردەی نەزانی (یا بێ ئاگای لە بارودۆخی روونی خۆی و ئەویتر) دەیانەوێت لەسەر بنەماكانی دادپەروەری رێك بكەون. رێككەوتنێكی لەم جۆرە بە ناچار



لەسەر بنەماكانی دادگەریی سەقامگیردەبێت. بنەماكانی دادگەری دەبێ قازانجە دژبەیەكەكانی مرۆڤە خۆپەرست و عەقڵانییەكان لەگەڵ یەكتردا ئاشت بكاتەوە. ئەم مرۆڤانە بەم جۆرەی كە باسیان لێوەكرا بە ناچار ئازاد و یەكسانیشن.

## یەكسانی و نایەكسانی لە بەرامبەر دادپەروەری سیاسیدا

كەوابوو ئێمە لە خاڵێكداین كە لایەنەكانی رێككەوتن (كە مرۆڤگەلێكی خۆپەرست، ژیر، یەكسان و ئازادن) دەیانەوێ دەربارەی بنەماكانی دادپەروەری بڕیار بدەن. دەبێ ئەم پرسیارە بكەین كە ئایا دەكرێ ئەوان لە كۆمەڵگای داهاتوودا هیچ جۆرە نایەكسانییەكی ماددی پەسند بكەن. وەڵامی لۆژیكی ئەوەیە كە ئەوان هیچ نایەكسانییەك لە بارودۆخی كۆمەڵایەتیدا پەسندناكەن مەگەر ئەوەی كە نایەكسانی قازانجێكی بۆ هەمووان بەدواوە بێت و تەنانەت بێبەشترین توێژەكانیش سوودی لێوەربگرن. لانەیەكانی رێككەوتن كە هێشتا لە بارودۆخی دیاری خۆیان بێ ئاگان (واتە لە ژێر پەردەی نەزانیدا بڕیار دەدەن) بەشێوەیەكی لۆژیكی ئەمە پەسند دەكەن كە ئەگەر هەندێك نایەكسانی ببێتە هۆی باشتربوونی رەوشی هەمووان ئەوا جێی پەسند یا بەوتەیەكی تر دادپەروەرانەیە.

رالز لێرەدا پرەنسیپێك بۆ رێكخستنی كۆمەڵگا هەڵدەهێنجێنێ: بەخششە بنەڕەتییە كۆمەڵایەتییەكان دەبێ بەشێوەیەكی یەكسان دابەش بكرێن مەگەر ئەوەی كە دابەشكردنی بە نایەكسانی بە قازانجی هەمووان بێت. بەوتەیەكی تر نایەكسانی تەنها و تەنها ئەو كاتە دادپەروەرییە كە بوونی قازانجی هەمووان بێت. لە راستیدا رالز لێرەدا دەگاتە ئیدیال بوونی ئابووری بازاڕ چونكە یەكسانی ئیدیالی و هەمەلایەنە دەبێتە هۆی ناكارابوونی ئابووری كە بە زیانی هەمووان و تەنانەت هەژارانیش تەواو دەبێت. رەنگە ئابووری بازاڕ نایەكسانی لە بەخششە





بنەڕەتییەکاندا دروستبکات بەڵام سامانی گشتی کۆمەڵگا بەرزدەکاتەوە و لە حاڵەتی لەبەر چاوگرتنی هەندێ تێبینی تر کە هەر ئێستا دەیڵێین بە قازانجی هەمووان تەواو دەبێت.

بەهەر حاڵ یەکسانی گشتی نەخوازراوە و نەمومکینە. تەنانەت ئەگەر بتوانین نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکانیش لەناو ببەین ناتوانین نایەکسانی سروشتی لە نێوان مرۆڤەکان لەناو ببەین.

کەوابوو لایەنەکانی رێککەوتن وەك بنەماکانی دادگەریی و دادپەروەری بە دوای چیرۆکی رێککەوتنەکانیاندا دەچن لە حاڵەتێکدا نایەکسانی پەسند دەکەن کە قازانجێکی گشتی بە دواوە بێت. بەڵام ئەوان ئەمەشیان لەبەرچاوە کە رەنگە خۆشیان بکەونە ریزی بەرنەکەوتووەکان کەوابوو دەبێ مەرجێکی سنووردار بۆ نایەکسانی لە دابەشکردنی سامان دیار بکرێت. چۆن ئەم سنوورە دیاری دەکەن؟ لێرەدا رالز بنەمایەکی تر لە بنەماکانی دادپەروەری سیاسی شێوازبەندی دەکات: دابەشکردنی بەخششە بنەڕەتییەکانی دەبێ بەجۆرێك بێت کە بەهرەمەندبوونی بەرنەکەوتووترین توێژەکان لە بەخششە بنەڕەتییە کۆمەڵایەتییەکان پتر بکات (بیگەیەنێتە بەرزترین ئاستی خۆی). ئاشکرایە کە ئەگەر پرەنسیپی سەرەوە لەگەڵ پێویستیەکانی ئابووری بازاڕدا بگونجێت ئەم پرەنسیپەی دواتر لەگەڵ تێبینیەکانی پەیوەست بە خۆشگوزەرانی گشتیدا هاوئاراستەیە.

## بنەماکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی

بەم جۆرە مرۆڤە و یەکسانەکان لە رەوشی سەرەتایی بەم شێوازەی سەرەوە بنەماکانی دادپەروەری دادەرێژن. رالز تائێرە بەم جۆرە بەڵگەی هێنانەوەتەوە کە لایەنەکانی رێککەوتن لەسەر بنەماگەلێك رێکدەکەون کە ئەو لە چوار چێوەی دوو بنەمای بنەڕەتی بەناوی بنەماکانی دادپەروەری سیاسی شێواز بەندییان دەکات.



دەتوانین ئەم بنەمایانە بەزمانێکی سادەتر بەشێوەی ئەم رێسایانەی خوارەوە بخەینەڕوو:

١- دەبێ پێویستیە سەرەتایی یا بنەڕەتییە مادییەکانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا دابین بکرێت.

٢- هەر تاکێك مافێکی یەکسانی هەیە بەرامبەر بە پرۆژەیەکی گونجاو لە ئازادییە بنەڕەتییەکان کە لەگەڵ پرۆژەیەکی هاوشێوە دەربارەی ئازادییەکان بۆ هەمووان سازگار بێت.

٣- هەلی دەست راگەیشتن بە بەهرەی سامانی کۆمەڵایەتی دەبی بە جۆرێك دابەشبکرێت کە هەلی بێ بەشترین توێژەکانی کۆمەڵگا بگەیەنێتە بەرزترین ئاستی خۆی.

٤- نایەکسانییە ئابوورییەکان دەبێ بە شێوازێك رێك بخرێن کە سامانی هەژارترین توێژەکانی کۆمەڵگا بگاتە بەرزترین ئاستی خۆی.

## لیبرال دیموکراسی و دەوڵەتی خۆشگوزەرانی

لێرە بەدواوە درێژەی بەڵگەهێنانەوەی رالز بە ئاسانی پێشبینیدەکرێت. لایەنەکانی رێککەوتن، دامەزراوە یاسایی و سیاسییەکانی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای ئەم پرەنسیپانە رێکدەخەن. رالز لە گرێبەستی کۆمەڵایەتییەوە گەیشتە چەمکی گشتی دادپەروەری و لە چەمکی گشتی دادپەروەرییەوە گەیشتە چەمکی تایبەت و سەرئەنجام گەیشتە لیبرال دیموکراسی. بنەماکانی دادپەروەری بەو شێوەی کە رالز لە سەرەوە شێوازبەندییان دەکات پێویستی بە هەندێك دامەزراوەی یاسایی و سیاسی گونجاو هەیە. ئەم دامەزراوانە لە چرترین شێوازی خۆیاندا لە سیستەمی لیبرال دیموکراسیدا رەنگ دەدەنەوە. ئەم سیستەمە لە رەهەندی ئابووری خۆیدا





تێکەڵاوێکە لە ئابووری بازاڕ و دەوڵەتی خۆشگوزەرانی. لەم سیستەمەدا بازاڕ بە تەنها ناتوانێ بە جۆرێك دابەشکردنی سامانی بە دواوە بێت کە دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەخوازێ. کەوابوو پێویستی بە دەوڵەتێکی ڕێکخەر و دابەشکەر واتە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی هەیە.

لە سیستەمی سیاسی بنیاتنراو لەسەر بنەماکانی دادپەروەری دەسەڵاتی یاسادانان لەسەر بنەمای مافی دەنگدانی گشتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە دەستەیەکی هەڵبژێردراو دەسپێرێت. هەموو هاوڵاتیان خاوەن مافی بەشداریکردنی یەکسانن. ئازادی سیاسی یەکسان بۆ هەمووان دابین کراوە. هەموو هاوڵاتیان هەموو زانیارییە پێویستەکانی پەیوەست بە پرسە سیاسییەکانیان لەبەر دەستدایە.

ڕالز لەو باوەڕەدایە کە دەبێ جیاوازییەکی سەرەکی دابنێین لە نێوان یاسای زاڵ بە سەر پێوەندییەکانی بازاڕو یاسای زاڵ بەسەر پێوەندییەکانی هاوڵاتیان لە سیستەمێکی سیاسیدا. کارامەیی بازاڕ لەوەدایە کە هەر کەسێك بەدوای قازانجەکانی خۆیەوە بێت. بەڵام ئەم بڕیارە (بەپێچەوانەی بۆچوونی لیبرال کلاسیکەکان) دەربارەی ژیانی سیاسی بە ڕاست دەرناچێ. کارامەیی ژیانی سیاسی بەوە بەستراوەتەوە کە تاك تاکی هاوڵاتیان و نوێنەرانیان لە دامەزراوەکاندا لە سەرووی قازانجی تەسك بینانەی کەسی و تایبەتی خۆیانەوەبن[٣].

بەپێی بنەماکانی دادپەروەری سیاسی دەوڵەت دەبێ بەشێوەیەکی دادگەرانە یەکسانی هەلەکان گەرەنتی بکات. بۆ ئەم مەبەستە دەوڵەت دەبێ هاوکات چوار کار ئەنجامبدات. ئەم چوار کارە بریتین لە بە تایبەتی کردن، سەقامگیری، گواستنەوە و دابەشکردن. بەتایبەتی کردن بریتییە لە ڕکابەری کردن لەسەر نرخەکان، سەقامگیری بریتییە لە بەدیهێنانی هەلومەرجی کارکردنی تەواو



هەڵبژاردنی ئازادانە کار. گواستنەوە بە واتای گەرەنتی کردنی لانیکەمی داهات و دابەشکردن بە واتای یەکسانی ڕێژەییە لە پشکی دابەشکراودا[٤].

## دادپەروەری نێودەوڵەتی

بەو جۆرەی کە باسکرا ڕالز تێڕوانینی شیکارانەی خۆی لە کۆمەڵگای نەتەوەییەوە بۆ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی فراواندەکات و هەر لەسەر ئەم شێوازەش بنەماکانی دادپەروەری نێودەوڵەتی هەڵدەهێنجێنێ. بەکارهێنانی تیۆری دادپەروەری بەواتای دادگەریی لە سیستەمی نێودەوڵەتیش پێویستی بە گریمانە کردنی ڕەوشێکی سەرەتایی هەیە کە تێیدا (لە بری تاکەکان) دەبێ نەتەوەکان لەسەر بنەماکانی دادپەروەری ڕێکبکەون. بەم جۆرە ئەوان لەسەر پرەنسیپی یەکسانی ڕێکدەکەون. بەڵام لەمەڕ پرەنسیپی جیاوازی و دروستکردنی هەلومەرج بۆ یەکسانی هەلەکان کاتێك کە دەوڵەتەکان یا نەتەوەکان دەبنە لایەنەکانی ڕێککەوتن ئەوا شیکار دەکەوێتە بەردەم ڕەوشێکی ئاڵۆز و پێی بەڵگەهێنانەوەکەی لەنگ دەبێ[٥].

هەندێك لە ڕەخنەگران گوتوویانە کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیشدا دەتوانین لە بری نەتەوەکان خەڵك بکەینە لایەنەکانی ڕێککەوتن کە لەم حاڵەتەدا دەگەینە جۆرە دیموکراسییەك لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کە دەتوانین بە دیموکراسی جیهانی ناو ببەین[٦].

## یادداشته‌کان

1- Stephen white, “Pluralism, Platitudes, and Paradoxes, Fifty years of western Political Thought” political theory Vol. 30, No. 4, Augst 2002, P. 472-481.

۲- از ماکیاولی تا مارکس، فصل ۲.

۳- مایکل لسناف، فیلسوفان سیاسی قرن بیستم، ترجمه خشایار دیهیمی، تهران، نشر کوچك، ۱۳۷۸، ص ۳۸٤.

٤- بیخوبارخ، متفکرین سیاسی معاصر، ترجمه منیر سادات مادرشاهی، تهران، نشر سفیر، ۱۳۷۹، ص ۲٤۸.

۵- حسین بشیریه، تاریخ اندیشه سیاسی در قرن بیستم، لیبرالیسم و محافظه کاری، تهران، نشرنی، چاپ چهارم، ۱۳۸۲، ص ۱۲۸.

6- Andrew Kuper, “Rawlsian Global Justice, Beyond The Law of people to a cosmopolitan law of person” political theory, Vol. 28, No. 5, October 2000, P. 640-647.

# پاژی دەیەم

# دیموکراسی بەشدارانە و دیموکراسی ڕاوێژیی

## ١- دیموکراسی بەشدارانە

### هەڵسەنگاندنی دیموکراسی لیبرال

دیموکراسی بەشدارانە لە خاڵی بەرامبەری دیموکراسی لیبرال (لیبرال دیموکراسی)دا رادەوستێ. لایەنگرانی دیموکراسی بەشدارانە یا بە وتەیەکی تر دیموکراتە بەشدارخوازەکان رەخنەی ئەوە لە لیبرال دیموکراسی دەگرن کە بۆ ئەوە دروستبووە کە ئەو پێکهاتە و پێوەندییانە دیزە بە دەرخوونە بکات کە لەسەر بنەمای ستەم بنیات نراون و ئەم پێکهاتانە لە قەڵەمڕەوی تایبەتی خۆیاندا بەرەڵلادەکات. لیبرال دیموکراسی سەر پۆش لەسەر رێساکانی بنیاتنراو لەسەر دوورخستنەوە و دەسەڵاتی چینایەتی، رەگەزیی، نەژادی و جیاکارییەکانی تردادەنێت. بەڵام بەم حاڵەش ئەمە گرنگترین رەخنەیە کە لە لیبرال دیموکراسی دەگیرێت. رەخنەی گرنگتر ئەوەیە کە دوورە لە بنەمای بەشداریکردنی خەڵك لە کاروباری خۆیاندا. بۆ وێنە بەپێی شێوازی لیبرال دیموکراسی بەشداریکردنی خەڵك و تەنانەت بانگەشەکردن بۆ سەربەخۆیی تاك وەك سەرەکیترین بەها شتێك نییە جگە لەوەی کە بەڕێوەرەسمێکی تایبەتی و بەشێوەیەکی خولەکی خەڵك بۆ بەردەم سندووقەکانی دەنگدان رابکێشن و دەنگێك لەو خەڵکە



وەربگرن کە هەر بە هۆی کرداری ئەم سیستەمەوە لە زانست و شارەزایی پێویست بۆ تێگەیشتن لە پرسە سیاسییەکان بێبەشکراوە.

شێوازێکی لەم جۆرە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵك بەرامبەر بە پرسە سیاسییەکان و کاروباری گشتی خۆیان بێ هەڵوێستبن. لایەنگرانی دیموکراسی بەشدارانە لەو باوەڕەدان کە بۆ تێکشکاندنی بازنەی بۆشی بێ هەڵوێستی خەڵك بەرامبەر بە پرسە سیاسییەکان و چارەنووسی سیاسی خۆیان و بۆ پێدانی واتایەکی راستەقینە بە رۆڵی بەشداریکردنی خەڵك دەبێ لە رێگای دەرفەتە بچووك و ناوچەییەکان وەك دەستە راوێژکارییە جۆراوجۆرەکان هەلومەرجی بەشداریکردنی راستەوخۆ و بەردەوامی خەڵك فەراهەمبکرێت.

### بەشداری چالاك لە جیاتی بەشداری شەرمنانە

دەستەواژەی ((دیموکراسی بەشدارانە)) Participatory Dimocracy لە دەیەی ١٩٦٠ دانرا بەڵام بنیاتە تیۆرییەکانی بە تێگەیشتنێکی دێرینتر لە دیموکراسی و لەوانەش بۆ تیۆری ژان ژاك رۆسۆ دەگەڕێتەوە. لەم دەیانەی دواییەدا ژمارەیەك لە تیۆرداڕێژەران بە رەخنەگرتن لە سیستەمی باوی لیبرال دیموکرات بەرەو نەریتی رۆسۆیی گەڕانەوە و بە فراوانکردن و سەر لە نوێ بووژاندنەوەی دوکترینەکانی رۆسۆ زنجیرەیەك تیۆریان دەربارەی شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای پەروەردەکرد کە بە ((دیموکراسی بەشدارانە)) ناوبانگی دەرکردووە.

دیموکراسی بەشدارانە کە لەلایەکەوە لە بەرامبەر خوێندنەوە جۆراوجۆرەکان لە لیبرال دیموکراسی و لە لایەکیترەوە لە بەرامبەر دیموکراسی پلورالی دا رادەوەستێ، بە تایبەت لەم رووەوە گرنگە کە دیموکراسی لیبرال سیاسەتی چالاك لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتداران و دیموکراسی پلورال لە قەڵەمڕەوی رێبەرانی گرووپە هاوقازانجەکاندا (بە جۆرێك کە دواتر





باسی لێوەدەکەین) سنووردار دەکات. دیموکراسی بەشدارانە بە پێچەوانەی ئەم دوو لێکدانەوەیە حکوومەت تەنها بە دەستەیەکی جێبەجێکار دەزانێ و سیاسەتی چالاك بە مافی هەموو خەڵکی لەقەڵەمدەدات.

لیبرال دیموکراسی بێ هەڵوێستی توێژە بەرفراوانەکانی خەڵکی لە بەرامبەر سیاسەتدا نە تەنها بە شتێکی نەخوازراو نازانێ بەڵکو پێشوازیشی لێدەکات (و تەنانەت بە پێویستی دەزانێ). بۆچوونە لیبرالەکان لە دیموکراسی لیبرال بەرەو ئەو ئاراستەیە دەڕوات کە چالاکەکانی بواری سیاسی بە کەسانی بەرجەستە، پسپۆڕ و خاوەن خوو و رەفتاری باش سنووردار بکرێن و جەماوەری خەڵك تەنها بۆ هەڵبژاردنی خولەکی لە گۆڕەپانی سیاسیدا ئامادەبن. لیبرالەکان ئامادەبوونی بەربڵاوی خەڵك بە تێکدەری بەڕێوەبردنی ((دروستی)) کاروبارەکان لێکدەدەنەوە.

بینژامین کنستان کە یەکێکە لە پێشڕەوانی لیبرالیزم لە سەدەی نۆزدەیەم بەم جۆرە رای خۆی دەردەبڕێ کە بەشداری بەردەوام و چالاك لە دەسەڵاتی بە کۆمەڵدا قازانجێکی بۆ حکوومەت نییە[١]. بەڵام دیموکراتەکان، رێك بە پێچەوانەی ئەوانەوە، زیاترکردنی ئامادەبوونی چالاکی هاوڵاتیان بە ئەرکێکی سەرەکی خۆیان و بە یەکێك لە بنەما بنەڕەتییەکانی دیموکراسی لەقەڵەمدەدەن.

## گەڕانەوە بۆ رۆسۆ

سەرچاوەی سەرەکی تیۆرییەکانی پەیوەست بە دیموکراسی بەشدارانە لە نووسینەکانی رۆسۆ، بە تایبەت کتێبی گرێبەستی کۆمەڵایەتییە کە لە بەرگی دووهەمدا باسمان لێوەکردووە[٢]. دوکترینە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی رۆسۆ لەوانەش ((ویستی گشتی))، ((دەسەڵاتدارێتی خەڵك))، ((خود-رێسایی))، ((ناچاربوون بە ئازادی)) سەرچاوەی ئیلهامی ئەم تیۆرداڕێژانەیە.



رۆسۆ لەو رووەوە رەخنە لە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی هوبز و لۆك دەگرێ کە بەو پێیە خەڵك ئۆتۆریتەیەکی دەسەڵاتدار دەخوڵقێنن و ملکەچی دەبن. بە بۆچوونی رۆسۆ ئەمە شیاوی پەسندکردن نییە و پێشێلکردنی ئەو ئامانجەیە کە مرۆڤ لە پێناو گەرەنتی کردنی ئازادی خۆی ئۆتۆریتەیەك بخولقێنێ و پاشان ملکەچی بێت. (بەپێی بۆچوونی هۆبز و لۆك خەڵك لە رەوشی سروشتیدا ئازادن). رۆسۆ لە بەرامبەر ئەم جۆرە گرێبەستە کۆمەڵایەتییانەدا پرۆژەی کارەکەی خۆی لەسەر ئەو بناغەیە داڕشت کە چۆن دەتوانرێت شێوازێك لە کۆمەڵگا دروستبکرێت کە تێیدا هەر کەسێك وێڕای ئەوەی کە لەگەڵ هەموواندا یەکدەگرێت لە هەمانکاتدا تەنها ملکەچی خۆی بێت و وەکو سەردەمی بەر لە پەیوەست بوونی بە کۆمەڵ بە ئازادی بمێنێتەوە. رۆسۆ بەم پرۆژەیەی خۆی گەیشتە جۆرێك لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی کە تێیدا هەر تاکێك هەموو دەسەڵاتی خۆی دەداتە هەمووان (کۆمەڵ) و لەم رێگایەوە پەیکەرێکی گرووپی دروستدەبێت کە بە ویستی گشتی ناودەبرێت. ویستی گشتی ویستی هاوبەشی خەڵکە بۆ بەرەو پێشەوە بردنی چاکەی هاوبەش.

ئەم ویستە گشتییە هەم سەرچاوەی یاسا، هەم دانەری یاسا، هەم جێبەجێکاری یاسا و هەم ملکەچیەتی. ئەو شتەی کە بە حکوومەت ناودەبرێت شتێك نییە جگە لە دەستەیەکی جێبەجێکردن. لە دیموکراسی بەشدارانە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیش بێ واتایە چونکە کۆمەڵگای مەدەنی، هەروەك ئاماژەمان پێکرد، باس لە بۆشاییەکی ناوبژیوان دەکات لە نێوان تاك و دەوڵەتدا.

لە کاتێکدا کە لە دیموکراسی بەشدارانە دەوڵەت لە راستیدا کۆی گشتی خەڵکەو ئەو کۆمیسۆنە جێبەجێکەرە کە بە حکوومەت ناو دەبرێت بە جیا لە خەڵك خاوەنی هیچ دەسەڵاتێك نییە. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوە کە هەندێك تیۆری ویستی گشتی رۆسۆ بە مەترسییەك بزانن بۆ پاساو هێنانەوە بۆ پاوانخوازی. ئەم رەخنەگرانە دەڵێن لە حاڵەتی نەمانی مەودای نێوان خەڵك و دەوڵەت رەنگە هەمووان بکەونە خزمەتی دەوڵەت.





## شێوازەکانی بەشداریکردن

هەندێ لە تیۆرییەکانی دیموکراسی بەشدارانە بۆ دروورکەوتنەوە لە مەترسی پاوانخوازی لە سنووری ئانارشیزمی سیاسی نزیك دەبنەوە. هەندێك لە ڕێبازەکانی ئانارشیستی هاوئاراستەییەکی زۆریان لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی بەشدارانەدا نییە. ئانارشیسەکانیش دەیانەوێ کە ڕۆڵی دەوڵەت بە تەواوی لەناوببەن وکۆڕ و کۆمەڵە خۆبەخش و هەرەوەزییەکان لە جیاتیدا جێگیر بکەن. ئەوانیش لەو باوەڕەدان کە کۆمەڵە مرۆییەکان دەبێ بەبێ ناوبژیوانی دەوڵەت ڕاستەوخۆ بەسەر خۆیاندا حکوومەت بکەن[٣]. لە لایەکی تریشەوە هەندێك لە لایەنگرانی تیۆری دیموکراسی بەشدارانە وێڕای ئەوەی کە بە توندی خۆیان لە هەر جۆرە پێوەندییەك لەگەڵ بۆچوونە ئانارشیستییەکان دەپارێزن لە ڕێکخستنی سیاسی کۆمەڵگادا هەتا سنووری دیدگا ئانارشیستییەکان بەرەو پێشەوە دەچن.

بەم حاڵەش دیموکراتە بەشدارخوازەکان ئەم جیاوازییە گرنگەیان لەگەڵ ئانارشیستەکاندا هەیە کە بە پێچەوانەی ئەوان دەوڵەت لە ناخی خۆیدا بەشتێکی خراپ نازانن بەڵکو لە ڕوانگەی ئەوانەوە دەوڵەت ڕەهەندێکی دیکەی کۆبوونەوەی خەڵك و ویستی گشتییە و خەڵك لە لایەکەوە یاسادانەرو لە لایەکی ترەوە جێبەجێکاری یاسان. دەوڵەت وەکو دەزگایەك بە لایەنێکی گرێبەستەکە دانانرێت کە کۆمەڵگا دەسەڵاتی خۆی (چ بەشێوەی ڕەها لە تیۆری هۆبز یا مەرجدار لە تیۆری لۆك) بۆ ئەو گواستبێتەوە. لە تیۆری دیموکراسی بەشدارانە دەوڵەت جۆرە کۆمیسیۆنێکی جێبەجێکردنە کە ئیدی لە ڕاستیدا دەوڵەت بەواتای ئەم دەستەواژەیە نییە.



## دیموکراسی بەشدارانە و دیموکراسی نوێنەرایەتی

دیموکراسی بەشدارانە لە ڕوویەکەوە لە بەرامبەر دیموکراسی نوێنەرایەتیدا دەوەستێ کە شێوازی باو و زاڵی دیموکراسییە لە ڕۆژئاوادا. ڕەخنەی لایەنگرانی دیموکراسی بەشدارانە لە دیوکراسی نوێنەرایەتی بۆ هەندێ کەموکورتی لاوەکی دەگەڕێتەوە، لەوانەش بێ هەڵوێستی سیاسی خەڵك، بایەخنەدانی حکوومەت بە هاوڵاتیان، تەنها بەشێوەیەکی ڕووکەش نەبێت لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا. ڕەخنەی سەرەکی دیموکراتە بەشدارخوازەکان لە دیموکراسی نوێنەرایەتی ئەوەیە کە لە ڕاستیدا، هەر وەك ڕۆسۆ دەڵێ، ناتواندرێ دەسەڵاتداریێتی (واتە ئەو شتەی کە مافی خەڵکە) بە نوێنەرایەتی بە کەسێکی تر بدرێت. لە تیۆری دیموکراسی نوێنەرایەتی حکوومەت وەك لایەنی گرێبەستی لەگەڵ کۆمەڵگا خاوەن دەسەڵاتێکی تایبەت بە خۆیەتی. خەڵك پاش سپاردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی بەم دەزگایە خۆیان تەنها بەشێوزاێکی شەرمنانە و خولەکی (هەڵبژاردن) بەشداری دەکەن و بەشداری چالاك و بەردەوام بەلاوە دەنێن. لە کاتێکدا کە لە دیموکراسی بەشدارانە حکومەت تەنها ڕۆڵی نێردراوێکی سیاسی هەیە نەك شتێکی تر.

لایەنگرانی دیموکراسی بەشدارانە لەو باوەڕەدان کە هەموو بوارەکانی ژیان هەر لە باخچەی ساوایانەوە بگرە هەتا زانکۆ و لە بنەماڵەوە بگرە هەتا کارگە هەموویان دەبێ دیموکراتیزە بکرێن واتە ببنەگۆڕەپانی بڕیار دەرکردنی گرووپی. لە بەرامبەر ئەوانیشدا لیبراڵەکان بەم جۆرە بەڵگە دەهێنێنەوە کە خەڵك بەگشتی بێ هەڵوێستن و داواکاری دیموکراتە بەشدارخوازەکان بناغەیەکی واقیعگەرایانەی نییە. بەڵام دیموکراتە بەشدارخوازەکانیش بە نۆرەی خۆیان لە بەرامبەر ئەواندا بەم جۆرە بەڵگە دەهێنینەوە کە بێ هەڵوێستی خەڵك هۆکاری بێ دەسەڵاتییانە. سست بوونی سیاسی خەڵك هۆکارە نەك هۆ. لە حاڵەتی دەستەبەر بوونی هەلومەرجی شیاو هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی کە خەڵك بەتین و گوڕێکی هەرچی زیاترەوە بەشداری لە پرسە سیاسییەکاندا نەکەن.





### پشتبەستن بە فەزیلەتی مەدەنی

شێوازی بەشداری لە دیموکراسی نوێنەرایەتی بەم جۆرەیە کە هەر دەنگدەرێك بۆ بەرەوپێشبردنی قازانجە تایبەتییەکانی خۆی دەنگ دەدات. لە کۆتاییدا ئەو شتەی کە بەدەستدێت کۆکردنەوەی ژمارەیی بەرژەوەندییەکانە کە لە کۆکردنەوە و کەمکردنەوەی قازانجی یەکەیەکەی تاکەکان بەدەستهاتووە. کاری دەوڵەت ئەوەیە کە زیاترین قازانجەکان بەرەوپێشەوەببات واتە ئەو قازانجانەی کە پشت بە زیاترین ژمارەی دەنگەکان دەبەستێ. دیموکراتە بەشدارخوازەکان ئەم پرسە بەشتێکی دوور لە فەزیلەتی مەدەنی دەزانن کە هەر کەسێك تەنها بە دوای قازانجی خۆیدا بگەڕێت و خێر و چاکەی هاوبەش فەرامۆشبکات. ئەم دیموکراتانە لەو باوەڕەدان کە هاوڵاتیان لە بری شێوازی خۆپەرەستانەی گەڕان بە دوای قازانجە تایبەتییەکاندا دەبێ بیر لە خێر و چاکەی هاوبەش بکەنەوە و لە هەنگاوی یەکەم دەبێ هەوڵبدەن کە لەسەر پرسە جۆرا و جۆرەکان بگەنە کۆدەنگی و ئەگەر کۆدەنگی بەدینەهات ئەوا وەك ئامرازێکی ناچارانە پشت بە ژماردنی دەنگەکان ببەستن. لە شێوازی ئاسایی دیموکراسی نوێنەرایەتیدا چارەسەرکردنی پرسە بە کۆمەڵەکان لە پێشبڕکێیەك دەچێ کە هەر کەسێك تەنها بیر لە سەرکەوتن (تەنانەت بە کڕینی دەنگەکانیش بێت) دەکاتەوە. بەم جۆرە دیموکراتە بەشدارخوازەکان لەسەر شێوازی کۆماریخوازە کلاسیکییەکان بەرگری لە فەزیلەتی مەدەنی واتە بەشداری وەك ئەرکێکی بە کۆمەڵ دەکەن.

## ٢- دیموکراسی راوێژیی

یەکێکی دیکە لە تیۆرییەکانی دیموکراسی بریتییە لە دیموکراسی راوێژیی (Deliberative Democracy). بە بۆچوونی هەندێك لە تیۆرداڕێژان دیموکراسی راوێژیی دەتوانێ رێگایەکی ناوەڕاست بێت لە نێوان دیموکراسی لیبرال کە لەگەڵ



قەیرانی رەوایی و بەشداریدا بەرەورووە و دیموکراسی بەشدارانە کە لە هەلومەرجی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا ئاسۆیەکی روون لەبەردەم جێبەجێ بوونیدا بەدی ناکرێت.

دیموکراسی راوێژیی لەسەر ئەم هزرە بنیاتنراوە کە کۆمەڵێکی بنیاتنراو لە سەر بنەماکانی دیموکراسی لە شێوازی ئیدیالی خۆیدا دەبێ کاروبارەکانی خۆی لە رێگای باس، وتووێژ، راوێژ و گفتوگۆی پشتبەستوو بە بەڵگە و تێڕامان بەرەوپێشەوە ببات. کەوابوو دیموکراسی ئەمەنییە کە خەڵك بڕۆن و بەو وێنایەی کە لە قازانجەکانی خۆیان هەیانە دەنگێك بخەنە ناو سندووقەوە و پاشان بە ژماردنی ئەم دەنگانە بڕاردە گشتییەکانی خەڵك دەستنیشانبکەن. دیموکراسی راوێژیی بۆ ئەوەیە کە لە راستیدا بڕیارسازی بە شێوازی گرووپی، رەواو عەقڵانی بێت. بڕیارسازی گرووپی (چ لەسەر ئاستی بچووك و چ لەسەر ئاستی گەورە و وڵات) کاتێك رەواو عەقڵانییە و دامەزراوە بڕیارسازەکانی کاتێك خاوەنی رەواین کە هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم بڕیارانە کاریگەریی لەسەریان دەبێت و هەموو ئەو کەسانەی کە لەم دامەزراوانەدا خاوەن بەرژەوەندین بتوانن بەشێوەیەکی ئازاد و یەکسان بەشداری تێدابکەن و بە گفتوگۆکردن و گوێڕاگرتن لە وتەکانی یەکتر و بەڵگەی بەرامبەرەکانیان ویستێکی گرووپی دروستبکەن.

### بنەما تیۆرییەکانی دیموکراسی راوێژی

دیموکراسی وەکو گەلێك لە تیۆرییەکانی دیموکراسی کە تائێرە باسمان لێوەکردوون هەم لە چەند بنەمایەکی فەلسەفییەوە هەڵقوڵاوە و هەم رەهەند و ژێر کۆمەڵەی جۆراوجۆری هەیە. بەڵام ئێمە لێرەدا دەربارەی ئەم لایەنانە ناچینە ناو وردەکاری باسەکانەوە. لەم کتێبەدا کە پتر بۆ ناساندنی چوارچێوەی تیۆرییە سیاسییەکانە دەرفەت بۆ باسکردنی وردەکارییەکان نییە. بەهەرحاڵ، یۆرگن هابرماس بە یەکێك لە دیاترین تیۆرداڕێژەرانی دیموکراسی راوێژیی دادەنرێت. بەر لە ئێستا لە باسێکی جیاوازدا لەسەر هابرماس





قسەمان کردووە و لێرەدا هەندێ ئاماژەیتر بۆ ئەو شتانە زیاد دەکەین کە لەمەوپێش گوتوومانە. لەو باسەدا وتمان کە کۆی هزرەکانی هابرماس لە باسی پێوەندیدار بەشێوەی ئیدیالی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکان سەر ئەنجام دەگاتە چەمکێك بەناوی دیموکراسی گوتاریی. دیموکراسی گوتاریی کە لێرەدا هەندێ خاڵی دیکەی لەسەر باس دەکەین هەمان دیموکراسی راوێژییە بەلام بە دەستەواژەیەکی تر.

دیموکراسی راوێژیش هەروەك ئەو شتەی کە بە دیموکراسی بەشدارانە ناومان لێبرد لە رەخنەگرتن لە بنەما و کردارەکانی دیموکراسی لیبرالەوە دەستپێدەکات. رەخنەی دیموکراسی راوێژیی مرۆڤگەلێك نەخشەرێژ دەکات کە خاوەن ئەولەویاتی نەگۆڕ و لە پێش دیاری کراون و بۆ گەیشتن بە ئەولەویاتی خۆیان بە کەلکوەرگرتن لە دامەزراوە و رێسا دیموکراتییەکان (پەرلەمان، هەڵبژاردن) دەستبەکاردەبن. دامەزراوە و رێسا دیموکراتییەکانیش شتێك نین جگە لە ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەو کەمکردنەوەی ئەولەویاتە یەکسان و نایەکسانەکان بۆ گەیشتن بە کۆی ژمارەیی زیاترین ئەولەویاتەکان (بە زمانێکی ساکار وەرگرتن و هەژمارکردنی دەنگەکان).

هەڵبەت رەهەندی دیموکراتییانەی لیبرال دیموکراسی یابەشی دووهەمی ئەم تێکەڵەیە (دیموکراسی) خۆی باس لەوە دەکات کە هەموو تیۆرییەکانی پەیوەست بە لیبرال دیموکراسی لەم خاڵەوە دەست پێ ناکەن و ئامانجی دیموکراسی بەوە نازانن کە وەلامدەرەوەی هەموو ئەولەویاتە تاکە کەسییەکان بێت بەلام شێوازە باوەکان و بۆچوونەکانی بیناتنراو لەسەر سوودگەرایی وەك یەکێك لە بناغەکانی دیموکراسی نوێنەرایەتی بە کردەوە بەرەو ئەم ئامانجە هەنگاو دەنێن. بەپێی ئەم فەلسەفەیە کاری دەوڵەت و دامەزراوە دیموکراتییەکان ئەمە نییە کە بە خەڵك بڵێن چ شتێك چاکە یا خراپە و یا لە راستیدا یەك خوێندنەوە لە ژیانی باش و خێر و چاکەی کۆمەڵگا بەدەستەوە بدەن. ئەوان تەنها دەبێ ئەو خواستانە بناسن کە تاکەکان بۆ خۆیان بە چاکی دەزانن و زیاترین ژمارەی چاکەکان ((بکەنە سەرمەشقی بەرنامەرێژییەکانی خۆیان)).



## گفتوگۆی دیموکراتییانە لە جیاتی کۆکردنەوەی ئەولەویاتەکان

لایەنگرانی دیموکراسی راوێژیی بۆ دیموکراسی تەنها ئەمە بە پێویست نازانن کە خەڵك تەنها پشت بە زنجیرەیەك رێ و رەسمی دیموکراتی وەك بەشداریکردن لە هەڵبژاردن ببەستن. لە روانگەی ئەوانەوە پرۆسەی دیموکراتی کاتێك رەوایی وەردەگرێ کە ئەم دەرفەتە بۆ خەڵك برەخسێنێ کە هەم لە پرسە تایبەتی و راپەڕێنەرەکان و هەم لەمەڕ خودی رێسا دیموکراتییەکان بەراوێژ، بیرکردنەوە، گفتوگۆ، بەڵگەهێنانەوە و قەناعەت پێکردن هەوڵی گەیشتن بە کۆ دەنگی بدەن. کاتێك کە لەمەڕ سیاسەتە گشتییەکاندا بیر و بۆچوونی جیاواز هەیە گفتوگۆی دیموکراتییانە لە رێگای دامەزراوە شایستەکانەوە بۆ ئەم کارە پێویستە. ئەم گفتوگۆیانە نەتەنها لەمەڕ باشترین شێوازەکانی بەرەو پێشبردنی خێر و چاکەی هاوبەش بەڵکو هەروا دەبێ لەمەڕ جیاوازییە بنەڕەتییەکانیش دەربارەی ناوەڕۆکی خودی خێر و چاکەی هاوبەش و ئامانجی هاوبەشیش ئەنجام بدرێت.

ئەم جۆرە گفتوگۆیانە رەنگە ببنە هۆی ئەوەی کە پاڵ بە خەڵکەوە بنێن کە پێداچوونەوەی ئەولەویاتی خۆیان و هەڵبژاردنی ئەولەویاتی نوێ بکەن.

## دەرفەتی گفتوگۆ

ئایا لە راستیدا دەرفەتی ئەوە هەیە کە گفتوگۆ لەسەر پرسە هاوبەشەکان و خێر و چاکەی هاوبەش بکرێت. لە تاکگەرایی توندڕەوانەدا گفتوگۆیەکی لەم جۆرە نە بە پێویست دەزانرێت و نە دەرفەتی پێ دەدرێت. دیموکراسی راوێژیی بە تایبەتی لە تیۆری هابرماس لەسەر بنەمای دەرفەتی گفتوگۆ بنیاتنراوە.

دەرفەتی گفتوگۆ لەمەڕ پرسە هاوبەشەکان لە تیۆری دیموکراسی هابرماس ریشەگەلێکی فەلسەفی قووڵتری هەیە و بەشێکە لە بنەمای تیۆری ئەو لەمەڕ

مەعریفە، مرۆڤ و ژیان. ئاماژەی ئێمە بە تیۆری کرداری پێوەندییە کە لەمەو پێش کورتەیەکمان لێباسکرد و لێرەدا ئاماژە بە پێگەی ئەو دەکەین لە تیۆری دیموکراسی ئەم هزرڤانەدا.

گوتمان کە هابرماس کردار بەسەر دوو جۆری کرداری ئامرازیی یا ستراتیژی و کرداری پێوەندی دابەشدەکات. کرداری پێوەندی هەروەك گوتمان بەستراوەتەوە بە هاوکاری لەسەر راستییەکانی جیهان، ڕێساکان و هاتووچۆ کۆمەڵایەتییەکان و گەیشتن بە دەرکی بەرامبەر. لە کرداری پێوەندی، ئەکتەران هەوڵ دەدن نە بە پشتبەستن بە لێکدانەوەی خۆپەرەستانە بەڵکو لە ڕێگای هەوڵدان بۆ گەیشتن بە لێککگەیشتن و بەرەوپێشبردنی ئامانجەکان بەشێوەی هاوئاهەنگ کردنی بەرنامەی کاری خۆیان لەگەڵ ئەوانیتر دەستبەکاربن. بەشێکی گرنگی هەوڵە فەلسەفییەکانی هابرماس بەرەو ئەم مەبەستەیە کە شتێکی لەم جۆرە مومکینە. ئەو تەنانەت بە کەڵکوەرگرتن لە فەلسەفەی زمان و شیکردنەوەی زمانی رۆژانە راستی کرداری پێوەندی و فەرمانەکانی سەرەوە دەسەلمێنێ.

هابرماس لە کتێبی ((لە نێوان راستییەکان و ڕێساکان)) (١٩٩٨) تیۆری گوتاریی ئەخلاق کە دەڵێ هەوڵدان و حەز بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن تەنانەت لە ڕێسا لاوەکییەکانی زمانشیدا هەیە بەرەو تیۆرییەکەی خۆی لەمەڕ دیموکراسی فراوان دەکات و دەڵێ ((تەنها ئەو ڕێسا و شێوە کردارانە دەتوانن بانگەشەی رەوایی بکەن کە هەموو ئەو کەسانەی کە دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو لە گفتوگۆیەکی عەقڵانیدا رەزامەندی لەسەر بدەن)). هابرماس سەرئەنجام دیموکراسی بە کۆمەڵێك لە داب و ڕێسا فەرمییەکان لێکدەداتەوە کە خەڵك لە ڕێگایەوە بۆ گەیشتن بە هاوکاری لە مەڕ ئامانجە هاوبەشەکان و شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکان لە پێناو گەیشتن بە ئامانجە هاوبەشەکان هەوڵدەدەن. ئەمانە لە بنەما سەرەکییەکانی دیموکراسی راوێژیین.



## هەوڵدان بۆ گەیشتن بە کۆ دەنگی

تەوەرەی سەرنجی لایەنگرانی دیموکراسی راوێژیی گەیشتنە بە کۆدەنگییەك لەمەڕ پرسەکانی ژیانی هاوبەش. هابرماس لە تیۆری دیموکراسی راوێژیی وێڕای هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ قەیرانی رەوایی سیستەمی دیموکراسی دەستووری تەنانەت لە پرۆژەکەی خۆیدا رەهەندە کردارگەراکانیش لە بیرناکات. ئەو سیاسەتی راوێژیی بە ئاوێتەیەك لە رەهەندە ئەخلاقییەکانی گرووپگەرایانە و کردارگەرایانە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری هاوبەش دەناسێنێ. هەندێك لە لایەنگرانی تیۆری دیموکراسی راوێژیی پرۆژەیەکی لەم جۆرە لە دیموکراسی بۆ تێکەڵکردنی رەوایی و عەقڵانییەت لە سیستەمی سیاسی کۆمەڵگادا هەڵدەسەنگێنن.

بەهەرحاڵ هەموو لایەنگرانی دیموکراسی راوێژیی جەخت لەسەر ئەم بنەمایە دەکەنەو کە کاری دیموکراسی هاندانی هاوڵاتیانە بۆ گەیشتن بە کۆدەنگی لەسەر خێر و چاکەی هاوبەش. هەڵبەت ئەوان ناڵێن کە گەیشتن بە کۆدەنگی هەمیشە مەیسەرە و لە هەموو حاڵێکدا پێویستە. ئاشکرایە کە لە هەندێ خاڵدا گەیشتن بە کۆدەنگی مومکین نییە.لەم جۆرە حاڵەتانەدا دەتواندرێ وەك دوا ڕێگا چارە لەسەر بنەمای دەنگوەرگرتن و دەنگی زۆرینە بڕیار بدرێت. هابرماس دیموکراسی راوێژیی خۆی بە جۆرێك ئاشتبوونەوە لە نێوان لیبرالیزم و کۆماریخوازی دەزانێ. لیبرالیزم سیاسەت و یاسا بە ئامادەکارییەك دەزانێ بۆ ڕێکخستنی رکابەری و کۆماریخوازیش ئەوان وەك رەنگدانەوەی یەکێتی کۆمەڵایەتی سەیردەکات. لیبرالیزم دیموکراسی تەنها بۆ رەوایی بەخشین بە دەسەڵاتی سیاسی دەوێ و کۆماریخوازیش بە مەبەستی گۆڕینی کۆمەڵگا بۆ گرووپێکی سیاسی لەبەرچاوی دەگرێت. دیموکراسی راوێژیی دەیەوێ ئەم دووانە لەگەڵ یەکتردا ئاشتبکاتەوە.





**یادداشتەکان:**

١- نوربرتو بوبیو، لیبرالیسم و دموکراسی، ترجمه بابك گلستان، تهران، نشر چشمه، ١٣٧٦، ص ١٦.

٢- تاریخ اندیشه سیاسی درغرب از ماکیاول تا مارکس، فصل ٦.

See Michael Taylor, community, Anarchy and Liberty, cambridge, cambriadge University press, 1982.

3- Frank Cunningham, Theories of Democracy, Acritical Introduction, London-Newyork, Routludge 2002, P. 127.



## پاژی یازدەهەم

# هانا ئارنت، کۆماریخوازیی کلاسیك و دیموکراسی راوێژیی

### ژیان و نووسینەکانی ئارنت

هانا ئارنت (١٩٠٦-١٩٧٥) بە یەکێك لە دیارترین تیۆردارێژانی سەدەی بیستەم دادەنرێت. ئەو لە ئەڵمانیا لە دایکبووە و بەڕەچەڵك جوولەکەیە و لەکاتی سەرهەڵدانی نازیزم سەرەتا بەرەو فەرەنسا و ئینجا بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکان کۆچیکرد. ئەو کە بە خۆی قوربانی دەستی نازیزم بوو لە ساڵی ١٩٥٨ یەکەم بەرهەمی خۆی بەناوی پاوانخوازی (توتالیتاریانیزم) بڵاوکردەوە. کتێبی گرنگتری بریتییە لە بارودۆخی مرۆیی (١٩٥٨) کە تێیدا هەوڵیداوە بە قووڵبوونەوە لە سێ چەمکی بنچینەیی ((زەحمەت))، ((کار))، و ((کردار)) لە سەردەمەکانی رابردوو خەریکی سەر لە نوێ دۆزینەوە و تۆژینەوە لە بارودۆخی ئەمڕۆیی مرۆڤ بێت. کتێبی دیکەی ئارنت کە بەرگی دووهەمی بارودۆخی مرۆییە ناوی (ژیانی زەین)ە کە بیست ساڵ پاش کتێبی یەکەمی بڵاوبووەوە، لەم مەودایەدا، ئارنت گەلێك وتاری نووسی کە لە سەردەمی خۆیدا گەلێك خوێنەری هەبووەو سەرنجی گەلێك کەسی راکێشاوە. کتێبێکی دیکەی ئەو کە هەر لەم مەودایە (ساڵی ١٩٦٣) نووسراوە کتێبی (دەبارەی شۆڕش)ە کە تێیدا هەوڵی داوە یەکێك لە بابەتە گرنگەکانی خۆی لە کتێبی بارودۆخی مرۆیی بۆ شیکردنەوەی شۆڕشەکانی ئەمەریکا، فەرەنساو روسیا بەکاربهێنێ.





تیۆری هانا ئارنتیش سەرەنجام دەگاتە شێوازێك لە دیموكراسی راوێژیی كە هەڵبەتە گەلێك جیاوازی گرنگی لەگەڵ ئەو دیموكراسییە هەیە كە بە لای هابرماسەوە مەبەستە.

## بارودۆخی مرۆیی

خاتوو هانا ئارنت بە یەكێك لە دیارترین بیرمەندانی سیاسی سەدەی بیستەم دادەنرێ و لە ریزی ئەو ژمارە كەمەی بیرمەندانی سیاسیدایە كە پێگەیەكی بەرزی هەیە لە خولقاندنی فەلسەفەیەكی سیاسی و تیۆرییەكی سیاسی رەسەندا. هەرچەندە ئەزموونی پاوانخوانی سەدەی بیستەم لە پێشەوەی فەلسەفەی سیاسی و تیۆری سیاسی ئارنت دایە بەڵام ئارنت لە بنەڕەتدا لەگەڵ پرسە بنچینەییەكانی پەیوەست بە رەوشی مرۆڤ و كۆمەڵگای هاوچەرخ سەروكاری هەیە و هەر لە چوارچێوەی شیكردنەوەی خۆی لەسەر رەوشی مرۆیی پرسی گرنگی پاوانخوازیشی داوەتە بەر لێكۆڵینەوە. كەوابوو باشتر وایە سەرەتا لەگەڵ بنیاتە تیۆرییەكانی فەلسەفەی سیاسی ئارنتدا ئاشنابین و ئینجا چاوێك بەسەر نوێترین هزرە سیاسییەكانی ئەودا بخشێنین لەمەڕ پاوانخوازی و كۆماریخوازی كلاسیك.

هەروەك ئاماژەی پێكرا، هزری سیاسی ئارنت، لەسەر بنەمای ئەو فەلسەفەیە دامەزراوە كە لە كتێبی بارودۆخی مرۆییدا هاتووە. كتێبی بارودۆخی مرۆیی یەكەمین نووسینە لەو دوو نووسراوە سەرەكییەی كە فەلسەفەی سیاسی و تیۆری سەرەكی ئارنت لەخۆ دەگرێت. بارودۆخی مرۆیی چەمكێكە لە جۆری ((سروشتی مرۆیی)) كە هەڵبەت لەگەڵ ئەویشدا جیاوازە. ئارنت چەمكی سروشت مرۆیی بە شیاوی پێناسەكردن و لێوردبوونەوە نازانێ و لە بری ئەودا چەمكی بارودۆخی مرۆیی دروست كراووە كە شیاوی پێناسە و لێكۆڵینەوەیە. بارودۆخی مرۆیی بریتییە لەو توانایی و تایبەتمەندییانەی كە لە ژیانی هاوبەش و هاوپێوەندی



مرۆڤەكاندا سەری هەڵداوە و وەك بوونێكی مرۆیی تایبەت رەنگی داوەتەوە. بەوتەیەكی تر بارودۆخی مرۆیی بەواتای كۆی ئەو چالاكییە مرۆییانەیە كە بەسەریەكەوە ژینگەی تایبەتی مرۆییان پێكهێناوە. مێژوو یەكێكە لە رەنگدانەوەكانی ئەم بوونە مرۆییە.

## بەشە پێكهێنەرەكانی بارودۆخی مرۆیی:

ئەو تواناییانەی مرۆڤ كە جیهانی تایبەتی ئەو دروستدەكەن بریتین لە هەندێك توانایی وەك زەحمەت Labour، كار Work، كردار و بیركردنەوە. ئارنت لە كتێبی بارودۆخی مرۆیی سێ توانایی یەكەم و لە كتێبی ژیانی زەین توانایی چوارەم دەخاتەبەر باس. ئەم سێ تواناییە لەسەریەك ((ژیانی كردار گەرایانە)) لە خۆدەگرن كە ئارنت ئەوان لە بەرامبەر ((ژیانی بیرگەرایانە)) دادەنێ. هەریەك لەم سێ تواناییە رەهەندێكی تایبەتی لە ژیانی مرۆڤ دروستدەكەن. زەحمەت لەگەڵ بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەی پێداویستییەكانی ژیان لە پێوەندیدایە، كار لەگەڵ پیشەسازی سازكردنەوە لە پێوەندیدایە و كرداریش لەگەڵ شتێك لە پێوەندیدایە كە ئارنت بە ((رەوشی فرەیی مرۆیی)) ناوی دەبات. زەحمەت رەهەندی ژیان ناسانەی مرۆڤ، كار رەهەندی سازێنەرانە و داهێنەرانەی ئەو، كردار رەهەندی بەشداریخوازانە و ژیانی گرووپی مرۆڤ پێكدەهێنن.

بابەتی زەحمەت لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا هاوبەشە چونكە ئاژەڵیش دەبێ بۆ ژیان و مانەوە لەگەڵ ژینگە دابجەنگێت. لە كۆمەڵگای مرۆییدا زەحمەت هاوشێوەی چوارچێوەی چالاكییە ئابوورییەكانە و كاریش لەگەڵ بەرهەمە رۆشنبیرییەكان لە پێوەندیدایە. كرداریش بنچینەی ژیانی سیاسییە.

له ڕاستیدا ئەم بابەتەی دوایی بە پێوەندی لەگەڵ ئەوانیتر و ئەزموونی هاوبەشەوە پەیوەست دەبێ. بابەتی کردار بەرزترین نمایشی بارودۆخی مرۆڤ یا بوونی تایبەتی مرۆییە. کردار هەروا گرنگترین بەشی ژیانی کردارگەرایانەیە. کردار لە چوارچێوەی گرووپ و ڕەوشی فرەییدا واتا پەیدادەکات.

### کرداری سیاسی و بارودۆخی مرۆیی

جیاکردنەوەی ئەم سێ چەمکە لە یەکتر ڕەهەندێکی شیکاری تایبەتی هەیە و ئەمانە لە ڕاستیدا سێ چەمکن کە نەخشەی بنەڕەتی فەلسەفەی ئارنت پێکدەهێنن. ئارنت بە کەڵك وەرگرتن لەم سێ بابەتە دۆخی مێژوویی مرۆڤ و ڕەوشی هەنووکەیی ئەو شیدەکاتەوە. تایبەتمەندی کۆمەڵگای هاوچەرخ و ڕاڤەکردنی سەرهەڵدانی دیاردەیەك بەناوی پاوانخوازیش لە چوارچێوەی ئەم چەمکەدا ئەنجامدەدرێ.

بواری زەحمەت بواری زەروورەتی تەواوە. لەم بوارەدا هیچ جێگایەك بۆ ئازادی نییە. بەڵام بواری کار دەرفەتی ئازادی زیاتری تێدایە. لە بواری کاردا مرۆڤ لایەنێکی هاوکێشەکە و سروشت لایەنەکەی تری پێکدەهێنن. چونکە سروشت ملکەچی یاسا سروشتییەکانە کاری مرۆڤیش کە لەگەڵ سروشت لە پێوەندیدایە لە زەروورەت بە دوورنییە. بەڵام بواری کردار قەڵەمڕەوی پێوەندی نێوان مرۆڤەکانە. لێرەدا هەر دوولایەنی هاوکێشە کە مرۆڤن. ئەم بوارە زیاترین چوارچێوەی ئازادی تێدایە. بەرزترین نموونەی کرداریش کرداری سیاسییە. هەر بۆیە سیاسەت بە بەرزترین پێگەی نمایشی ئازادی لەقەڵەمدەدرێت. بەوتەی ئارنت ((ئازادی هۆکاری بوونی سیاسەتە))[1] ئارنت دەڵێ کە چەمکی کلاسیکی کۆماری لەگەڵ ئەم چەمکە لە ئازادی و سیاسەت لە پێوەندیدایە.



کردار ئەم واتایە دەبەخشێ کە جیهان نە پێگەی تاکی مرۆڤە بەڵکو پێگەی مرۆڤەکانە. چەمکی فرەیی لەم واتایە لە دایکدەبێ. فرەیش پێویستی بە هەر دوو لایەنی جیاوازی و یەکسانی هەیە. جیاوازی و یەکسانی پێویستیان بە گفتوگۆ هەیە. ئەگەر فرەیی نەبوایە ئەوا کردارو قسەکردن پێویست نەبوو و ئەگەر یەکسانی نەبوایە دەرفەت بۆ لێك گەیشتن نەدەڕەخسا. کەوابوو چەمکی فرەیی مرۆیی هەم تاکگەرایی و تاك بوونی مرۆڤەکان و هەم وابەستەیی بەرامبەری ئەوانیش بە یەکتر لە خۆدەگرێت. کردار بە پێچەوانەی کار بەرهەمێکی هەستپێکراوی نییە لە بەرامبەر بێهوودەییدایە. سیاسەت دەبێ کردار و لەم ڕێگایەشەوە بارودۆخی مرۆڤ ڕێکبخات. سیاسەت بۆ ئەوەی بتوانێت بەم جۆرە بێت دەبێ بەرامبەر بە فرەیی وەفاداربێت. دەسەڵاتی سیاسی نەك بەهێز بەڵکو بە کرداری هاوئاهەنگی مرۆڤەکان لە دایکدەبێت. سیاسەت بواری قەناعەت پێکردنە نەك هێز.

### تێکەڵکردنی بواری گشتی و بواری تایبەتی و بارودۆخی مرۆیی:

ئارنت لایەنگری کۆماریخوازی کلاسیکییە. وەك ئەو دەڵێت لە جیهانی دێرین (یۆنان و ڕۆم) بواری تایبەتی و گشتی لە یەکتر جیابوون. بواری تایبەتی بواری کارو ڕەنج و زەحمەت و بواری گشتی بواری کرداربوو. هەر بۆیە بواری گشتی بواری ئازادی بوو. هاوڵاتییانی چەرخی دێرین بواری گشتییان بە بواری ئازادی دەزانی هەر بۆیە ڕێزیان لێدەگرت. ئارنت لەناوچوونی جیاوازی لە نێوان بواری گشتی و بواری تایبەتی بە بنەڕەتیترین بنەمای لە دەستچوونی ئازادی و زەمینەی سەرەکی سەرهەڵدانی سیستەمە تاکڕەو و سەرئەنجام پاوانخوازەکان دەزانێ، لە دەستچوونی جیاوازی لە نێوان بواری گشتی و بواری تایبەتیش هەم لەگەڵ لێك





گیربوونی کۆمەڵگا بۆ بواری گشتی و هەم لەگەڵ تێڕوانین و ڕێنومایی فەیلەسووفە سیاسییەکان بۆ بواری گشتی لە پێوەندیدایە.

لە کۆمەڵگای مۆدێرن ڕەنج کە تایبەتیترین چالاکییە خزێنراوەتە ناو بواری کردار کە بەرزترین بواری ئازادییە. ئارنت بەم شیکردنەوەیە یەکێك لە گرنگترین نیگەرانییەکانی هزرڤانانی هاوچەرخی بەشێوازی تایبەتی خۆی راڤەکردووە. چوارچێوەی هەندێ چەمکی وەك ((دەسەڵاتی عەقڵ ئامرازی))، ((بەشت کرد/ شی شدگی)) یا زاڵبوونی تەکنۆلۆژیا بە سەرچارەنووسی مرۆڤ لە هزری کەسانێکی وەك ماکس ڤیبەر و لووکاچ و مارکۆزە و گەلێك کەسی تردا هاتوون، (و لەمەوپێش باسکران). ئارنت کۆمەڵگای مۆدێرن کە نوقمی ناو مەسرەفگەراییە بە کۆمەڵگای ڕەنجدان (بەواتای نیگەتیڤ واتە ئەو کەسانەی کە دەبێ لە بواری ڕەنجدا کاربکەن) لەقەڵەمدەدات. ئەم تێکەڵکردنە واتە چوونی ڕەنج (کە بواری زەروورەت و نەبوونی ئازادییە) بۆ بواری کردار کە بواری ئازادییە ڕەوشی مرۆیی بە تەواوی گۆڕیوە و خستوویەتە بەردەم جدیترین زیانەکان لەوانەش پاوانخوازی.

لەم نێوانەشدا تیۆرداڕێژانی سیاسی مۆدێرن کە ئامانجە یەکسانە کۆمەڵایەتییەکانیان پەرەپێدا لە ڕاستییەکانی کۆمەڵگا تاوانبارنین. (ئارنت ڕەزامەندی لەسەر یەکسانی سیاسی هەیە بەڵام دژ بە یەکسانی کۆمەڵایەتییە). ئارنت ڕەخنە لە مارکس دەگرێ کە چالاکی ڕەنجدەرانی کردۆتە بناغەی تیۆرییەکەی خۆی بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ.



## پاوانخوازی (توتالیتاریزم)

پاوانخوازی لە شێوە جۆراوجۆرەکانی خۆی، لە نازیزم و فاشیزمەوە بگرە هەتا ستالینیزم کە پانتاییەکی بەرفراوانی گۆڕەپانی سیاسەتی جیهانی لە ئیتالیا و ئیسپانیاوە بگرە هەتا رووسیا و چین و ژاپۆنی داگیرکرد بوو، یەکێك لە پرسە گرنگەکانی دەیەکانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بوو. گەلێك لە هزرڤانان و لێکۆڵەران خەریکی تۆژینەوە و دۆزینەوەی ڕەگوریشەکانی دیاردەی پاوانخوازی و شێوازە تایبەتییەکانی ئەو بوون (وەك فاشیزم). لەم بوارەدا لێکۆڵینەوەی قووڵ و تێڕامانی هانا ئارنت پێگەی تایبەتی لە فەلسەفەی سیاسی سەدەی بیستەمدا هەیە. لە ڕاستیدا پاوانخوازی بنەمای زەمینەی هەموو سیستەمی هزریی هانا ئارنتە. شیکردنەوەی دیاردەی پاوانخوازی لە هەمانکاتدا لەگەڵ هەموو تێڕامانی فەلسەفی هانا ئارنت پێوەندییەکی ئۆرگانیکی هەیە.

هانا ئارنت پەنجەی لەسەر ئەم خاڵە دانا بۆ ئەوەی کە پاوانخوازی دەرفەتی دەرکەوتنی بۆ برەخسێ دەبێ ئەزموونەکانی مرۆڤ و ڕەوشی مرۆیی لە سەدەی بیستەم لە بنج و بناوانەوە تووشی گۆڕانێکی قووڵ ببێت. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە نابێ وەك دیاردەیەکی کاتی و ڕاگوزاریی سەیری ئەم دیاردەیە بکرێت بەڵکو لە جێی خۆیدایە کە وەك دیاردەیەکی گرنگی مێژووی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێت کە ڕەگوریشەیەکی قووڵی لە بوونی مرۆڤ یا ڕەوشی مرۆیی لە چەرخێکی مێژووییدا هەیە. بە گۆشەنیگایەکی لەم جۆرە بوو کە ئارنت گەیشتە ناوخۆییترین هێزەکانی سەرهەڵدان و دینامیکیەتی پاوانخوازیی.





هانا ئارنت رەگوریشەکانی پاوانخوازی لە دوو وەرچەرخانی گرنگ لە ژیانی مرۆڤی هاوچەرخدا دەبینی. یەکێکیان بە جەماوەری بوونی کۆمەڵگا و ئەویتر پەرەسەندنی پێگەی ئایدۆلۆژیایە لەم کۆمەڵگایەدا (کۆمەڵگای جەماوەری). لەوتەیەکی سادەدا سەرهەڵدان و پەرەسەندنی پاوانخوازی لە لایەکەوە بە دابڕانی مرۆڤەکان لە رەگوریشە گرووپی و کلاسیکییەکانیان و گۆڕینیان بە کۆمەڵەیەکی بێ شکڵ و شێواز و لە لایەکی ترەوە بە دابڕانی ئەوان لە ئایین و بیروباوەڕەکانی رۆژی دوایی و کەوتنە تەوژمی ئایدۆلۆژیاکانی برەوپێدەری یەکسانی کۆمەڵایەتی (چ راست یا درۆ) لە پێوەندیدایە.

ئارنت دەڵێ کاتێك کە مرۆڤی رۆژئاوایی باوەڕمەندی بە ئایین و هاوکات لەگەڵ ئەویشدا باوەڕمەندی بە پەیوەست بوونی یاسا لەگەڵ ئایین و دادپەروەری جیهانی دیکەی لە دەستدا کەوتە بەرتەوژمی دەسەڵاتی ناچارانەی ئایدۆلۆژیا. ئینجا نەك بەها کۆتاییەکانی بەڵکو ((رەنج)) Labour بووە بەهای دیاریکەر لە بواری گشتیدا و رێگای بۆ پەرەسەندنی ئایدۆلۆژیا پاوانخوازەکان کردەوە.

بەسەرنجدان بەوەی کە هەموو کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان لە رووی تایبەتمەندی بە جەماوەری بوون و کاریگەربوون بە ئایدۆلۆژیا رەوشێکی لێکچوویان هەیە. پرسیارەکە ئەمەیە بۆچی هەندێ لەم کۆمەڵگایانە تووشی داوی پاوانخوازی هاتوون و هەندێکی تر وەهانین؟ وەڵامی هانا ئارنت بۆ ئەم پرسیارە ئەمەیە کە پاوانخوازی هەڕەشە لە هەموو کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان دەکات، بەڵام هەنووکە لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو هەندێ فاکتەری وەك پشتبەستن بە تیرۆر و تۆقاندن لە لایەن هەندێ رژێمی تایبەتەوە سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیەی خێراتر کردووە. ئارنت لە شیکردنەوەکەی خۆیدا بۆ هەندێ سیاسەتی وەك پشتبەستن بە تیرۆر و تۆقاندن وەك ئامرازە سەرەکییەکانی پاوانخوازەکان پێگەیەکی تایبەتی دەستنیشانکردووە[٢].





لەم بارەیەوە کە ئایا ئارنت کۆماریخوازبووە یاخود لە راستیدا دیموکرات بووە (یالیبرال) ناڕوونی و بیرو بۆچوونی جیاواز هەیە. ئارنت خۆی بە روونی لەمەڕ حکوومەتی دڵخوازی خۆی نەدواوە. لە راستیدا ئارنت پتر باسی لەو شتانە کردووە کە لە سیاسەتدا دڵخوازنین تا ئەو شتانەی کە دڵخوازن. بەم حاڵەش لە کۆی گشتی باس و شیکردنەوەکانی ئارنت گەیشتوونەتە ئەم ئەنجامە کە دەتوانرێ پێشنیاری سیاسی یا تیۆری سیاسی ئارنت لە چوارچێوەی کۆماریخوازی کلاسیکدا دەستەبەندی بکرێت. هەر بۆیە گەلێك کەس ئەویان بەلایەنگری تیۆری کۆماریخوازیی کلاسیك زانیوە.

مودێلی کۆماری کلاسیك (یۆنانی کۆن) لەگەڵ لیبرالی هاوچەرخدا جیاواز بوو. لە کۆماری کلاسیکدا یەکەم، مافی دەنگدان یامافی هاوڵاتیبوون و بەشداری سنووردداربوو و دووهەم، ئازادی بە چەمکی ئازادی لیبرالی واتا ئازادی نێگەتیڤ و دەوڵەت سنووردار نەبوو. ئارنت حەزی لە هاتنی بەربڵاوی جەماوەر نەدەکرد بۆ گۆڕەپانی سیاسەت و ئەمەی بەزەمینەی سەرهەڵدانی پاوانخوازی دەبینی. ئارنت وەك توکویل، شیکاری دیموکراسی ئەمریکا، (٣) لە لادانی.... دیموکراسی مۆدێرن بەرەو تاکڕەوی، دیکتاتۆری زۆرینە و رەشۆکی بوون نیگەرانی بوو.

بەم حاڵە کە ئارنت زەمینەی سووڕانەوەی لە مۆدێلی شۆڕشی فەرەنسادا بەرەو پاوانخوازی بەدی دەکرد لە نووسینەکانی خۆیدا لایەنگریی لە شۆڕشی ساڵی ١٩٦٥ هەنگاریا دەکرد کە بووە هۆی دروستبوونی شووراکان لەو وڵاتەدا، هەروا لایەنگریی لە هزرەکانی رۆزا لۆکسمبۆرگ دەکرد لەمەڕ شووراکان و ستایشی دەکرد. هەندێ لە راڤەکاران لە کۆی ئەمانە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە کە ئارنت لایەنگری جۆرێك لە حکوومەتی شوورایی بووە کە تێیدا نوخبە سیاسییەکان و ئەو





کەسانەی کە پابەندن بە قازانجی گشتی رۆڵی رێنمایی و رێبەرایەتی کاروبارەکانیان لە ئەستۆدابێ. هەڵبەت ئەم نوخبانە بە دەنگی خەڵك هەڵدەبژێردرێن[٤].

گەلێك کەس پێشنیاری سیاسی ئارنتیان لەگەڵ بۆچوونی نوخبەگەرایی بە هاوئاراستە زانیوە. ئارنت دەیویست کەسانی رەسەن، پابەند بەکاروباری گشتی و ئامانجی ئازادی و هۆگری کۆمەڵگاو جیهان لە پۆستی سیاسەتمەداردا بەرێوەبردنی کاروبارەکانیان لە دەستدابێ. تێڕوانینی نوخبەگەرایانەی ئارنت لەم خاڵەشدا رەنگ دەداتەوە کە ئەو ئازادی تەنها لە پێوەندی لە نێوان تاکە یەکسانەکاندا بە مەیسەر دەزانی و لەو باوەڕەدا بوو کە هەرگیز ناکرێ یەکسانی سیاسی لە نێوان هەمووان‌دا پەرەی پێبدرێت [٥].

## هەڵسەنگاندنی کۆماریخوازیی ئارنت

بەم ئەدگارانە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە ئەو حکوومەتەی کە ئارنت مەبەستیەتی، جۆرە کۆمارێکی فیدراتیڤی شوورایی یافیدارسیۆنی شوورا سەرانسەرییەکانە کە نموونەی نەزۆکی لە یەکێتی سوڤیەتدا پیادەکرا، بەم جیاوازییە کە لەسەر رووی شووراکانەوە یا پلە جۆراوجۆرەکانی خوارەوە (شوورا ناوچەییەکان) تاسەرەوە (شوورا سەرانسەرییەکان لە لەسەر ئاستی وڵات) سیاسەتمەدارە شارەزاکان وەك جۆرە ئاریستۆکراسییەك راوەستاون. بەم جۆرە ئەو حکوومەتەی کە ئارنت مەبەستەیەتی لە لایەکەوە شوورایییە و لە لایەکی تریشەوە بە پێوەرەکانی ئەمڕۆ نوخبەگەرایانەیە. بەڵام جگە لە رەهەندی نوخبەرگەرایی رەخنەیەکی گرنگتر کە لە کۆماریخوازیی و سەرجەم تیۆری سیاسی ئارنت گیراوە بۆ بنەما فەلسەفییەکانی دەگەرێتەوە. هەروەك هابرماس (وێڕای ستایشکردنی بەرچاوڕوونی ئارنت لە شیکردنەوەی پێوەندی دیموکراسی جەماوەری لەگەڵ پاوانخوازی) دەڵێ تیۆری ئارنت لەمەڕ دەوڵەت زۆر لەوە ساویلکانەترە کە بتوانین بە جدی وەریبگرین. ئارنت



خوازیاری دەوڵەتێکە کە کاری بەسەر پرسە کۆمەڵایەتییەکانەوە (هەژاریی، یەکسانی ئابووری، بەختەوەری گشتی) نەبێ و خەم لە بەرێوەبردنی پرسە کۆمەڵایەتییەکان نەخوات. ئەو سیاسەتەی کە ئارنت مەبەستیەتی ئەو سیاسەتەیە کە گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی لەبەردەمدا نەبێت. بەڵام، هەروەك هابرماس جەخت دەکاتەوە، ئەم هزرەی کە دەتوانین سیاسەت لە پرسە کۆمەڵایەتییەکان جیابکەینەوە هزرێکی نەکردەنییە و شیاوی تێگەیشتن نییە. لە راستیدا ئارنت بۆ پرس و گرفتەکانی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ رێگاچارەی بنچینەیی بەدەستەوە نەداوە[٦].

جیاکردنەوەی تاکەکانی خاوەن رۆحییەی گشتی لە تاکەکانی خاوەن رۆحییە تایبەتی و سپاردنی کارەکان بە دەستی گرووپی یەکەم چارەسەری پرسەکانی کۆمەڵگای ئەمڕۆ ناکات. پرسی کۆمەڵگای ئەمڕۆی ئێمە ئەوەیە کە هەلومەرجی توێژبەندی کۆمەڵایەتی ئێستا بگۆڕین، کە زۆر بە چڕی کۆمەڵگای بۆ سەر دوو جەمسەری هەژار و دەوڵەمەند و توێژە خۆشگوزەران و بێبەشەکان دابەشکردووە، تا ژمارەیەکی بەربلاو تر لە توێژەکانی خەڵك بتوانن لە سیاسەتدا بەشداریبکەن.





**یادداشتەکان:**

١- منصور انصاری، هانا أرنت و نقد فلسفه سیاسی، تهران، نشر مرکز، ١٣٧٩، ص ١٦.

٢- مایکل لسناف، فیلسوفان سیاسی قرن بیستم، ترجمه خشایار دیهیمی، نشر کوچك، ص ١١٣.

٣- لی برشا، فلسفه سیاسی هانا أرنت، ترجمه خشایار دیهیمی، تهران، طرح نو، ١٣٨٠، ص ٩٠.

٤- الکسی دوتوکویل، تحلیل دموکراسی درأمریکا، ترجمه رحمت مقدم مراغەای، تهران، انتشارات زوار، ١٣٤٨.

٥- لی برشا، ص ١٠١.

٦- همان، ص ١٠٢.



## پاژی دوازدەهەم

# دیموکراسی پلورالی

یەکێك لەو چەمکانەی کە بە تایبەت لەم دوو سێ دەیەی دواییدا لە باسە سیاسییەکانی پەیوەست بە دیموکراسی هاتۆتە ئاراوە چەمکی ((فرەیی)) (Pluralism)ە. پلورالیزم لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان سێ بواری پلورالیزمی مەعریفە ناسانە، پلورالیزمی کۆمەڵایەتی و پلورالیزمی سیاسی دەگرێتەوە. ئەم سێ بوارە لە هەمانکاتدا بە یەکترەوە گرێدراون، بەو واتایەکە پلورالیزمی مەعریفەناسی باس لە راستی و رەوایی چەند لایەنە لە ناسینی ئێمە دەکات، پلورالیزمی کۆمەڵایەتی باس لە فرەیی لە گرووپبەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەکات و پلورالیزمی سیاسی باس لە پێگەی گرووپ و ئەنجومەنە جۆراو جۆرەکان دەکات لە دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی و بەڕێوەبردنی سیاسی کۆمەڵگادا. لەم پاژەدا ئێمە دەڕوانینە بابەتی فرەیی لە سیاسەتدا بە تایبەت تائەو جێگایەی کە باس لە پێوەندی نێوان ئەم چەمکە لەگەڵ هزری دیموکراسیدا دەکات.

پلورالیزمیش بۆ خۆی بەسەر دوو رەوتی جیاواز دابەش دەکرێت کە یەکەمیان بە ((پلورالیزمی کلاسیك)) یا ئاسایی و ئەویتر بە ((پلورالیزمی رادیکاڵ)) ناوبانگیان دەرکردووە. ئێمەش بە پەیڕەوکردنی ئەم دابەشکردنە لە دووباسی جیاوازدا پلورالیزم دەخەینە بەر تویژینەوە. هەر دووباسەکەش بە ئاماژەکردن بە دیدگای مەعریفەناسی، دیدگای کۆمەڵایەتی و دیدگا سیاسییەکانی پلورالیزم بەرەو پێشەوە دەبەین.





### أ) پلوراليزمی كلاسيك

پلوراليزمی كلاسيك یائاسایی پێشینەیەكی درێژ تری هەیە و لەگەڵ دیدگا جۆرا و جۆر و كۆنترەكان و لەوانەش ئەو دیدگایانەی كە لە دابەشكردنێكی گشتیدا لە ژێر ناونیشانی ((مۆدێرن)) دیاردەكرێن لە پێوەندیدایە. پلورالیزمی رادیكاڵ لە راستیدا لەگەڵ تیۆرییەكانی ناسراو بە پۆست مۆدێرن لە پێوەندیداییە.

چاكتروایە سەرەتا ئاماژەیەكی گشتی تر بكەین بە واتاو بانگەشەكانی پلورالیزم، ئینجا هەندێ روونكردنەوە دەربارەی ژمارەیەك لە بۆچوونە سەرەكییەكانی پلورالیزم بخەینە پێش چاو.

### واتای پلورالیزم (فرەگەرایی)

پلورالیزم لە بەرامبەر زاراوە و تێڕوانینێكی تردا رادەوەستێ كە بە ((یەك لایەنگەرایی)) monism ناودەبرێ. واتای سەرەكی پلورالیزم لە پێشەوە بوونی فرە لایەنییە بەسەر تاك لایەنیدا و لە پێشەوە بوونی پرەنسیپی جۆراو جۆرییە لە بەرامبەر یەكجۆریدا لە توێژینەوە مرۆییەكان و لە جیهانی تیۆریدا.

پلورالیزم دژایەتی وێناگەلێكی وەك یەكە، ماددە، راستی، مێژوویی، خەڵك، دەوڵەت، دادپەروەری، خێری هاوبەش و چەمك گەلێكی لەم جۆرە دەكات و نكۆڵییان لێدەكات كە لەوێناكردنی پرسەكانی جیهان و هزردارێژی دەربارەی ئەوان وەك پشت و پەناگەی تیۆری كەڵكیان لێوەردەگیرا[1].

پلورالیزم هەم رەهەندی وەسفكردنی هەیە و هەم رەهەندی راڤەكردن و هەم رەهەندی پێشنیاركردن. خاڵی دەستپێكی پلورالیزم ئەمەیە كە كۆمەڵگا لەگەڵێك گرووپ پێكهاتووە كە هەریەكەیان بەرژەوەندی هێزی تایبەت بە خۆیان هەیە و



بەهۆی ئەم بەرژەوەندی و هێزانە لەگەڵ یەكتر لە كێشمەكێشدان (رەهەندی وەسفكردن). لێكۆڵینەوەی كۆمەڵگا لە بنەڕەتدا دەبێ لەسەر بنەمای ناسینی گرووپە پێكهێنەرەكانی كۆمەڵگا، قازانجەكانیان، خاڵە ناكۆكەكانیان و ئاستی هێزی هەریەك لەوانەبێت بە مەبەستی شیكردنەوەی تێكەڵاویی ئەم گرووپانە (رەهەندی راڤەكردن).

جیاوازی و ناكۆكی ئەم گرووپانە، كە بە گرووپی هاوبەرژەوەندیی ناو دەبرێن، دەبنە هۆكاری خێر بۆ كۆمەڵگاو دەبێ لە رێكخستنی پرسە سیاسییەكانی كۆمەڵگا وەك خاڵی دەستپێكی سەرەكی كەڵكیان لێوەبگیردرێت (رەهەندی پێشنیار كردن).

### گرووپی هاوسوود

لە تیڕوانینی پلورالیستانە یەكەی بنەڕەتی شیكردنەوە گرووپی هاوسوودە ( Interest group). گرووپێكی هاوسوود بریتییە لەو خەڵكانەی كە بۆ بەرەوپێشبردنی قازانجی هاوبەشی خۆیان رێكخراون. چونكە شوناسی هەر گرووپێك قازانجی هاوبەشی ئەو گرووپە دیاریدەكات ئەو شتەی كە ئەولەویەت و رەهەندی شرۆڤەكاری هەیە جەختكردنەوەیە لەسەر قازانجی هاوبەشی هەرگرووپێك نەك ناسینی تاكەكان. بەوتەی یەكێك لە تیۆردارێژانی پلورالیزم گرووپێكی هاوسوود بریتییە لە وێناكردنێكی دیاریكراو لە تێكەڵاویی نەك تەنها كۆكردنەوەیەكی یەكە مرۆییەكان. تاك تەنها بەهۆی پەیوەست بوون بەو گرووپ و رێكخراو و ئەنجومەنانەی كە بەدوای قازانجێكدان دەتوانێ رۆڵێكی سیاسی كاریگەر بگێڕێت.

تێڕوانیی پلورالیستی لە لایەكەوە لە بەرامبەر تێڕوانینێكدا رادەوەستێ كە تاك بە یەكەی سەرەكی شیكردنەوە دادەنێ (لیبرالیزم) و لە لایەكی ترەوە لە بەرامبەر تێڕوانینێكدا رادەوەستێ كە پشت بە پێكهاتەی گەورەی (وەك چین لە ماركسیزم) و شتی گەورەتری وەك دەوڵەت، نەتەوە و خێری هاوبەش دەبەستێ. گرووپی هاوسوود





و ئەنجومەن وەك بەردی بناغەی بینایەی پلورالیزمن کە وەك ناوبژیوان لە نێوان تاك لە لایەکەوە و دەوڵەت/ نەتەوە لە لایەکی ترەوە رادەوەستێ.

کەوابوو لە تێڕوانینی پلورالیستیانەدا سیاسەت بەرەو ئەو ئامانجەیە کە چۆن لە کۆمەڵگایەکدا ئارامی و سەقامگیریی بپارێزێت کە پڕە لە کێشمەکێشی نێوان گرووپە هاوسوودەکان.

## مێژوو و پێشینەی پلورالیزم

ئەگەر چەمکی پلورالیزم لە مانا گشتییەکەی بەواتای چەند لایەنگەرایی لە بەرامبەر یەك لایەنگەرایی (مۆنیزم) لە بەرچاو بگرین پێشینەکەی لە بواری فەلسەفە بۆ یۆنانی کۆن، لەوانەش تیۆری وردیلەگەرایی دیموکریتۆس لە بەرامبەر تیۆری یەکەگەرایی پارمینیدۆس، دەگەڕێتەوە. لە چەرخی نوێ پلورالیزمی فەلسەفی لایبینیتس لە بەرامبەر یەکبوونگەرایی فەلسەفەی ئیسپینۆزا رادەوەستێ. بەڵام لە سەردەمێکی نوێتردا ئەمە برتراندراسل و ڤیلیام جەیمز بوون کە بەشێوەیەکی نوێ باسی فرەییان لە بەرامبەر یەکبووندا هێنایە ئاراوە. لە سەرەتایی سەدەی نۆزدەهەم هارۆڵد لاسکی زانای زانستە سیاسییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکان بە پشتبەستن بە فرەیی لە بەرامبەر نەریتی هیگڵیدا هەڵوێستی وەرگرت کە سێبەری کردبوو بەسەر شێوازی تێڕوانین بۆ دەوڵەتدا.

هارۆڵد لاسکی و پلورالیستەکانی لە جۆری ئەو هەوڵیاندا کە تۆژینەوەکانی خۆیان لەسەر ئاستی دەوڵەت کە گشتێکی گەورە بوو بۆ سەر ئاستی ئەنجومەنەکان، کۆمپانیاکان، و شێواز بەندییەکانی بچووکتری لەم جۆرە دابمەزرێنن.



ئەوان بەو جۆرە لە بەرامبەر گشتگەراییدا راوەستان کە نەریتێکی هیگڵی بوو. ئەوان بە تایبەت جەختیان لەسەر بێ بەهاکردنی هزری دەوڵەت دەکرد لە زانستی سیاسەتدا[٢]. پلورالیزم پاش تێپەڕکردنی قۆناغە سەرەتاییەکان سەرئەنجام لە نووسینەکانی رۆبرت داڵ زانای هاوچەرخی ئەمریکی لە راستیدا بووە تۆژینەوەی شێوازە بەندییەکانی گرووپە هاوسوودەکان و پەسندکردنی ئەم گرووپانە وەك مەرجی بەرایی دیموکراسی رکابەریی.

## تەوەرەکانی تیۆری سیاسی پلورالیزم

پلورالیزمی کلاسیك لەسەر ئەم بانگەشە و گریمانانەی خوارەوە بنیات نراوە:

١- کۆمەڵگای پیشەسازی کۆمەڵگایەکە کە لە رێگای پێشکەوتنە تەکنیکییەکان و دابڕانی کۆمەڵایەتی گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز لە فرەیی گرووپەکان و گەشەکردنی وشیاری.

٢- ئەو گرووپ بەندییە فرە رەنگانەی کە بەهۆی ئەم پێشکەوتنانەوە سەریانهەڵداوە بوونەتە یەکەی سەرەکی کردار و کۆمەڵگاخوازی سیاسی. ئەم گرووپە بچووك و بە ژمارە زۆرانە لەگەڵ ئەو پێکهاتەیەی کە کۆمەڵناسان و لەوانەش مارکسییەکان تا ئێستا دەیانگوت جیاوازن. ئەم گرووپانە خاوەن بەرژەوەندی لە پێش دارێژراو نین بەڵکو بە هەڵسوکەوت و لێکگیربوونی بەرژەوەندییەکان لەگەڵ یەکتردا شکڵدەگرن.

٣- دەوڵەت شتێك نییە جگە لە زنجیرەیەك کرداری حکوومەتی بۆ بەرپاکردنی هاوسەنگی لە نێوان گرووپە رکابەرەکاندا.





٤- هاوڵاتیان بە کەڵك وەرگرتن لە فەرهەنگی شارستانی دیموکراتی لە گۆڕەپانی بەشداری سیاسیدا ئامادەییان هەیە. لە راستیدا نزمبوونی ئاستی بەشداریکردنی خەڵك لە دیاریکردنی ئەو کەسانەی کە دامەزراوە سیاسییەکان بەڕێوەدەبەن گرنگ نییە و رەنگە قازانجیشی هەبێت.

٥- لە بەڕێوەبردنی سیاسی کۆمەڵگا لە بری دارِشتنی ئایدۆلۆژیا دەبێ پشت بە تۆژینەوەی ئەزموونی ببەسترێت.

## قازانجەکان

یەکێك لە چەمکە گرنگەکانی پلورالیزمی سیاسی چەمکی سوود یا قازانجە. سوودو رەهەندە زەینییەکەی واتە هەڵوێست یا تێڕوانین (Attitude) بنەمای شکڵ گرتنی گرووپە هاوسوودەکانە وەك ژووری بازرگانی، یەکێتییە کرێکارییەکان، رێکخراوی خاوەن کارەکان، رێکخراوە ئەتنی و ئایینییەکان، کۆمیتە ناوچەییەکان، ئەنجومەنە جۆرا و جۆرەکان و بەبنەمای پێکهاتنی ئەم جۆرە رێکخراو و ئەنجومەن و پێکهاتانە لە قەڵەمدەدرێت. هەریەك لەمانە گرووپێك لە خەڵك لە خۆدەگرنە کە بۆ بەرەو پێشبردنی قازانجی خۆیان کۆبوونەتەوە و پێکەوە بە دوای قازانجە هاوبەشەکاندا دەگەڕێن.

ئەم گرووپانە لە رووی ((قازانجە راستینەکانیشەوە)) رەوتێکی هاوبەشیان هەیە.

## دەسەڵات (هێز)

لە پێناسەی یەکێك لە لایەنگرانی تیۆری پلورالیزم دەسەڵات بریتییە لە ئاستی توانایی ئەکتەرێك بۆ گۆڕینی وێنای هەڵسوکەوتی ئەکتەرێکی تر. رۆبرت داڵ



یەکێك لە تیۆرداڕێژانی پلورالیزم بە پەسندکردنی ئەم پێناسەیە بۆ تەواوکردنی ئەوەش زیاددەکات کە دەبێ دەسەڵات بەو هێزە بزانین کە بەسەر تاك و گرووپەکانی تردا دێت تا چاریان بکات بە ئەنجامدانی کارێك کە لە حاڵەتی نەبوونی ئەو هێزەدا ئەو کارەیان نەدەکرد[٣]. پلورالیستەکان کۆمەڵگا بە گۆڕەپانی تێکەڵاویی ئەو گرووپانە دەزانن کە هەریەکەیان قازانجی جیاواز و دەسەڵاتی جیاوازیان هەیە و ئەم قازانج و دەسەڵاتانە لەگەڵ یەکتردا تووشی پێکدادان دەبن و هەر یەکەیان بە گوێرەی ئەو هێزەی کە هەیەتی قازانجەکانی خۆی بەرەو پێشەوە دەبات، رێك هەر بەو جۆرەی کە لە فیزیای گالیلۆ تەنەکان بەپێی خێرایی، قورسایی و رێرەوی جووڵەیان کارتێکردن و کارتێکەرییان بەسەر یەکترەوە هەیە و کاریگەری لەسەر یەکتر دادەنێن.

ئەم وێنەیە لە دەسەڵات زۆر ساویلکانەیە بە تایبەت لەو رووەوە کە سەرچاوەکانی پێکهاتەی دەسەڵات لەبەرچاو ناگرێت. بۆ وێنە لە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان راستی زاڵبوون بەسەر هەندێ سەرچاوەی دارایی (لە کۆمەڵگای سەرمایەداری) یا ئیمتیازی چینایەتی (لە کۆمەڵگای پێش سەرمایەداری) سەرچاوەی دەسەڵاتە. پلورالیستەکان لە لێکدانەوەکانی خۆیاندا ئەم پرسانە رەچاوناکەن.

گریمانەی ئەوان ئەوەیە کە لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا سەرچاوەکانی دەسەڵات ئەوەندە زۆر، فرە رەنگ و پەراگەندەن کە تێبینییە پێکهاتەییەکان رەتدەکاتەوە.

## دەوڵەت لە تیۆری پلورالیستەکان

پلورالیستەکان کە بەگشتی وشەی دەوڵەت (State) لەگەڵ وشەی حکوومەت بەشێوەیەکی یەکسان بەکاردەهێنن یەك بۆچوونیان لەو بارەیەوە نییە. بەگشتی دەتوانین بڵێین کە پلورالیستەکان سێ تێگەیشتنی جیاوازییان لە دەوڵەت هەیە:

١- هەندێك لە پلورالیستەكان حكوومەت بە گۆڕەپانێك وەسفدەكەن كە مشتومڕەكانی بواری كۆمەڵگا تێیدا ڕەنگدەداتەوە.

٢- گرووپێكی تر دەوڵەت یا حكوومەت وەك ((دادوەرێك)) دەناسێنن كە دێتە ناو گۆڕەپانەكەوە بۆ چارەسەركردنی كێشمەكێشەكان و بەرگری لێكردنیان بۆ ئەوەی كە نەبنە ئاژاوە.

٣- گرووپی سێهەم لە پلورالیستەكان دەوڵەت بە یەكێك لە گرووپەكانی هاوسوودەكان دەناسێنن.

ڕۆبرت داڵ، هارۆڵد لاسویل و ئابراهام كاپلان لەو پلورالیستە بەناوبانگانەن كە كاری تایبەتی حكوومەت بەوە دەزانن كە بەهۆی ڕێسا و دامەزراوە پێوەندیدارەكانەوە بەڕێوە بەرایەتی كێشمەكێشەكان بكات. ئەوان دەڵێن كاتێك كە دوو یا چەند گرووپی هاوسوود لەو ڕەوشەی كە لە ئارادایە نارازین بەجۆرێك كە نارەزایی ئەوان مەترسی ناسەقامگیریی دروستدەكات پرۆسەی سیاسەت دەكەوێتە كار تا هاوسەنگییەكی نوێ دروستبكات بۆ پاراستنی سەقامگیریی.

پرسیارێك كە لێرەدێتە ئاراوە ئەوەیە كە حكوومەت لەسەر بنەمای چ ڕێسایەك چارەسەری كێشمەكێشەكان دەكات؟ یا بە وتەیەكی سادەتر ئەم ڕێسایانە لە كوێوە هاتوون؟ پلورالیستەكان لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێن كە ئەم ڕێسایانە بەهۆی ئەكتەرانی سیاسییەوە دەخولقێن. بەڵام ئەم ئەكتەرە سیاسییانە چ كەسانێكن؟ وەڵامەكەی ئەمەیە خودی گرووپە هاوسوودەكان. گرووپە هاوسوودەكان وێڕای كێشمەكێش و هەڵسوكەوت ڕێساكان ڕێكدەخەن.

بەڵام لە بەرامبەر ئەم وەڵامەدا پرسیارێكی تر دێتە ئاراوە  ئەویش ئەوەیە كە چ ڕوودەدات ئەگەر بێت و بەهێزترین گرووپە هاوسوودەكان ڕێسا و دامەزراوەكانی كۆمەڵگا بەپێی قازانجەكانی خۆیان ڕێكبخەن؟ ئەو شتەی كە گەلێك لە



ڕەخنەگرانی چەپ بانگەشەی بۆ دەكەن و لە ڕاستیدا وایە. پلورالیستەكان نكۆڵی لەم ئەگەرە ناكەن. ڕۆبرت داڵ باس لە چەند فاكتەرێك دەكات كە پێش بەسەر هەڵدانی ئەم مەترسییە دەگرن. لەو فاكتەرانەش دەتوانین ئاماژە بە چەند فاكتەرێك بكەین وەك ئاستی بەرزی گەشەكردنی ئابووری، فەرهەنگی سیاسی لەبار بۆ فرەیی، گەشەكردنی شارنشینی، فرە جۆری پیشەكان، فرەیی گرووپەكان و هەندێ فاكتەری دیكەی لەم جۆرە. ئەمانە ڕێگا نادەن كە دیموكراسی ببێتە دەسكەلای هەندێ قازانجی تایبەتی و ڕێساكانی یاری دیموكراسی بەهۆی هەندێ قازانجی تایبەتییەوە پێشێلبكرێت. ئەگەر دەوڵەت وەك دادوەریش لەبەرچاو بگرین هەمدیسان فاكتەرەكانی سەرەوە نابنە بەربەستی كەڵكوەرگرتنی نابەجێی دەسەڵاتدارانی حكوومەت لە ڕێساكان و گۆڕینی ئەو ڕێسایانە بە قازانجی خۆیان.

## بەڵگە ئەزموونییەكان بۆ ڕەتدانەوەی بانگەشەی پلورالیستەكان

پلورالیستەكان هەمیشە شانازیان بەوەوە كردووە كە پابەندن بە لێكۆڵینەوە ئەزموونیەكان و بەڵگە بینراوەكان و سەرنجیان نەداوەتە سەر ئەو باسانەی كە خاوەن ناوەڕۆكی ((ئایدۆلۆژیا))ین. بەڵام لێكۆڵینەوەكانی تۆژەرێك بەناوی (رایت میلز) لەمەڕ نوخبەكانی دەسەڵات لە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ئەم بانگەشانەی پلورالیستەكان ڕەتدەكاتەوە، رایت میلز لەم لێكۆڵینەوەیەدا دەگاتە ئەو ئەنجامە كە لە ولاتە یەكگرتووەكان دەسەلات لە بندەستی گرووپێكی كەمدا كۆبووەتەوە.

هەندێ لە ڕەخنەگرانیش وتوویانە كە بۆچوونی پلورالیستەكان وێنەیەكە لە یاری گرووپەكانی گوشار كە نزیكەی ٩٠٪ خەڵك ناتوانن بەشداری تێدابكەن.

خودی ڕۆبرت داڵیش وەك یەكێك لە دیارترین كەسایەتییەكانی پلورالیستی لە كتێبەكانی دواتری خۆیدا و لەوانەش لە كتێبی ((دیباجەیەك بۆ سەر دیموكراسی

ئابووری»ە (١٩٨٥) دانی بەوەدا ناوەکە مولّکداریّتی و کۆنترۆڵ بەسەر کۆمپانیاکان وەك سەرچاوەیەکی ئابووری سەرچاوەی گەلێك نایەکسانی سیاسییە. ئەم نایەکسانیانە دەبنە هۆی نایەکسانی لە بوارەکانی سامان، داهات، ئاست، شارەزاییەکان، کۆنترۆڵی زانیاری و پڕۆپاگەندە و دەستڕاگەیشتن بە ڕێبەرانی سیاسی و کاریگەرییان دەبێت لەسەر هەلی بەشداریکردن و توانای بەشداریکردنی هاوڵاتیاندا.

### ب ) پلورالیزمی رادیکاڵ و بۆچوونە پۆست مۆدیرنەکان

ژمارەیەك لە تیۆردارێژان لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم خوێندنەوەیەکیان لە پلورالیزم و دیموکراسی پلورالیستانە خستۆتە روو کە بە پلورالیزمی رادیکاڵی ناودەبرێت. پلورالیزمی رادیکاڵ هەم لەسەر بنەمایەکی فەلسەفی و مەعریفەناسی نوێ بنیاتنراوە و هەم خاوەنی هەندێ بۆچوونی سیاسی نوێیە کە لەگەڵ بۆچوونە پلورالیستییەکانی کلاسیکدا جیاوازە و بە گشتی پێوەندی بە تەوژمی چەپی سیاسییەوە هەیە. پلورالیزمی رادیکاڵ لە رووی بنەمای فەلسەفی مەعریفەناسییەوە لەگەڵ بۆچوونەکانی پۆستمۆدێرن لە پێوەندیدایە لە کاتێکدا لە شیکردنەوەی پێوەندییە سیاسییەکان لەگەڵ هەمان گریمانەکانی پلورالیزمی کلاسیك وەك فرە گرووپی، گرووپە هاوسوودەکان، ململانێ لە نێوان گرووپە هاوسوودەکان و کاریگەرییان لەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا هاوڕایە. بەڵام پلورالیستە رادیکاڵەکان وێڕای پەسەندکردنی ئەم گریمانانە لە هەمانکاتیشدا جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکەنەوە کە ململانێ نە تەنها راستیەکی ناچارانەی ژیانی سیاسییە بەڵکو هەوڵدان بۆ بە ئۆرگانیزە کردنی ئەو لەناو فەرهەنگ، هەڵسوکەوت و دامەزراوە دیموکراتییەکان رێگای سەرەکییە بۆ پاراستنی دیموکراسی لە بەرامبەر تاکڕەویدا.



### دیموکراسی لیبرال و دیموکراسی رادیکال

پلورالیستە کلاسیکەکان لە پێشنیارە سیاسییەکانی خۆیاندا لە کۆتاییدا دەگەنە ئەو ئەنجامە کە سیستەمی لیبرال دیموکراسی شێوازێکی لە بارە بۆ هاوسەنگ کردنی بەرژەوەندی گرووپە جۆراوجۆرەکان و چارەسەرکردنی ململانێ نێوانیان. بەم جۆرە پلورالیستە کلاسیکەکان و لیبرال دیموکراتەکان لە رێگا جۆرا و جۆرەکانەوە دەگەنەوە یەك خاڵ کە ئەویش خوازراو بوونی سیستەمی لیبرال دیموکراسییە. لیبرال دیموکراتەکان بەهۆی پرەنسیپی گەڕان بە دوای خۆشی تاکەکەسی و پلورالیستەکان بەهۆی پرەنسیپی گەڕان بە دوای قازانجی کۆمەڵ لەسەر ئاستە بچووکەکان (نەك ئاستە گەورەکانی وەك چین یا جیاوازی بیر و بۆچوونی پلورالیستە کلاسیکەکان لەگەڵ لیبرال دیموکراتەکان (جگە لە خاڵی دەستپێك) لە رووی پێشنیارە سیاسییەکانەوە لە ئەنجامدا دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی هاوسەنگی لە نێوان دوو رەگەزی سەرەکی لیبرالی و دیموکراتی لە پێکهاتەی سیستەمدا. هەروەك گوتمان لەم حاڵەتەدا هەندێك پتر جەخت لەسەر رەهەندی لیبرالی سیستەم دەکەنەوە و هەندێکی تر لەسەر رەهەندە دیموکراتییەکەی لە ئەنجامدا بۆچوونی لیبرال دیموکراسی لەسەر تەوژمی راست-چەپ جێگۆڕکێ دەکات. بەهەرحاڵ پرسی پلورالیستە کلاسیکییەکان و لیبرال دیموکراتەکان دۆزینەوەی باشترین شێوازی هاوسەنگییە لە نێوان هەردوو رەگەزی لیبرالی و دیموکراتی لە سیاسەتدا.

بەڵام بۆ پلورالیستە رادیکاڵەکان گەڕان بەدوای هاوسەنگی و پێوەندی لە نێوان ئەم دوو رەگەزە بۆ رێکخستنی سیستەمی سیاسی لە راستیدا بێ واتایە، چونکە خودی ئەم بوارە بابەتی مشتومڕە. بەپێی بۆچوونی پلورالیستە رادیکاڵەکان ململانێی کۆمەڵایەتی و سیاسی رەهەندی سروشتی کۆمەڵگایە. ململانێ خودی پێکهاتەی رێکخەری کۆمەڵگاش دەگرێتەوە.





لە روانگەی پلورالیستە کلاسیکەکانەوە دەسەڵات شتێکە کە لە قۆناغی یەکەمدا پێوەندی بە گرووپە هاوسوودەکانەوە هەیە و ئەم گرووپانە بۆ بەرەو پێشبردنی بەرژەوەندی خۆیان (کە ئەم بەرژەوەندییانە لە هەمانکاتدا پێناسەشیانە) کەڵك لەم دەسەڵاتە وەردەگرن. بەڵام بۆ پێشگرتن لە رۆڵی تێکدەرانەی ململانێ بەشێك لە دەسەڵات بۆ حکومەت دەگوێزرێتەوە تا بۆ پاراستنی ئاشتی و ئارامی کەڵکی لێوەربگرێت. لەم دیدگایەوە دیموکراسی ئامادەکارییەکە بۆ رێکخستن و رێسامەندکردنی ململانێکان و پێشگرتن لە کەڵك وەرگرتنی نابەجێی هەندێ لە گرووپەکان لە دەسەڵاتی حکوومی. بەڵام بەپێی لێکدانەوەی پلورالیستە رادیکاڵەکان دەوڵەتی دیموکراتی پێگەیەکی تەواو نوێ بۆ دەسەڵاتی سیاسی دروستدەکات کە لە چاو دەوڵەتە نادیموکراتییەکاندا لە رووی چۆنیتییەوە جیاوازە. ئەم پێگە تازەیە بریتییە لەو فەزا بەتاڵەی کە ململانێیەکە لەسەر شێوازی پڕکردنەوەی ئەو لە ئارادایە. دەوڵەتە نادیموکراتییەکان زنجیرەیەك دۆگمای لەمەوپێش دارێژراوە بەسەریاندا زاڵە. بۆ وێنە لە سەردەمی پێش مۆدێرن ئەرکی دەوڵەتیان بەڕێنمایی کردنی خەڵك بەرەو رزگاری (دنیا و ئاخیرەت) پێناسە دەکرد. یاهەر بەم شێوازە فاشیستەکان شکۆمەندی دایکی نیشتمان و کۆمۆنیستەکان کۆمەڵگای خۆشگوزەرانی بێ چینیان وەك دۆگمای لەمەوپێش دارێژراو دەخستە بەردەمی دەوڵەت. کۆی ئەم جۆرە تێروانینە بۆ دەوڵەت تێروانینێکی نادیموکراتییە. دەوڵەتی مۆدێرن نابێ ئامانجێکی لەمەو پێش دارێژراو بۆ کۆمەڵگا دیاریبکات.

مانای ئەم وتەیە ئەوەیە کە لەسەر هەر جۆرە ئامانجێك کە کۆمەڵگا دەبێ بە دوایدا بگەرێت رکابەری و ململانێ لە ئارادایە. هەر لە ئەنجامی ئەم رکابەری و ململانێیە دەبێ ئامانجی کۆمەڵگاو شوناسی بەشداربووانی دروستبێت.





بناغەی پلورالیزمی کلاسیك لەسەر راڤەکردنی هێز لە ململانێ بنیاتنرابوو، وێڕای ئەوەش هێز تاکەکانی بە یەکەی ململانێ دادەنا لە کاتێکدا کە پلورالیستەکان گرووپە هاوسوودەکان بە یەکەی ململانێ دادەنێن.

پلورالیستی رادیکاڵ بەراشکاوی پشت بە چەمکی فەلسەفی پۆست مۆدێرنەکان و لەوانەش پۆست پێکهاتەگەراکان و کەسانی وەك ژان فرانسوالیۆتار، ژاك دریدا و مشیل فۆکۆ دەبەستێ. بەسەرنجدان بەو دەرفەتە کەمەی کە ئێمە لێرەدا هەمانە بۆ باسکردن لەمەڕ پۆست مۆدێرنیزم و پۆست پێکهاتەگەرایی هەر بۆیە لێرەدا تەنها ئاماژە بە هەندێ خاڵی گرنگ دەکەین لەمەڕ بەڵگەکانی تیۆرییە سیاسییەکانی ئەوان.

پۆست مۆدێرنیستەکان و لەگەڵ ئەوانیشدا پلورالیستە رادیکاڵەکان دژایەتی سەرجەم پرۆژەی رۆشنگەری و هزری رۆشنگەری دەربارەی سروشتی مرۆڤ و رێسا گشتییەکانی ژیان و ئەخلاق دەکەن. ئەوان بەتایبەت هەستان بە دژایەتیکردنی هەندێك لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی هزری رۆشنگەری وەك پێکهاتەگەرایی، عەقڵگەرایی، ((گێڕانەوە گەورەکان)) لە مێژوو و ((وێنە گەورەکان)) لە ژیانی کۆمەڵایەتی (کە هەموویان لە بنەماکانی دیدگای مۆدێرن بوون). ئەوان هەر لەسەر ئەم بنەما گەیشتنە هەندێ بەڵگەی نوێ و گریمانەی نوێ کە گرنگترینیان بریتین لە: فرە فەرهەنگی، فرە شوناسی، فرەیی ئەزموونە کۆمەڵایەتییەکان، تەنانەت فرەیی پێوەری راستی و حەقانییەتی ئەخلاقی و جوانناسانە.

ئەم بەڵگانە لەگەڵ بنەماکانی رۆشنگەری لە دژایەتی تەواودان کە باوەڕی بە عەقڵانییەت، پێشکەوتن، پێوەرە عەقڵانی و ئەخلاقییەکان بۆ راستی، دەرفەتی ئەندازیاری کۆمەڵایەتی و چارەنووسێکی گشتی بۆ مرۆڤ هەبوو. لەیەك وتەدا دەتوانین بڵێین کە تێڕوانینی پۆستمۆدێرن لە بری هاوسانی (لە سروشت و چارەنووسی مرۆڤ) پشت بە جیاوازی و جۆرا و جۆری دەبەستێ.





## ڕەوایی فرەیی

پلورالیستە رادیکاڵەکان بە پشتبەستن بە تیۆرەکانی لیۆتار هەڵدەستن بە رەخنەگرتن و نکۆڵی لێکردنی ئەو شتەی کە بە ((سەروو گێڕانەوەکان)) یا گێڕانەوە گەورەکان ناوی دەبەن. مەبەست لە سەروو گێڕانەوەکان ئەو وێنەیە کە هەندێ هزرڤانی وەك هیگڵ، مارکس یا کانت لە مێژوو، کۆمەڵگا، دەوڵەت و سیاسەت دەیخەنە روو. دیالێکتیکی عەقڵ لە فەلسەفەی هیگڵ، رزگاربوونی عەقلانییەت و مرۆڤایەتی بەهۆی چینی کرێکار لە فەلسەفەی مارکس، ئاشتی جیهانگیر لە تیۆری کانت کە لەبەرگی دووهەمدا ئاماژەمان پێکرد بە نموونە گرنگەکانی ئەم ((سەروو گێڕانەوە))یە دادەنرێن. ئەو شتەی کە پۆست مۆدێرنەکان بەسەروو گێڕانەوە ناوی لێ دەبەن رێبەری کردار و بۆچوونە لە گەلێك لە تیۆرییە سیاسییەکان لەوانەش دیموکراسی بەشدارانە کە لەمەو پێش باسمانکرد.

پۆست مۆدێرنسیتەکان لە بری ئەو بنەماو هێڵە گشتیانەی کە لە فەلسەفەکانی رۆشنگەرییەوە ئیلهام وەردەگرن جەخت لەسەر بگۆڕبوونی ئامانجە سیاسییەکان دەکەنەوە. پلورالیستە رادیکاڵەکان لە بانگەشەکانی خۆیاندا پشت بە تیۆری لیۆتار لەمەڕ ((یاری زمانی)) دەبەستن. لیۆتار بە پێچەوانەی هابرماس کە پشت بە رەهەندی هاوکاری زمان دەبەستێ پەنجە لەسەر رەهەندی ناکۆکی زمان دادەنێ و دەڵێ کە دەبێ زمان وەك مۆدێلی ململانێ لەبەرچاو بگرین نەك هاوکاری عەقلانی.

تیۆری لیۆتاریش بە نۆرەی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی زمانی پێوەندیدار بە لودویك ویتگنشتاین. ویتگنشتاین زمان بە یارییەك دەچوێنێ کە بە رێساکانی هەمان ئەو یارییە لە هەر جووڵەیەکی ئەو یارییە تێدەگەیت. ئەو دەڵێ هیچ رێسایەك لە سەرووی رێسا ناوخۆییەکانی ئەو یارییە نییە کە ئێمە بتوانین لەسەر ئەو بناغەیە رێساکانی یارییەکی دیاریکراو هەڵبسەنگێنین. پۆست پێکهاتەگەراکان ئەم تیۆرییە بۆ ناو پرسە سیاسییەکانیش فراواندەکەن و دەڵێن هەر وەك چۆن سەروو رێسایەك نییە بۆ





رووونکردنەوەی رێسای یارییەکان بەهەمان شێوەش پێکهاتەی یەکەیەکی گشتیش نییە کە خەڵك بە گەڕانەوە بۆ ئەو پێکهاتەیە ژیانی خۆیان مانابکەن. هەروەك چۆن ((یارییەکی زمانی)) پێوەری رەوایی تایبەت بە خۆیان هەیە بە هەمان شێوەش هەریەك لە جیهانە جیاوازەکانی مرۆڤەکان و فەرهەنگەکانیشیان پێوەری رەوایی تایبەت بە خۆیان هەیە.

## دەسەڵات وەك دروستکەری راستی

میشل فۆکۆش کە یەکێکی ترە لە هزرڤانانی سەر بە هزری مۆدێرنیزم دژایەتی ئەم هزرەی رۆشنگەری دەکات کەوا دەزانێ کە هەندێ راستی ئەخلاقی و زانستی گشتی هەن کە مرۆڤەکان دەبێ بیاندۆزنەوە و بۆ بەڕێوەبردنی ژیان بەکاریبهێنن و بەم جۆرە بەڵگە دەهێنینەوە کە راستی هەر ئەو شتەیە کە لە خزمەتی دەسەڵاتدایە و لە واقیعدا دەسەڵات راستی دروستدەکات. ئاخێزگەی ئەو گوتارانەی کە فۆرم بە ژیان دەبەخشن لە قۆناغی یەکەمدا دەسەڵاتە. پلورالیستە رادیکاڵەکان هاوئاراستە لەگەڵ ئەم بۆچوونەی فۆکۆ دەڵێن کە دەسەڵات وەك پێوەندییە دەرەکییەکانی نێوان دوو شوناسی لە پێش دارێژراودا نییە بەڵکو دەسەڵات خۆی دروستکەری شوناسە.

## هەڵسەنگاندی بانگەشەی پۆست مۆدێرنیزم

بانگەشەی هزرڤانانی پۆستمۆدێرنیزم لە ئاستی ناوەنجی خۆیدا لە لایەن گەلێك لە زانایانەوە پەسندکراوە. بەڵام پۆستمۆدێرنیزم بە چەمکە ((بە هێز))ەکەی کە هیچ هێڵێکی سوور پەسند ناکات و هەموو شتێك بەڕەوا دەزانێ سەرئەنجام تووشی رێژەگەرایی تەواو و پووچگەرایی (نیهیلیزم) دەبێ. ئەم بۆچوونە لە پۆست مۆدێرنیزم کە پشت بە بنەمای جیاوازی دەبەستی و دەیەوێ هەموو پیکهاتەو بنەماکان بەلاوە بنێت لە راستیدا هیچ بنەماو بنچینیەك ناهێڵێتەوە کە ئێمە بتوانین پشتی پێ ببەستین.

له لایەکی ترەوە پلورالیزم لەوێدا کە هەر جۆرە ((سەروو گێڕانەوەی)) و ((وێنەی گەورە)) (خستنەڕووی هەندێ چەمکی وەك دادپەروەری، خەڵك، خێری هاوبەش و ئەم جۆرەشتانە) رەتدەکاتەوە، بۆخۆی دەبێتە ((سەروو گێڕانەوە)) و ((وێنەیەکی گەورە)) و هەندێ دۆگمای نوێ دەخولقێنێ. کەوابوو بڕیاربوو دژبەوان خەباتبکات. (هەر ئەوەی کە دەڵێین ((هیچ سەروو گێڕانەوەیەك لە ئارادانییە)) بۆ خۆی سەروو گێڕانەوەیەکە).

## دیموکراسی ئەنجومەنی

پلورالیزمی رادیکاڵ وەك تەوژمێك بۆچوونی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێ. بەشێکی گرنگی پلورالیستە رادیکاڵەکان وێڕای ئەوەی کە دژ بە مارکسیزمن بەو لێکدانەوانەی کە لەمەوپێش باسمان لێوەکرد (چونکە رەنگدانەوەی سەروو گێڕانەوە و ناسێنەری یەك پێکهاتە یا یەك بنەمایە) لە هەمانکاتدا دڵیان بە هەندێ بۆچوونی نوێ لە سۆسیالیزم خۆشکردووە. ئەم پلورالیستانە خوازیاری لێکگرێدانی سێ کۆڵەکەی سۆسیالیزم، دیموکراسی و فرەیین. بەم جۆرە پلورالیستە رادیکاڵەکان، بە پێچەوانەی پلورالیستە کلاسیکەکان کە سەر بە کەمپی لیبرال دیموکراسین، پتر پێوەندییان بە بەرەی دیموکراتیزمی رادیکاڵەوە هەیە.

بەهەرحاڵ هزری ئەوان بۆ سازگارکردنی سوسیالیزم لەگەڵ دیموکراسی لە لایەکەوە و لەگەڵ بنەماکانی پلورالیزم لە لایەکی ترەوە ئەوان بۆ خستنەڕووی تیۆرییەکەی نوێ پاڵ پێوەدەنێ کە حەزی لە جۆرێك دیموکراسییە کە بە ((دیموکراسی ئەنجومەنی)) associative democracy بە ناوبانگە. فۆرمی دیاریکراوی ئەم دیموکراسییە هێشتا لە ناو لایەنگرانی ئەم تیۆرییانەدا بۆ خۆی بابەتی مشتومڕە. بەوتەیەکی کورت و سادە دەتوانین بڵێین کە ئەم دیموکراسییە پشت بەو ئەنجومەنانە دەبەستێ کە لە گرووپە هاوسوودەکان پێکهاتوون.



**یادداشتەکان:**


١- گرگورمك لنان، پیشین، ص ٦٣

2- Nelson poltsby, community power and political theory, New Haven, Yale University press, 1963.

3- Robert Dahl, Modern political Analysis, Englewood cliffs, prentice Hall, 1970.

4- Wright mills, the power Elite, London, Oxford University press 1956.

5- A preface to Economic Democracy, Berkeley, University of California press, 1985.






# پاژی سێزدەهەم

# ئایزایا بەرلین

## ژیان و بەرهەمەکانی بەرلین

ئایزایا بەرلین (١٩٠٩-١٩٩٨) لە (ریگا) کە لەو سەردەمە سەر بە رووسیا بوو لە دایکبوو. لە بنەماڵەکەیاندا بە هەر دوو زمانی رووسی و ئەڵمانی قسەدەکرا. پاش شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ بنەماڵەکەیان رووسیایان بەرەو ئەڵمانیا بەجێ هێشت. بەرلین بۆ خۆی لە ساڵی ١٩٢١ رۆیشتە ئینگلتەرە و لەوێ نیشتەجێ بوو، بەڵام پاشماوەی ئەندامانی بنەماڵەکەی بوونە قوربانی توندو تیژی نازییەکان و بە دەستی ئەوان کوژران. بەم جۆرە بەرلین بەشێوەیەکی تایبەتیش لە لایەن رەوتە پاوانخوازەکانەوە تووشی ئازار و زیان هات کە بە یەکێك لە دڵەڕاوکێ فەلسەفییەکانی ئەو دادەنرێت. بەرلین جگە لە چەند ئەرکێکی دیبلۆماسی بۆ دەوڵەتی بریتانیا نەبێ پاشماوەی تەمەنی خۆی بە وانە وتنەوە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد بەسەر برد. یەکەمین نووسینەکانی بەرلین کەمتر پێوەندییان بە سیاسەتەوە هەیە. نووسینەکانی دواتری ئەو کە بریتین لە هزرڤانانی رووس (١٩٧٨)، چەمکەکان و بابەتەکان: وتارە فەلسەفییەکان (١٩٧٨)، بە پێچەوانەی رەوت: کۆمەڵە وتارێك لەمەڕ مێژووی هزرەکان (١٩٧٩) و تێگەیشتنە تایبەتییەکان (١٩٨٠) لە ریزی ئەو نووسینانەدان کە پێوەندییەکی زیاتریان بە بواری سیاسەتەوە هەیە.



## بنەما هزرییەکانی ئایزایا بەرلین

ئایزایا بەرلین لەو هزرڤانە دیارانەیە کە باسێکی هەمەلایەنە و رۆشنگەرانەی لەمەڕ پلورالیزم هەیە و لەم بارەیەوە دامەزراوەیەکی تیۆری خوڵقاندووە. ناوەڕۆکی سەرەکی بەرهەم و هزرەکانی بەرلین رەخنەگرتنە لە بیر و بۆچوونە مۆنیستییەکان (یەکە خوازی) لە بواری ئەخلاق و سیاسەتدا. بەرلین بە رەخنەگرتن و نکۆڵی لێکردنی بنەما مۆنیستییەکان لە بواری ئەخلاق و سیاسەت دەگاتە تیۆری پلورالیزم بەپێی ئەم تیۆرییە بەهاکان نە تەنها زۆر و جۆراوجۆرن بەڵکو بەپێی سروشتی خۆیان نارێك و دژبەیەکن و لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ نابن. مرۆڤەکان هیچ چارەیەکیان نییە جگە لەوەی کە لە نێوان ئەم بەهاو خێرە رکابەرانەدا دەستەبژێری بکەن و هەڵبژاردنی هەر خێر یا بەهایەك بە واتای لە دەستدانی.... خێر یا بەهایەکی ترە کە لەگەڵ ئەمانەدا کۆناکرێنەوە.

بە بۆچوونی ئایزایا بەرلین مرۆڤ بوونەوەرێکە کە بەردەوام لە حاڵی گۆڕاندایە و هەرگیز شێوازێکی دیاریکراوی نییە. ناتوانین هیچ سروشتێکی گشتی و نەگۆڕ بۆ مرۆڤ لەبەرچاو بگرین. بە پێچەوانەی هزری باوی چەرخی رۆشنگەری ناتوانین ژیانی مرۆڤ بە ملکەچی هیچ سیستەمێکی هەمەگیر و یاسایەکی گشتی لەقەڵەمبدەین. وێناکردنی هۆکارێتی زانستی و یاسامەندبوونی رەوتی مێژوو لە خەیاڵێك بەو لاوە هیچی تر نییە. هیچ شتێك لە مرۆڤدا نەگۆر و خودی نییە. مرۆڤ بە هەڵبژاردنەکانی بەردەوام سەر لە نوێ خۆی دروست دەکاتەوە. (١) بەم هۆیە.... ئازادی هەڵبژاردن بناغەی ژیانی مرۆییە و دەبێ پرەنسیپی رێبەر بێت لە رێکخستنی ژیانی گشتیدا.

## فرەیی لە بەرامبەر یەکبووندا

رەهەندی دیاری هزری بەرلین رەتکردنەوەی مۆنیزم (تاکانەگەرایی) و بەرگریکردنە لە پلورالیزم. بەرلین وەك گەلێك لە هزرڤانانی گەورەی سیاسی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم خەریکی شیکردنەوەی ئەو رووداوە سەیر و سەمەرانە بوو کە بە درێژایی دەیەکانی ناوەڕاستی سەدە لە چوارچێوەی بۆلشیڤیزم و فاشیزم زەینی گەلێك لە زانایانی بە خۆیەوە خەریك کردبوو. بەرلینیش وەك گەلێك لەو هزرڤانانەی کە تا ئێستا باسمان لێوەکردووە بەشێوەی تایبەت بە خۆی کاردانەوەی بەرامبەر بەم رووداوانە هەبووە و رەخنەی لە بنیاتە هزرییەکانی ئەو رەوتە گرتووە. رەخنەگرتن لە فەلسەفەی سیاسی رۆژئاوا لە رێگای رەخنەگرتن لە گرنگترین رەهەندەکانی، وەك عەقڵگەرایی و ئۆبژکتیڤیزمی ئەخلاقی و بیر و بۆچوونە پێوەندیدارەکانی، لەوانەش بڕوامەندی بە ئامانجدار بوونی مێژوو، یاسامەندی پرۆسەکانی ژیانی مرۆیی و سازگاریی عەقڵانی و ئەخلاقی جیهانی مرۆیی لە گرنگترین دڵە راوکێیەکانی بەرلینن.

فەیلەسووفەکانی رۆژئاوا لە ئەفلاتوونەوە بگرە تا مارکس (و پاش ئەویش تا هابرماس) جیهانیان بە گشتێکی عەقڵانی و مێژوویان بە پرۆسەیەکی یاسامەند و ئامانجدار زانیوە. بەم جۆرە ئەم فەیلەسووفانە ژیانی مرۆیی و بزاڤی مێژوویان بە پێکهاتەیەکی عەقڵانی زانیوە کە شێوازگەلێکی ئەخلاقی سازگاریان هەیە و هەر بۆیە وایان زانیوە کە بەها جۆراوجۆرە مرۆییەکانی وەك ئازادی، چێژ، رزگاربوون، دادپەروەری و ....تەواوکەری یەکترن و لەگەڵ یەکتردا شیاوی کۆکردنەوەن. ئەگەر تا ئێستا لە کۆمەڵگای مرۆییدا ئەم خێرانە لەگەڵ یەکتردا کۆنەبوونەتەوە دەبێ لە کەموکوڕی راستییە دەرەکییەکان بەدوای هۆکارەکەیدا بگەڕێین نەك لە ناسازگاربوونی خۆیی ئەم خێرانە. بەم جۆرە بە پشتبەستنە بنەما عەقڵانییەکان دەتواندرێ کۆمەڵگایەك دروستبکرێت کە تێیدا هەندێ خێری وەك ئازادی، یەکسانی، دادپەروەری، خۆشگوزەرانی و گەلێك لە ئیدیالەکانی تر لەگەڵ یەکتردا



کۆبکرێنەوە. بۆچوونی مارکس لەمەڕ ئەو کۆمەڵگای کۆمۆنیستیەی کە لە داهاتوودا دروستدەبێ بە نموونەی ئەم جۆرە هزرە دادەنرێت.

بەرلین ئەم هەموو بۆچوونانە کە لە رووخسارەکانی تیۆرانینی مۆنیستین بۆ سیاسەت و ئەخلاق هەر لە بنەڕەتەوە دەداتەبەر رەخنە و نکۆڵی لێدەکات و بەتەواوی رەتی دەکاتەوە و بەردی بناغەی تیۆرییەکی پلورالیستی هەمەلایەنە بنیاتدەنێت.

## فرەیی خێرو بەهاکان

بەرلین پاش رەخنەگرتن لە سەرەکیترین بۆچوونەکانی فەلسەفەی سیاسی رۆژئاوا لە سەردەمی رۆشنگەری بە تایبەت ئەو بۆچوونانەی کە باس لە یەکگرتنی هێزە رێنمایی کەرەکانی جیهان و ئاراستەدار بوونی مێژوو و ئامانجدار بوونی رەوتی ژیان دەکەن ئەم داوایە دەهێنێتە ئاراوە کە فرەیی و جیاوازی رەهەندی خۆیی ژیانە. سازگاری لە نێوان خێر و بەها مرۆییەکاندا نییە و ئەوان بە زۆری دژبەیەك و رکابەری یەکترن. بە دوا داچوونی یەکێکیان بەواتای چاو پۆشیکردنە لە ئەویتر. رەوشی زاڵ بەسەر جیهان رەوشێکی تراژیدیاییە واتە قوربانیکردنی هەندێ لە خێرەکانە بە نرخی بەدەستهێنانی هەندێکی تر. وێناکردنی ئەو کۆمەڵگایەی کە بتوانی ئەم خێرانەی تێدا سازگاربکەیت وێنایەکی یۆتۆپیاییە. هیچ پێوەرێکی گشتی نییە کە بتوانێ لە بەراورد کردن لە نێوان خێرە دژبەیەکەکان و بە باشتر زانینی یەکێکیان لە ئەویتر یان یارمەتی ئێمە بدات.

## رەخنە لە عەقڵگەرایی مۆنیستی

هزری رۆژئاوایی و بەگشتی هزری مرۆیی هەمیشە کۆمەڵگایەکی یۆتۆپیایی وەك کۆمەڵگایەکی تەواو سەیرکردووە، کۆمەڵگایەك کە مرۆڤ تێیدا دەگاتە رزگاری و





بەختیاری. کتێبە پیرۆزەکان، کۆماری ئەفلاتوون، ڕێنسانس و ڕۆشنگەری ئەوروپا هەریەك بە شێوازی خۆیان باسیان لە کۆمەڵگایەکی لەم جۆرە کردووە. بە چاوپۆشیکردن لەوەی کە بۆ گەیشتن بەم کۆمەڵگا یۆتۆپیاییە چ ڕێگایەکیان پێشنیارکردبێ بۆ وێنە پەیڕەویکردن لە وەحی، یا سروشت یا عەقڵی مرۆیی بەهەرحاڵ ئەم بۆچوونە ڕەهەندی دیاری سەرەکیترین ڕەوتە هزرییەکانی مرۆیی بووە. هەڵبەت لە هەندێ گۆشەی مێژووی هزردا قوتابخانەی وەهاش هەبووە کە بە جۆرا و جۆربوونی خوخدەی مرۆڤەکان و کۆمەڵگاکان بەپێی گۆنجان ئاماژەیان بە جۆراوجۆری بەهاو خێرەکان کردووە، بەڵام نفووز و پەرەسەندنی ئەوان لەچاو ئەو هزرانەدا زۆر کەم بووە کە خێری گشتییان وەك کەماڵ و تاکەڕێی ڕزگاری ناساندووە. ئایزایا بەرلین دیارترین هزرڤانی هاوچەرخە کە نە تەنها دژایەتی ئەو ڕوخسارە عەقڵگەرایانە و پێکهاتەگەرایانە دەکات کە لەو هزرانەی سەرەوەدا شاراونەتەوە بەڵکو تیژترین زمانیشە بۆ بەرگریکردن لە جۆراو جۆری و ئاشت نەبوونەوەی سروشتی خێر و بەهاکان. ناوەڕۆکی ناوخۆیی نەریتی هزریی ڕۆژئاوا ئەم هزرە بووە کە هەموو خێرە ڕاستەقینەکان لەگەڵ یەکتردا سازگارن. بەڵام بەرلین هەموو هەوڵی هزریی خۆی بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم دیدگا ریشەدارە (کە بە تێڕوانینی مۆنیستی ناوی دەبرد) چڕکردەوە. بەڕای ئەو ئەم هزرە لە بنەڕەتدا لە لۆژیکی هەڵسەنگێنەرانەی (قیاسی) ئەرستۆوە سەرچاوەی گرتووە کە دەڵێ لە سەرەتای دروستەوە دەگەینە گەواهی دانی دروست و هەر پرسیارێکی ڕەسەن پتر لەیەك وەڵامی دروستی نییە. نەریتی سوکراتی، نەریتی مەسیحی و نەریتی ئیسلامی هەموو لەم هزرە بنەڕەتییەدا هاوبەشن. بەرلین دژ بەم هزرە بەڵگە دەهێنێتەوە و دەڵێ نەتەنها خێرە جۆرا و جۆرەکانی وەك ئازادی، یەکسانی، خۆشگوزەرانی و ئەوانیتر لەگەڵ یەکتردا ناسازگارن بەڵکو هەریەك لەوانیش تەنانەت لەناو خۆیاندا فرەن و پڕن لە جۆار و جۆری و دژایەتی. بۆ وێنە لەناو ئەو شتەی کە بە ئازادی ناوی دەبەین هەردوو بەهای ئازادی زانیاری لەگەڵ ڕێزگرتن لە هەرێمی تایبەتی لەگەڵ یەکتردا ناسازگارن.یا پێوەندی



نێوان ئازادی و دادپەروەری پێوەندییەکی تراژیکە واتە هیچ چارەیەك نییە جگە لەوەی کە یەکێکیان بکەینە فیدای ئەویتر. لە ئەنجامدا هەندێك لە یەکێکیان بە بەهای لە دەستدانی هەندێکی تر لە ئەویتریان بە دەستدەهێنین [٢].

## جۆرا و جۆریی فەرهەنگی

خێر و بەهاکان نەتەنها لەناو هەر فەرهەنگێکدا جۆراوجۆرن و شیاوی هەڵسەنگاندن نین، بەڵکو جگە لەوەش خودی فەرهەنگەکانیش هەر بەم چەشنە جۆرا و جۆرن و شیاوی هەڵسەنگاندن نین. بەم جۆرە نە تەنها بەها و خێرەکان بەڵکو فەرهەنگەکانیش هەر بەو چەشنە فرەن. بەها مرۆییەکان بۆ هەر نەریتێکی فەرهەنگی بابەتێکی ناوخۆیی و تایبەت بەو فەرهەنگەن و ناتوانین ئەوان بکەینە بابەتی هیچ هەڵسەنگاندنێکی عەقڵانی. ناتوانین هیچ پێوەرێکی تێروتەسەلی وابدۆزینەوە کە بکرێت بەهۆیەوە فەزیلەت یاخێرە پەسندکراوەکان لە نەریتە فەرهەنگییە جۆرا و جۆرەکان لەگەڵ یەکتردا هەڵبسەنگێنین. فەزیلەتەکانی یۆنانی هۆمیری، یۆنانی ئەفلاتوونی و ئەوروپای مەسیحی لە ڕەگوریشەوە لەگەڵ یەکتردا جیاوازن.

لەم بارەیەوە بەرلین لە تیۆرییەکانی گۆتفرید هێردر (١٧٤٤-١٨٠٣) فەیلەسووفی ئەڵمانی نریك دەبێتەوە. هێردر لە تیۆرداڕێژانی بە ناوبانگی پلورالیزمی فەرهەنگییە. هێردر بەم جۆرە بەڵگە دەهێنێتەوە کە هەر خەڵکێك ئامانجەکان، پێوەرەکان و شێوازەکانی هزریی و شێوازەکانی ژیانی تایبەت بە خۆی هەیە کە تاقانە و تایبەتن. هیچ پێوەرێکی گشتی و ئەزەلی و هەتایی نییە کە بتوانین بە پشت پێ بەستنی کاری بەراورد کردن، هەڵسەنگاندن و ریزبەندی فەرهەنگەکان و دیاریکردنی بەرزی و نزمییان ئەنجامبدەین. یۆنانی یۆنانییە، هیندی هیندییە و ئیرانیش ئیرانییە، جگە لەم ناتوانین شتێکی تر بڵێین.

## پلوراليزم و ليبراليزم

پلوراليزم بە پشتبەستن بە ڕێژەيی بوونی بەهايی و ڕێژەيی بوونی فەرهەنگی لە ليبراليزم دوور دەكەوێتەوە چونكە ليبراليزم پشت بە بنەما گشتييەكان دەبەستێ. بەرلين كە لە سەرەتای كاردا دەيويست تيۆرييەك بۆ پەسندكردنی ليبراليزم ئامادە بكات لە كۆتاييدا گەيشتە ديدگايەك كە بەشێوازی توندڕەوانەی كۆمەڵگاگەرايی (Communitarianism) ناو دەبرێت. كۆمەڵگاگەرايی خاڵی بەرامبەری گشتگەراييە. كۆمەڵگاگەرايی لە شێوازی توند ڕەوانەی خۆيدا لە ڕاستيدا چەمكێك بەناوی مرۆڤ وەك بابەتێكی گشتی پەسند ناكات و لە بری چەمكی گشتی مرۆڤ بۆ نەتەوەكان واتە مرۆڤگەلی سەر بە گرووپ بەندييە كۆمەڵايەتی و ئەتنييە تايبەتەكان دەگەڕێتەوە.

باوەڕبوون بە كۆمەڵگاگەرايی، ڕێژەيی فەرهەنگی و ئەو ئەدگارانەی كە لە ئەتنيك و نەتەوەيەكی تايبەتدا ڕەنگدەدەنەوە لە بەرامبەر هزری ڕۆشنگەريدا رادەوەستێ كە چ لە تيۆری پەيوەست بە ڕێكخستنی سياسی كۆمەڵگاو چ لە ڕێڕەو و ئاراستەی مێژووی مرۆيی پشت بە بنەما گشتييەكان دەبەستێ و باوەڕی پێيەتی. بەرلين ئەم بنەما گشتيانە بە سيماكانی تێڕوانينی مۆنيستی ناودەبات و لە چوار چێوەی عەقڵگەرايی، زانستگەرايی و ئەنجامگەراييدا هێرشدەكاتە سەريان. هەموو ئەم بۆچوونە ڕۆشنگەريانە لەسەر بنەمای باوەڕمەندی بەم بۆچوونە دامەزراوە كە مرۆڤەكان سروشتێكی يەكسانيان هەيە و بۆ ڕێكخستنی كۆمەڵگا دەتواندرێ هەندێ پرەنسيپی گشتی دەستنيشانبكرێت و بۆ سەر لە نوێ دروستكردنەوەی دەتواندرێ پشت بە هەندێ بنەمای گشتی ببەسترێت.

هەر لەسەر ئەم بنەمايە پلوراليزمی بەرلين مەودايەكی زۆری لەگەڵ ليبراليزمی لۆك هەيە كە لەسەر بناغەی پەسندكردنی مافە بنەڕەتييە مرۆييەكان دامەزراوە و



هەروا لەگەڵ ليبراليزمی كانتدا كە لە سيستەمێكی ياسايی يەكگرتوودا ئەخلاقێكی سياسی سازگار وەك بنەمای سيستەمی سياسی لەبەرچاو دەگرێ.

هەرچەندە بەرلين لە لايەكەوە ئازادی بەيەكێك لە بەها بنەڕەتييەكان لەقەڵەمدەدات بەڵام لە لايەكی ترەوە نكۆڵی لەوە دەكات كە بتواندرێ تيۆرييەك لەمەڕ بنەڕەتی مرۆڤ بۆ ئازادی دابڕێژرێت.

پلوراليزمی بەرلين لەگەڵ سوودگەرايی بێنتهام و ميليشدا ناسازگارە، چونكە قوتابخانەی سوودگەرايی هەژماردن و بەراوردی چێژەكان بۆ گەيشتن بە دەرئەنجامێك وەك خێری گشتی بە مەيسەر دەزانێ. بەڵام بنچينەی هزری بەرلين ئەمەيە كە خێرەكان شياوی بەراوردكردن نين و نارێكن (ركابەرن) و هەر بۆيە هەڵسەنگاندنی عەقڵانييان مەيسەر نييە.

## ئەنجامناسی و ئازادی تاكەكەسی

بەرلين تێڕوانينی ئەنجامناسانە و هۆكارێتی مێژووی بە توندی دايە بەر هێرش كە لە بەرزترين فۆرمی خۆيدا لە فەلسەفەی سياسی ڕۆشنگەری شێواز بەنديكراو لە سەردەمی ئەودا سەرچاوەی ڕووداوەكان و هزرە سياسييە دەست ڕۆيشتووەكان بوو. تێڕوانينی ئەنجامناسی هەر فۆرمێكی هەبێت تەوەرەكەی بريتييە لە باوەڕمەندی بە پرۆژەيەكی يەكگرتوو و سەرانسەری بۆ مێژوو و ژيانی مرۆيی. بە زمانێكی ساكارتر، ئەم تێڕوانينە بريتييە لە باوەڕمەندی بەيەك ئامانج وەك گشتێك بۆ هەموو كۆمەڵگاكان و مێژوو. تيۆری ئەنجامگەرا پێگەی هەر شتێك لە نەخشەی گشتی جيهان و ڕەوتی كۆتايی مێژوو (وەك گشتێك) بەديدەكات.

بەرلين ئەم تێڕوانينە بە جۆرە باوەڕێكی سەروو سروشتی لەقەڵەمدەدات و هێرش دەكاتە سەری. بەڕای ئەو ئەگەرچی ئەم تێڕوانينە لە زۆر خاڵدا باس لە ئيعتباری

تۆژینەوەی ئەزموونی زانست دەکات بەڵام لە راستیدا، ئەگەر بمانەوێ بەزاراوە ڤیبەرییەکان قسەبکەین، لەگەڵ ئەفسوون سڕینەوە لە جیهان کە ناوەڕۆکی زانستی مۆدێرن پێك دەهێنێ لە ناکۆکی دایە.

بە بۆچوونی بەرلین تێڕوانینەکە هەڵگری باوەڕمەندییە بە هۆکارێتی مێژووی لە دوو لایەنەوە لەگەڵ تاکگەرایی لە ناکۆکیدایە. یەکەمیان لەو ڕووەوەیە کە بۆ خێرێکی گریمانەیی گەورەتر (بۆ وێنە سۆسیالیزم یا پێشکەوتنی نیشتمانی) پاساو بۆ ئازاری تاکی مرۆیی دەهێنێتەوە. دووهەمیشیان ئەوەیە کە بۆ هەڵبژاردن و لە ئەنجامدا ئازادی تاك پێگەیەکی ئەو تۆ لەبەرچاو ناگرێت. ئەمە لە کاتێکدایە کە بەرلین، هەروەك باسی لێوە دەکەین، پێگەی سەرەکی دەداتە هەڵبژاردنی تاکەکەسی وەك رەنگدانەوەی ئازادی و پرەنسیپی دروستکردنی جیهانی دیاری نەکراو. بەم حاڵەش بەرلین بەڵگەیەکی زۆری نەخستۆتە روو لەمەڕ نادروستی تێڕوانینی ئەنجامناسانە و هۆکارێتی مێژوویی و لە بڕی بەڵگەهێنانەوە بۆ رەتکردنەوەی بنەماکانی، پتر باسی لە زیان و دەرئەنجامەکانی کردووە. یەکێك لەو بەڵگانەی کە بەرلین دژبە ئەنجامناسی و هۆکارێتی هێناویەتی پشتبەستنە بە زمانی مرۆڤ بەو پێیە کاتێك کە دەربارەی ئەنجامدانی ئەم یا ئەو کردارە قسەدەکەین بەشێوەیەکی لاوەکی ئاماژەمان بە توانایی هەڵبژاردن لە لایەن مرۆڤ و لەگەڵ ئەویشدا ئاماژەمان بە ئازادی کردووە. (بە وتەی مەولەوی:

اینکه گویی این کنم یان کنم

خود دلیل اختیاراست ای صنم

واتە: ئەوەی کە تۆ دەڵێی ئەم کارە بکەم یا ئەو کارە، ئەمە خۆی بەڵگەی ئیختیارە ئەی بووت.



## هۆکارێتی مێژوویی، ئازادی پۆزەتیڤ و زیانەکانی

یەکێك لە بەشەکانی تێڕوانینی مۆنیستی (تاکانەگەرایی) و لەگەڵ ئەویشدا بۆچوونی هۆکارێتی مێژوویی تیۆری ئازادی پۆزەتیڤە. بە پێی تێڕوانینی مۆنیستی دەربارەی مێژوو، رەوتی مێژوو یاسامەند و عەقڵانییە و بەرهەڵستکاری لە بەرامبەر ئەم بزاڤە یاسامەندەدا ناعەقڵانییە. لە تێڕوانینێکی لەم جۆرەدا بۆ مێژوو و ژیانی مرۆیی بۆ وێنە لەو شتانەی کە لە تیۆرییەکانی هیگڵ و مارکسدا گوتمان، ئازادی بریتییە لە ناسینی زەروورەت و یاسامەندی مێژوو و کارکردن بەو ئاراستەیە. بەرلین بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەم دیدگایە بەم بۆچوونە کۆتایی پێدێت کە بڵێین ئەوانەی کە زەروورەتی مێژووییان هەستپێکردووە و بەم جۆرە راستییان دۆزیوەتەوە دەبێ رێبەرو سەرداربن بەسەر ئەو کەسانەدا کە نەگەیشتوونەتە ئەم پلەیە. هەر لە ژاکوبنەکانەوە بگرە لە شۆڕشی فەرەنسا تا بەلشفیکەکان لە شۆڕشی رووسیا و لەوێشەوە تەنانەت تا نیشتمانپەروەرانی ئەمڕۆ بانگەشەیەکی لەم جۆرە خراوەتە ڕوو و بەو هۆیەوە دنیای ئێمەیان تووشی جۆرەها توند و تیژیی و پاوانخوازی کردووە. ئەم پاوانخوازیی و توند و تیژیانە هەمان ئەو شتانەن کە زەینی گەلێك لە هزرڤانانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم وەك پۆپەر، ئارنت، ئۆکشات، هایك و گەلێك کەسی تریان بە خۆیانەوە خەریککردووە.

بەرلین دەڵێ ئەم هزرانە بوونەتە دەستاوێزێك بۆ کۆیلەکردن. بەرلین بەشێوازی تایبەت بەخۆی بنیاتەکانی ئەم هزرە تایبەت بەم تیۆرییە دەداتە بەر هێرش کە دەڵێ تێڕوانینی عەقڵگەرایانە تووشی ئەم هەڵە بنچینەییە هاتووەکە وادەزانێ بۆ هەر پرسێك تەنها یەك وەڵامی دروست هەیە، لە کاتێکدا کە وەهانییە. بۆ هەر پرسێك رێگای جۆرا و جۆر هەیە کە هەموویان دەتوانن وەکو یەك دروست بن. هەر هەڵبژاردنێکی ((دروست)) بە ناچار بەواتای وەلاوەنانی هەڵبژاردنێکی ((دروست))ی دیکەیە. ئێمە ناچارین لە نێوان گەلێك لە خێرەکاندا دەستبدەینە هەڵبژاردن و هەر خێرێك هەڵبژێرین ناچارین خێرەکانی تر قوربانی بکەین.





## هەڵسەنگاندنی تیۆری بەرلین دەربارەی پێوەندی چەمکی ئازادی پۆزەتیڤ لەگەڵ پاوانخوازیدا

لێرەدا دەرفەتێکی زۆرمان نییە بۆ ئەوەی ئەو رەخنانە بخەینە روو کە لە بۆچوونی بەرلین گیراون. تەنها بەسەرنجدان بەو شتەی لەسەرەوە گوترا بە ئاماژە پێکردنێك ئەم خاڵە زیاد دەکەین کە گریمانەی سەرەکی بەرلین لەمەڕ فرەیی بەهاکان بە تەنهایی ناتوانێ ببێتە بەڵگەیەك بۆ رەتکردنەوەی ئەو جۆرەها توند و تیژییە کە ئامانجی هێرشی ئەون. چونکە ئەگەر پرەنسیپی فرەیی بەهاکان و نابەراورد بوونیان و لە ئەنجامدا جۆرا و جۆرێتی خودی ئەوان پەسندبکەین ئەوا هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی کە بڵێین توند و تیژی لە رەهەندێکی گشتی تردا پاوانخوازی ناتوانێ بەهایەك بێت لە نێوان بەها جۆرا و جۆرەکانی تردا.

بەوتەیەکی تر تاك یا گرووپی مۆنیست (تاکانەگەرا)یش نیازی بەدیهێنانی خێرێکی هەیە ئەگەر چی بە خێری تاقانە ناژمێردرێ بەڵام بەهاکەی لەگەڵ خێرەکانی تردا بەرامبەرە [٣]. هەر بەم پێیە بەرلین لەسەر بناغەی ئەم زەمینەیە بەشێوەیەکی لۆژیکی ناتوانێ ئازادییە لیبرالییەکان و لەوانەش ((ئازادی نێگەتیڤ)) پەسند بکات.

جگە لەمەش لە نێوان پرەنسیپی خۆ-دەسەڵاتداریی وەك بناغەی تیۆری چەمکی ئازادی پۆزەتیڤ و پاوانخوازی و توند و تیژی پێوەندییەکی زەروور لە ئارادا نییە [٤]. تەنها دەتوانین بڵێین کە تیۆرییە مۆنیستیەکان بە زۆری ئەو ئامانجانەیان خستۆتە روو کە بوونەتە سەرچاوەی ئیلهام یا تێرکردنی هەست و سۆزی گەلێك لە ئامانجخوازە کەم ئەزموونەکان کە لە ئەنجامدا روویان کردۆتە پاوانخوازیی و توند و تیژی. ناتوانین تاوانی ئەم راستییەش بدەینە پاڵ تیۆرییە مۆنیستییەکان.



یادداشتەکان:

١- جان گری، ایزایا برلین، ترجمه خشایار دیهیمی، تهران، طرح نو، ١٣٧٩، ص ٢٠.

٢- حسین بشیریه، تاریخ اندیشه سیاسی درقرن بیستم، جلد دوم، تهران چاپ چهارم، ١٣٨٢، ص ١١١.

٣- مایکل لسناف، فیلسوفان سیاسی قرن بیستم، ترجمه خشایار دیهیمی، تهران، نشر کوچك، ١٣٧٨، ص ٣٤٦.

٤- همان، ص ٣٤٤.

## پاژی چواردەهەم

# میـــــانــــڕەویی

یەکێك لە ڕەوتە هزرییی، سیاسی و ئایدۆلۆژیاییەکان لە ڕۆژئاوا ڕەوتی میانڕەوییە. هزرەکانی بەرەو میانڕەویی لە لایەکەوە لە بەرامبەر هزرەکانی بەرەو سۆسیالیزم و لە لایەکی تریشەوە لە بەرامبەر هزرەکانی پەیوەست بە لیبرالیزمەوە ڕادەوەستن. هەڵبەت هەروەك باسی لێوەدەکەین سنووری میانڕەویی لەگەڵ لە بۆچوونەکانی تەوژمی ڕاستی لیبرالیزمدا هەندێ جار زۆر ڕوون نییە. کەسانێك کە لە دەرەوە سەیری ئەم دوورەوتە هزرییە دەکەن ڕەنگە هەندێ لە تەوژمە هزرییەکانی میانڕەویی لەگەڵ هەندێ لە تەوژمە هزرییەکانی لیبرالیزم لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ بکەن و تووشی هەڵەبن، چونکە نزیکایەتییەکی زۆر لە نێوان ئەولەویاتە سیاسییەکاندا هەیە. بەم حاڵەش لە نێوان دیدگاکانی بووناسانە و بنەماو بۆچوونە بنەڕەتییەکانی لیبرالیزم و میانڕەوییدا گەلێك جیاوازی گرنگ هەن هەرچەندە کە لە ئەولەویاتی سیاسی هەندێ لە تەوژمەکانی ئەم دوو گرووپەدا مەودایەکی زۆریش نەبێت. میانڕەویی بەتایبەت لە بریتانیا شێوازێکی جیاوازی بە خۆوە گرتووە و لەگەڵ ناوی حزبێك (پارتی پارێزگاران) لە پێوەندیدایە و نەریتێکی هزری و سیاسی دیاری بەدیهێنانەوە. ئێمە لەم پاژەدا پاش گۆشەنیگایەك بۆ بنەما تیۆرییەکانی میانڕەویی و خاڵە جیاوازەکانی لەگەڵ لیبرالیزم یەکێك لە بیرمەندانی ئەم ڕەوتە هزرییە لە سەدەی بیستەمتان پێ دەناسێنین بەناوی میخاییل ئۆکشات کە خاوەنی قوتابخانەیەکی شایانی باسکردنە.



## ١- هزری سیاسی میانڕەویی

### میانڕەویی چییە؟

میانڕەویی هەم لە زمانی لاتین و هەم لە بەرامبەر فارسییەکەی لە وشەی پاراستن وەرگیراوە. لە ئەدەبیاتی سیاسی، میانڕەویی بەزنجیرەیەك تیۆری و ئەولەویاتی تایبەتی لەمەڕ گۆڕانکارییە سیاسییەکان دەگوترێ کە ڕەش بینە بەرامبەر بە پرۆژەی بەرزە فڕانە بۆ چاکسازی کردن لە بارودۆخی کۆمەڵگا و دژایەتییان دەکات. میانڕەویی بەرگری لە بارودۆخی باوی ژیان دەکات و پێگەیەکی تایبەتی دەبەخشێ بەو نەریتانەی کە بەهۆی ساڵانێکی دوور و درێژەوە جێگیرکراون. هەڵبەت ڕێزگرتن لە شێوازە باوەکان تەنها ئەولەویەتێکی ئەخلاقی و بەهایی نییە بەڵکو پاساو هێنانەوەی مەعریفەناسی تایبەت بەخۆی هەیە کە ئاماژەی پێدەکەین.

بە زۆری تێڕوانینی میانڕەوانە بەرامبەر بە گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان وەك ڕەهەندی دیاری ئەم ڕەوتە هزرییە لەقەڵەمدەدرێ.

میانڕەویی جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکاتەوە کە هزر و ئایدیالۆژیاکانی تر دەربارەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان پرۆژەی خەیاڵی و نەکردەییان هەیە. گۆڕانکاری خێرا کردەیی نییە و ئەگەر ئێمە بمانەوێ کارێکی لەو جۆرە بکەین سەرئەنجام بە جۆرێك تاوانەکەی دەدەینەوە کە دەستکەوتەکانی پووچەڵ دەکاتەوە. ناتوانین کەموکوڕییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی لەسەر ڕێ هەڵگرین. دروستکردنی بەهەشتی زەمینی مەیسەر نییە.

سامویل هانتنگتۆن لە باسکردنی ئەم ڕەوتە هزرییە دەڵێ کە هەموو هزر و ئایدۆلۆژییەکان خوازیاری بەدەستهێنانی شتێکن (بۆ وێنە دابەشکردنی باشتری سەرچاوە و داهاتەکان لە سۆسیالیزم یا گەشە پێدانی ئازادی لە لیبرالیزم) لە





کاتێکدا میانڕەویی دژ بە گۆڕینی ئۆرگانەکان هوشداری دەدات لە راستیدا بەرگری لە داوا نەکردنی شتێك دەکات[١].

میانڕەوەکان بەرامبەر بە هەر بزاڤێکی نوێ بەد بینن جگە لەو شتانەی کە بە درێژایی ئەزموونی نەوە یەك لە دوای یەکەکان تاقیکراوەتەوە و وەك دۆخی سەقامگیری لێهاتووە.

بەم حاڵەش هەندێ لە شرۆڤەکاران ئەم لێکدانەوە ناسراو و باوە لەمەڕ میانڕەویی بەناتەواو دەزانن و هەندێ دیاریکەری دیکەش، جگە لەو شتانەی گوترا، دەدەنە پاڵ میانڕەویی کە پاشان باسی لێوە دەکەین.

## چۆنیەتی بەرگریکردن لە دۆخی سەقامگیر

دیدگای میانڕەوەکان لەمەڕ دینامیکییەتی کۆمەڵایەتی لە بەرامبەر تێڕوانینی مۆدێرن و بیر و بۆچوونە سەرەکییەکانی رۆشنگەریدا رادەوەستێ. تێڕوانینی مودێرن و بزاڤی رۆشنگەری (رۆشنبیری) بەگەشبینی بەرامبەر بە تێگەیشتن، تواناو عەقڵی مرۆڤ دیاری دەکرێت. ئەو شتەی کە هەندێ جار بە عەقڵی مۆدێرن ناودەبرێت بەم مانایە بەستراوەتەوە کە تاك دەتوانێ بە هەستەکانی خۆی جیهانی دەرەوە بناسێت، لە یاساکانی تێبگات و بە عەقڵ دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مرۆیی هەڵبسەنگێنێ و لە بەرامبەر عەقڵدا وەڵامگۆی بکات. سۆسیالیزم، لیبرالیزم و دیموکراتیزم هەموویان لەم دیدگایەدا هاوبەشن. بەڵام میانڕەویی پشت بە نەریتەکان و دۆخی سەقامگیریی دەبەستێ و لەسەر بنەمای ئەم سێ تێۆرییەی خوارەوە داخوازی گۆڕانگاری رەت دەکاتەوە.



١- تیۆری لادان- میانڕەوەکان دەڵێن ئەو سیاسەتانەی کە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئامانجێکی تایبەتی و گەیشتن بە مەبەستێکی تایبەتی گیراونەتەبەر لە کۆتاییدا دەگەنە ئەنجامێك کە بە تەواوی دژ بە مەبەستەکانی خۆیەتی.

نموونەشی شۆڕشی فەرەنسایەکە بە هۆی توند و تیژی شۆڕشگێڕانەی ژاکوبنەکان و دیکتاتۆری ناپلیون لە ئامانجی خۆی لایدا.

٢- تیۆری ئەنجامنەدانی چاکسازی- ئەم تیۆرییە تەرخانکراوە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ ئەو بۆچوونەی میانڕەوەکان کە دەڵێن هیچ هەوڵ و بەرنامەیەك بۆ گۆڕینی جەوهەری کۆمەڵگا وەك لەناو بردنی ئەو نایەکسانییەی کە دەربارەی دابەشکردنی سامان و دەسەڵات لە ئارادایە ناگاتە ئەنجام. ئەم نایەکسانییانە بۆ هەمیشە دەمێنێنەوە.

٣- تیۆری خۆڵقاندنی مەترسی- بەڵگەیەکی تر کە میانڕەوەکان بۆ بیر و بۆچوونەکانی خۆیان دەیهێننەوە ئەمەیە کە چاکسازی رادیکاڵ تەنانەت ئەگەر ببێتە هۆی گۆڕانکاریش لە کۆتاییدا هەندێ دەرەنجامی وای لێدەکەوێتەوە کە دەستکەوتەکانی هاوسەنگ دەکات. بۆ وێنە میانڕەوەکان لە سەدەی نۆزدەهەم دەیانگوت کە گەشە پێدانی مافی دەنگدان (بۆ وێنە بەخشینی مافی دەنگدان بە ئافرەتان) دەبێتە هۆی تێکدانی بارودۆخی سیستەمی دەستووری.

## ئیدمۆند بۆرک یەکەمین تیۆرداڕێژی میانڕەویی

ئیدموند بورك هزرڤانی بەرەگەز ئیرلەندی بریتانیا لە ناسراوترین تیۆرداڕێژانی میانڕەوییە. ئەو هاوکات لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسادا دەژیا و بە قەڵەم لەگەڵ هزرەکانی شۆڕشی فەرەنسادا کەوتە مشتومڕ. ئەو لە بەرامبەر شۆڕشگێڕەکاندا





بەرگری لە ((رژێمی پێشوو)) کرد. کتێبەکەی ئەو لە ژێر ناونیشانی ((تێڕامانێك لەمەڕ شۆڕشی فەرەنسا)) (١٧٩٠) کۆڵەکانی تیۆری میانڕەویی لە خۆدەگرێت.

ئیدموند بورك لەم کتێبەدا لە بەرامبەر ئەو شتەی کە بە ((بیرکردنەوە ئینتزاعییەکان)) لە تێڕوانین بۆ پرسەکانی بواری گشتی ناودەبرا بە قازانجی کەڵك وەرگرتن لە ئەزموونەکانی رابردوو بەڵگەی دەهێنایەوە. بەڵگەی ئیدموند بورك ئەمەیە کە کۆمەڵگا بەرهەمی گەشەکردنی ئۆرگانیك و کۆبوونەوەی عەقڵی ئەو ئەوانەیە کە ژیانی خۆیان بە فێربوون لە رێگای ئەزموون و هەڵەوە رێکخستووە نەك بەشداریکردن لە کۆڕ و سمینارە فەلسەفییەکان دەربارەی مافی مرۆڤ. سیستەمە سیاسییەکان بۆ دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ وەك خۆراك، پەناگە و فێرکردن بەدیهاتوون نەك سەقامگیرکردنی مافە گشتییەکان. هەر کۆمەڵگایەك پێداویستە سەرەکییە ناوبراوەکان بە شێوازی تایبەتی خۆی دابیندەکات.

ئەو پێشبینی کرد کە داخوازییەکانی شۆڕشگێڕانی فەرەنسا بۆ ئازادی بە دیکتاتۆرییەکی خراپتر لە ((رژێمی پێشوو)) کۆتایی پێدێت. ئەم بۆچوونی بۆرك پێوەندی بە دیدگای ئەو لەمەڕ مرۆڤ یا بە وتەیەکی تر پێوەندی بە بووناسی ئەوەوە هەیە. ئەو دژایەتی ئەم گریمانەیەی ((چەرخی عەقڵگەرایی)) دەکات کە چوارچێوەی زەینی تاکەکەسی دەتوانێ لە بنەماکانی سیستەمی سیاسی دادپەروەرانە تێ بگات. بەڵگەهێنانەوەی ئەو ئەمەیە کە تاکی مرۆیی بوونەوەرێکی بێ توانایە و بە هۆی سروشتی گوناهکارانەی خۆی بە توندی تووشی هەڵخلیسکان دەبێت و پتر لەوەی کە بە عەقڵ بیربکاتەوە ملکەچی خۆپەرەستیەکانی خۆی دەبێ و بەرەو دادوەریکردنی نادروست هەڵدەخلیسکێ. تاك بە جیا لە کەسانی تر ناتوانێ لە ئاڵۆزییەکانی قازانجی گشتی تێبگات. کەوابوو دەبێ عەقڵی تاکەکەسی ئەو لەگەڵ گەنجینەی عەقڵی گەورەی کۆی خەڵك گرێ



بدرێت کە بە درێژایی چەرخەکان کۆبووەتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ پەی بە بەرژەوەندی گشتی ببات. کرداری سیاسی دەرەنجامی عەقڵی کلاسیکی و بە کۆمەڵ و بەرهەمی هاوکاری نەوەکانە. دیدگای بۆرك لەم بارەیەوە لە بەرامبەر لیبرالیزم رادەوەستێ کە پشت بە عەقڵی تاك دەبەستێ و لەو باوەڕەدایە کە کرداری ئازادی تاك و دادوەریکردنی ئەو قازانج بە کۆمەڵگا دەگەیەنێت.

## رەهەندی ناسنامەیی میانڕەویی

هەروەکو ئاماژەی پێکرا میانڕەویی لە هەندێك لە بۆچوون و ئەولەویاتی سیاسی خۆیدا گەلێك رەهەندی هاوبەشی لەگەڵ لیبرالیزم، بە تایبەت لیبرالیزمی کلاسیکدا هەیە. ئەم رەهەندە هاوبەشانە بە تایبەت پێوەندی بە هەڵوێستە سیاسییەکانی میانڕەوانی نوێ لەگەڵ لیبرال کلاسیکەکاندا هەیە. بەڵام هەروەکو گوتمان[٢] بۆ ناسینی قوتابخانە هزرییەکان گەڕانەوە بۆ بووناسی یا جیهانبینی ئەوان (واتە شێوازی تێڕوانینی قوتابخانەیەك بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا) لە هەڵوێست و بۆچوونەکانیان گرنگترە. بە هەرحاڵ میانڕەویی هەم لە رووی جیهانبینی و میتافیزیکی خۆیەوە (تێڕوانینی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا) و هەم لە رووی بۆچوونە سیاسییەکانەوە (جۆری کۆمەڵگای ئیدیال) لە لیبرالیزم جیاوازە.

تێکەڵکردنی سنوورەکانی نێوان میانڕەویی و لیبرالیزم لە سەردەمی ئێمەدا فۆرم و واتایەکی تایبەتی بەخۆیەوە گرتووە، هەر بەو جۆرەی کە جیاوازیی ئەوان لە رووی چەمکەوە بۆ شیکردنەوە سیاسییەکانی ئەمڕۆ گرنگییەکی نوێی پەیداکردبوو. وتەکەی ئێمە ئاماژەیەکە بە وەرچەرخانەکانی دەیەکانی ئەم دواییە لە پێوەندی لەگەڵ رەوتی ناسراو بە تاتچەریزم لە بریتانیا و ریگانیزم لە ئەمەریکا و هەروا جێگیربوونی تیمی بۆشە لە کۆشکی سپی. پرسەکە ئەوەیە کە ئایا ئەو شتەی کە

به هۆی سیاسەتەکانی مارگرێت تاتچەر لە بریتانیا و رۆناڵد ریگان لە ئەمەریکا بە درێژایی دوودەیەی رابردوو روویاندا دەکەونە ناوچوارچێوەی شێوازەکانی میانڕەویی یا لە چوارچێوەی نیۆ لیبرالیزمدا جێگیردەبن. سیاسەتەکانی مارگرێت تاچر و رۆناڵد ریگان وەرچەرخانێکی نوێ بوون لە سیاسەتە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم دوو وڵاتە و جیهانی رۆژئاوادا. ئەم وەرچەرخانە دەبێ بە سەرنجدان بەو نەریتە بخرێتەبەر تێبینی کە بە درێژایی سەردەمی پاش جەنگ لە ئابووری رۆژئاوادا روویاندابوو. لە سەردەمی پاش جەنگ سیاسەتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی رۆژئاوا لەسەر ئەو شتە بنیاتنرابوو کە بە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و ئابووری کینزی ناودەبرا. دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و ئابووری کینزی لەسەر دەست تێوەردانی دەوڵەت بنیاتنراوە کە رێکخستنی ئابووری و پەرەپێدانی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتیدا کە بە شێوازی بیمەی جۆرا و جۆری بێکاری، چارەسەکردن، دیاریکردنی لانی کەمی هەقدەست لەگەڵ بۆچوونە سۆسیال دیموکراتییەکان (کە لەمەو پێش باسمان لێوەکرد) یەکدەگرێتەوە کە لیبراڵە رادیکاڵەکانیش پشتیوانیان لێکردووە.

ئەم سیاسەتانە بە هاتنە سەرکاری پارێزگاران لە بریتانیا و کۆماریخوازان لە ئەمەریکا بە دروشمی گەڕانەوە بۆ بازاڕی ئازاد بە لادەنرا و لەمەو بەدوا لەگەڵ نوێکردنەوەی پێکهاتەی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا[٣] سەردەمێکی نوێ لە گەڕانەوە بەرەو شێوازەکانی بەر لە جەنگ و بنەماکانی گونجاو لەگەڵ لیبرالیزمی کلاسیکدا دەستی پێکرد. گەلێك کەس ئەم شێوازەیان بە نیۆ لیبرالیزم ناساند و ئەم شێوازە بە نیۆلیبرالیزم ناوبانگی دەرکرد. بەڵام هەندێك لە شرۆڤەکاران لەوانەش بیرمەندانی بەرەو لیبرالیزم ئەم ناولێنان و لێکدانەوەیە پەسند ناکەن. جگە لەمەش سەرپەرشتیارانی ئەم سیاسەتانەش خۆیان بە میانڕەو لەقەڵەمدەدەن. بەم جۆرە رەوشێکی ئاڵۆز لە شیکردنەوەی سیاسی و لە رووی چەمکەوە دروستبووە کە باس لە جۆرە سەرگەردانییەك دەکات لە بواری تیۆرییدا.



## میانڕەویی و لیبرالیزمی کلاسیك

ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی ناسازگاریی بزاڤەکانی ئەم دواییە لەگەڵ میانڕەوییدا ئەم تێگەیشتنەیە کە میانڕەویی وەك دیدگایەکی دژ بە گۆڕانکارییە سەرەکییەکان (لەم دوا حاڵەتەدا بە لاوەنانی نەریتی جێگرتووی پاش جەنگ و گەڕانەوەیە بۆ سەرمایەداری سەدەی ١٩) و دژ بە ((یەکلاکردنەوە ئەبستراکتەکان)) (لەم حاڵەتە تایبەتییەدا چەمکی ((بازاڕی ئازادی)) ) ناسراوە. ئەگەر بەم تێگەیشتنە کلیشەییانە پێناسەی میانڕەویی بکەین لەم حاڵەتەدا نابێ گۆڕانکارییە مەزنەکانی دەیەکانی ئەم دواییە لە سیاسەتە ئابووری، کۆمەڵایەتی و تەنانەت دیپلۆماسییەکانی رۆژئاوا بدەینە پاڵ چوار چێوە هزرییەکانی میانڕەویی. بەڵام وادیارە وتەی ئەو شیکارانە دروستبێ کە تێگەیشتنی باو لە میانڕەویی وەك تێڕوانینێکی دژ بە گۆڕان و تەنانەت دژ بە نوێخوازی پەسەندناکەن و هیچ بەهایەکی شیکارانە بۆ ئەم تێگەیشتنە دانانێن. ئەم شرۆڤەکارانە دەڵێن کە میانڕەویی سەرەڕای چەنەبازیی دژ بە گۆڕانکاریی بە مەبەستی پاراستنی نەریتە جێگیربووەکان لە راستیدا دژ بەهەر جۆرە گۆڕانێك نین. چونکە بە کردەوە بینرا کە میانڕەوە نوێیەکان نەریتی جێگرتووی سەردەمی پاش جەنگیان بەلاوە نا. دژایەتی میانڕەوەکان لەگەڵ گۆڕانکاری بەستراوە بە جۆری گۆڕانکارییەکە.

ئەگەر بێت و بۆچوونی ئەم شیکارانە پەسندبکەین ئینجا دەبێ بپرسین کە کاکڵەی سەرەکی هزری میانڕەویی چییە؟ وەڵامەکەی ئەمەیە کە کاکڵەی سەرەکی هزری میانڕەویی باوەڕمەندییە بە نایەکسانی مرۆڤەکان و ئەوەی کە کەمینەیەك رۆڵی رێبەرایەتی کردنی کۆمەڵگایان لە ئەستۆ بێ و زۆرینە سوود لەم بلیمەتییەی کەمینە وەربگرن. جگە لەم سیستەمە میانڕەوەکان هەر سیستەمێك و لەوانەش جێبەجێکردنی پرەنسیپی یەکسانی، دژ بە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا





لەقەڵەمدەدەن. میانڕەوەکان بۆ بەرگریکردن لە تیۆرییەکە خۆیان سێ بەڵگە دەهێننەوە:

١- بەشێوەیەکی سروشتی مرۆڤەکان لە رووی وزە و تواناییەکانەوە جۆرا و جۆرن و هەر پرۆژەیەك بۆ هاوئاستکردنی تاکەکانی کۆمەڵگا یا دروستکردنی کۆمەڵگایەکی بی چین (کە مارکسیستەکان داوای دەکەن) بێهوودەیەو هەر هەوڵێك لە پێناو ئەم ئارەزووە بێ بناغانە لە درێژخایەندا دەبێتە نایەکسانییەکی نوێ.

٢- بەرنامەکانی یەکسانیخوازی پێویستی بە هەندێ کار هەیە کە سەر ئەنجام دەبێتە هۆی پاوانخوازیی و سەرکوتکردنی ئازادییەکان (نموونەی سۆڤیەت).

٣- بوونی زنجیرەی پلەو پایە کۆمەڵایەتییەکان شتێکی خوازراوە چونکە زۆرینە دەتوانێ سوود لە رێبەرایەتی کەمینەی نوخبە وەربگرێت.

ئەم بیر و بۆچوونانە پشت بە لێکدانەوەیەکی تایبەت مرۆڤ و کۆمەڵگا دەبەستن. میانڕەوەکان لە لایەکەوە جەخت لەسەر جۆرا و جۆرێتی مرۆڤەکان دەکەنەوە و پاشان ئاماژە بەبێ توانایی و ((بەد کرداری خۆیی)) مرۆڤ دەکەن و دەگەنە ئەو ئەنجامە کە دەبێ کەمینەیەکی نوخبە کۆمەڵگا رێکبخەن. بەڵام ئەم کەمینە نوخبەیە چ کەسانێکن؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا میانڕەوەکان بەسەر دوو دەستەی سەرەکیدا دابەش دەبن. میانڕەوانی خاوەن خووخدەی ئاریستۆکراتی و میانڕەوانی خاوەن خووخدەی بۆرژوازیی.

میانڕەوانی خاوەن خووخدەی ئاریستۆکراتی وەك ئیدموند بورك باوەڕیان بە جۆرێك ((ئاریستۆکراتی سروشتی)) هەیە. ئەو کەسانەی کە بەوتەی ئەم دەستەیە لە میانڕەوەکان سەربە ((ئاریستۆکرانی سروشت))ن خاوەن زانست، فەزیلەت و عەقڵی



پێویستن بۆ رێبەرایەتی کردنی کاروباری گشتی. ئەمانە سوود لە عەقڵی نەوەیەك لە دوای یەکەکانی مرۆیی وەردەگرن.

بەڵام میانڕەوەکانی خاوەن خووەخدەی بۆرژوازیی ستایشی ئەو تاکە دەگمەنانە دەکەن کە بە لێهاتوویی تاکەکەسی بە پلەکانی زنجیرە کۆمەڵایەتییەکاندا سەردەکەون. ئەمانەش هەمان ئەو بازرگان و بە دەستهێنەرانی سامانن کە خاوەن هەندێ تایبەتمەندی دەگمەنن وەك بەرزەفڕی و بەرچاو روونی و رێبەرایەتی دینامیکی ئەوان ئافرێنەری بەختەوەری گشتییە. زۆرینەی کۆمەڵگا کە خاوەن وزەیەکی کەمترە سوود لە داهێنانی ئەوان وەردەگرێ[٤]. ئەو شتەی کە هەندێ جار بە تاچریزم ناودەبرێت سەربەم گرووپە لە میانڕەوەکانە.

کەوابوو نابێ هاوبەشی وشەکان لە نێوان میانڕەوانی نوێ لەگەڵ لیبرال کلاسیکەکان ئێمە تووشی هەڵە بکات و بێتە هۆی تێکەڵبوونی بابەتەکە. لیبرال کلاسیکەکان چەمکی بازاڕی ئازاد و داهێنانی تاکەکەسی بۆ خەبات دژ بە سیستەمی ئیمتیازات و زنجیرەی پلە و پایە فیۆدالییەکان بە کاردەهێنن، لە کاتێکدا میانڕەوە نوێیەکان هەر ئەم وشانە بۆ بەرگری کردن لە سیستەمی سەرمایەداری لە قۆناغی مۆنۆپۆڵ بوونیدا و بۆ پاساو هێنانەوە بۆ نایەکسانی لە ڕادەبەدەری ئابووری و کۆمەڵایەتی لە چوار چێوەی کۆمەڵگا و جیهاندا بە کاردەهێنن.

یادداشتەکان:

1- Robert Eccleshall, conservatism, in Eccleshall et al political Ideololgies, London-Newyork, Routledge, Third edition 2003, p. 50.

ترجمه فارسی ان از محمد قائد، نشر مرکز، ۱۳۷۵.

۲- فصل اول همین مجلد.

۳- این موضوع، به طور مفصل درکتاب زیرمورد بحث قرار گرفته است.

مانوئل کاستلز، عصر اطلاعات، ترجمه علی پایاو دیگران، تهران، طرح نو، ۱۳۸۰.

4- Robert Eccleshall, Ibid, p. 57.



## پاژی پازدەهەم

## مایکل ئۆکشات، پاساو هێنانەوەی نوێ بۆ میانڕەوی

مایکل ئۆکشات (۱۹۰۱-۱۹۹۰) یەکێك لە تیۆردارێژانی دیاری نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمە. ئەو لە بریتانیا لە دایکبوو و هەموو تەمەنی خۆی لەوێ بەسەر برد ئۆکشات سەرەتا پتر بە فەلسەفە و بە تایبەت بە فەلسەفەی ناسینەوە خەریکبوو. یەکەمین کتێبی ئەو بە ناونیشانی ئەزموون و رەهەندەکانی (۱۹۳۳) سەروکاری لەگەڵ فەلسەفە و میتافیزیکدا هەیە. هەر لە رێڕەوی (فەلسەفەی ناسین)ەوە ئۆکشات بەرەو سیاسەت راکێشرا. کتێبی عەقڵگەرایی لە سیاسەت (۱۹۶۳) یەکەمین نووسینی گرنگی ئۆکشاتە لە بواری سیاسەتدا. ئەم کتێبە ئۆکشات دەکات بە وتە بێژی دیاری میانڕەویی. گرنگترین نووسینی ئۆکشات وتارێکە بەناونیشانی دەربارەی هەڵسوکەوتی مرۆیی (۱۹۷۵). دوا کتێبی ئۆکشات بریتییە لە کتێبی دەربارەی وتارەکانی دیکە (۱۹۸۳).

### ناسین و کردەوە

هزری سیاسی و تیۆری سیاسی ئۆکشات پێوەندییەکی ئۆرگانیکی لەگەڵ تیۆری ناسینی ئەودا هەیە. ئۆکشات لە یەکەمین نووسینەکانی خۆیدا ناسینی مرۆیی بە سەرچاوە گرتوو لە کردەوە لە قەڵەمدا و لە نووسینەکانی دواتری خۆیدا هەڵسوکەوتی مرۆیی و هاوئاراستە لەگەڵ ئەودا هەموو دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مرۆیی بە پێوەندیدار لەگەڵ کردەوە و ناسینی کردەیی لە قەڵەمدا. میانڕەوەیی

ئۆکشاتیش هەر لەم گریمانانەوە هەڵدەهێنجرێت، بەم جۆرە کە بە سەرنجدان بە پێوەندیی ناسین لەگەڵ کردەوەدا، چاکسازی عەقڵگەرایانە وەك بزاڤێکی زەین گەرایانە بە شتێکی نامەیسەر دەژمێردرێ. ئێستا دەبێ ئەم هزرە سەرەکییەی ئۆکشات کە بە کورتی لە چەند دێڕدا باسکران زیاتر روون بکەینەوە. هەروەك ئاماژەی پێکرا، ئۆکشات، کردەوەی سیاسی مرۆڤ بە گشتی لە شیکردنەوەی کردەوەی مرۆیی هەڵدەهێنجێنی. ئۆکشات بەڵگەهێنانەوەی خۆی لەم خاڵەوە دەستپێدەکات کە هەر چالاکییەکی مرۆیی پێویستی بە ناسینەو مرۆڤ لە کاتی کارکردنی لەگەڵ کەسانیتردایە کە ناسین بەدەستدەهێنێ و گەشەی پێ دەدات. ناسین لە هیچ سەرچاوەیەکی تر جگە لە کارکردن بەدەستنایەت. ئەو بە شێوازی فەیلەسووفە ئیدیالیستەکان دووفاق بوونی جیهانی دەرەوە زەین رەتدەکاتەوە.[1] ئۆکشات دەڵێ شتەکانی جیهانی دەرەوە تەنها کاتێك حاڵەتی بابەتیانە بە خۆیانەوە دەگرن و دەبنە راستی کە ببنە بەشێك لە ئەزموونی مرۆیی. ناسین تەنها لە کردەوە و بەهۆی کردەوەوە بەدەستدێت. تەنانەت ناسینی تەکنیکیش کەوا دێتە بەرچاو کە بە کردەوە بە کارهێنانی هەندێ رێسای لە پێش داڕێژراوە تەنها کاتێك بە کاردێت کە لەگەڵ ئەزموونی کردەییدا تێکەڵ ببێت و بەو هۆیەوە چاکسازی تێدابکرێت و تەواو بکرێت. ناسینی کردەیی چ لە رووی کاتەوە و چ لە رووی لۆژیکییەوە لە پێشەوەی ناسینی تەکنیکی دایە. تەنانەت لە گواستنەوەی ناسین لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ئەو شتەی کە رۆڵی سەرەکی هەیە فێرکاری و مەشقکردنی کردەییە نەك رێسای ئینتزاعی. بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی کە دێنە سەر رێی مرۆڤ، دیسان ئەو شتانەی کە گرنگییەکی زیاتریان هەیە ناسینی کردەیی یا بە وتەیەکی تر ناسینی کلاسیکییە.



## نکۆڵی کردن لە سیاسەتی ((عەقڵگەرایانە))

هەروەکو گوتمان عەقڵگەرایی لە سیاسەتدا میراتی رۆشنگەرییە. عەقڵگەرایی لە سیاسەتدا بە سادەترین وتە یانی دەرفەت و ئیدیال بوونی سەرلەنوێ پێداچوونەوەی شێوازە باوەکانی ژیانی سیاسی و سەر لە نوێ دروستکردنەوەی بەپێی نەخشەی وشیارانەو عەقڵی. ئۆکشات هەر لە بنەڕەتەوە نکۆڵی لە جێبەجێ بوونی شتێکی لەم جۆرە دەکات. ئۆکشات هێرشی دەکردە سەر عەقڵگەراکان و دەیوت کە ئەوان لە ناسینی کردەیی و عەقلانی بوونی کاروبارە باوەکان بێئاگان و بە خەیاڵی خۆیان دەیانەوێ سیاسەت بۆ ئاستی زنجیرە رێسایەکی (ئەبستراکت) دابەزێنن کە لە کتێبەکانەوە فێربوونە. عەقڵگەراکان بەم گومانە مەرجەعیەتی داب و نەریت لە بەرامبەر دروستکراوە عەقڵیەکاندا بە شتێکی کەم دەگرن و دەیانەوێ لە هەموو شتێکدا پرۆژەیەکی نوێ بخەنەڕێ. ئۆکشات، وەك ئیدموند بورك پەیڕەویکردنی لە ئابستراکتە تیۆرییەکان لە سیاسەتدا بە ((عەقڵگەرایی)) ناودەبات [2].

بەڕای ئۆکشات، عەقڵگەراکان بەم جۆرە گومانانە تەنها ساویلکەیی خۆیان دەخەنەڕوو، چونکە شتێکی وا لەراستیدا هەر مەیسەر نییە. زانستی سیاسیش وەکو هەر زانستێکی تر لە پێشەوەی کردار نییە بەڵکو لە پاشەوەی کردارە، هەروەك چۆن رێزمان پاش ئەزموونی زمان و رێبەری چێشت لێنان لە پاش ئەزموونی چێشت لێنان سەریانهەڵداوە.

## بەرهەمە نادروستەکانی عەقڵگەرایی

عەقڵگەرایی لە سیاسەت چونکە هەر لە بنەڕەتەوە نادروستە تەنها دەتوانێ بە تێکدانی رەوشەکە و ئاڵۆزکردنی هەموو شتەکان کۆتایی بێت. کەوابوو عەقڵگەرایی جگە لە بەرهەمی نادروست ناتوانێ هیچ شتێك بەرهەمبهێنێ.





شۆڕشەکان، کۆمـۆنیزم، فاشـیزم و دەوڵـەتی خۆشـگوزەرانی لـە بەرهەمـەکانی سیاسەتی عەقڵگەراییین. هەموو ئەم سیاسەتانە دابـڕان لـە نـەریت و پـشت تـێ کردنیەتی.

لەبەر چاونەگرتنی ناسینی کردەیی نەوەکان و ئەو نەریتانەی کە پشت بە ناسینی کردەیی دەبەستن جگە لە پاشاگەردانی و ناڕێکوپێکی هیچ بەرهەمێکی تری نییە. چونکە هەرکەسێك کە چرای نەریت بە لاوە بنێ بە ناچار دەبێ بە ناو تاریکیداریێ بکات و هەموو شتێك لەسەر ڕێگای خۆیدا پێشێلبکات. ئۆکشات لە بری عەقڵگەرایی بەرگری لە نەریت دەکات. نەریت شتێکە کە بە درێژایی زەمەن و لەسەر بناغەی کردار و بەشێوەیەکی ناوشیارانە دەقی گرتووە. ناسینی کردەیی یائەو ناسنیەی کە لە نەریتیدا ڕەنگدەداتەوە شتێك نییە کە فێربکرێت بەڵکو وەك زمانی زگماك هەموو کەس بەکاری دەهێنێ بێ ئەوەی کە ڕێزمانەکەی فێرببێت یا تەنانەت سەرنجیشی بداتێ. بیرو بۆچوون و لێکدانەوەی لەم جۆرەیەکە ئۆکشات دەخاتە ریزی میانڕەوەکانەوە. بەم حاڵەش میانڕەویی ئۆکشات لە چەند لایەنی گرنگەوە لەگەڵ میانڕەویی پێشینان و لەوانەش میانڕەویی ئیدموند بورك جیاوازە. میانڕەوەکانی پێشوو جەختیان لەسەر پیرۆزی نەریت دەکردەوە. بەڵام ئۆکشات نەریت وەك زگماك هەڵدەسەنگێنێ کە چۆنیەتی وتن بە ئێمە فێردەکات نەك ئەوەی کە چی بڵێین. ئۆکشات بەپشت بەستن بە نموونەیەك دەڵێ نەریت وەك ئامێرێکی مۆسیقایە کە ئێمە پێی دەژەنین نەك ئەو ئاهەنگەی کە دەژەنرێت[٣]. هەر بۆیە ئۆکشات لە هەندێ روو و لە هەندێ بواردا گۆشە نیگایەکی بەرەو لیبرالیزمیش هەیە.

لە راستیدا دەبێ ئۆکشات لە ریزی میانڕەوانی نوێ دابنێین کە لە میانڕەوانی پێشوو جیادەبێتەوە.



## هەڵسوکەوتی مرۆیی و دامەزراوە مەدەنییەکان

ئۆکشات لە وتارە بە ناوبانگەکەی خۆیدا دەربارەی هەڵسوکەوتی مرۆیی بەشێوازێکی فەلسەفی گریمانە و تایبەتمەندییەکانی پەیوەست بە هەڵسوکەوتی مرۆیی دەداتە بەر لێکۆڵینەوە و لەوێوە دەگاتە بناغە و پێداویستی دامەزراوە مەدەنییەکان و شێوازی وێناکراو و ئیدیالی ئەو دامەزراوانە. ئۆکشات باسەکەی لێرەوە دەستپێدەکات کاتێك مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا دەژین لەگەڵ یەکتردا دەچنە ناو هەندێك پێوەندییەوە کە نە بەڕێکەوتە و نەلەسەر بنەمای مامەڵەیە.

ئەم پێوەندییانە لەسەر بنەمای نۆرمەکانە. نۆرم بریتییە لە کۆمەڵێك لە تێبینییەکان، ڕێبازەکان داب و نەریت و ڕێساکان کە بەهەندێ بڕیاری گشتی ڕەهەندە هەمەکییەکانی ژیانی هاوبەش دیاری دەکەن. مرۆڤەکان هەڵسوکەوتی خۆیان بەپێی ئەم نۆرمانە ڕێکدەخەن کە لە پێشەوەی ئەوان و کرداری ئەوانە و بەسەر ئەواندا زاڵە. ئەم نۆرمانە هەمەکین و تەنها ڕێساکانی گشتی هەڵسوکەوت دەخەنەڕوو. بۆ وێنە بڕیار دەدەن لەسەر پێویستی راستگۆبوون یا دروستکاربوون بەبێ ئەوەی کە بڵێین لە فلان حاڵەتی تایبەتیدا دەبێ چۆنی بجوولێینەوە. ئەم نۆرمانە لە هەمانکاتدا لەناو ناخی کردار و ئەزموون لە جووڵەدان نەك ئەوەی کە پرەنسیپێکی ئینتزاعی بن لە دەرەوەی ڕەوتی کردار و بەسەر کرداردا باربکرێن.

نۆرمەکان دەتواندرێ بەسەر دوو دەستەی نۆرمە ئیعتبارییەکان و نۆرمە ئەخلاقییەکان دابەش بکرێن. نۆرمە ئیعتبارییەکان ئەوانەن کە بۆ بە دەستهێنانی ئامانج و مەبەستێکی دیاریکراو دروستکراون و ناوەڕۆکی ئامرازییان هەیە. وەك ڕێساکانی هاتووچۆ، کاتەکانی کارکردن لە فەرمانگەکان، ڕێساکانی ناو سوپا، کارگە و هتد. بەڵام ئۆرمە ئەخلاقییەکان ناوەڕۆکێکی جیاوازیان هەیە، بەو واتایەکە بۆ ئامانج و مەبەستی دەرەکی نییە.ئەوان ڕەنگە سوود بەخشیش بن وەك راستگۆیی کە لە هەمانکاتدا ستراتیژییەکی دروستیشە کە بە گشتی بۆ ئامانجیش سوود بەخشە، بەڵام بە هۆی سوود بەخش بوونیان پەیڕەوییان لێناکەین.





کۆڕو کۆمەڵە جۆرا و جۆرە مرۆییەکان لە بچووکترینیانەوە وەك کارگە و کۆمپانیاوە بگرە هەتا گەورەترینیان وەك دەوڵەت لەسەر بنەمای ئەم دوو جۆرە نۆرمە (نۆرمی ئیعتباری و نۆرمی ئەخلاقی) شکڵیانگرتووە. کۆمەڵە یا ئەنجوومەنە ئیعتبارییەکان بۆ تێرکردنی هەندێ خواستی دیاریکراو دروستدەبن. وەك قوتابخانە بۆ خوێندن یا سوپا بۆ بەرگریکردن یا سەندیکا بۆ بە دواداچوونی بەرژەوەندییە پیشەییەکان.

ئەو کۆمەڵانەی کە بەم جۆرە دروستدەبن بە کۆمەڵەکانی ((بدە و بستێن)) ناودەبرێن. ئەو کۆمەڵانەی کە لەسەر بنەمای نۆرمە ئەخلاقییەکان دروستدەبن بە کۆمەڵی نۆرم-بناغە یا ((کۆمەڵی مەدەنی)) ناو دەبرێن. کۆمەڵی مەدەنی بە هۆی پەسندکردنی دەسەڵاتی نۆرمە هاوبەشەکانەوە دروستکراون نەك بۆ ئامانجێکی هاوبەش. تەنانەت ئاسایشیش ناتوانێ ببێتە ئامانج کە (وەك هۆبز دەڵێ) کۆمەڵی مەدەنی بۆ ئەو ئامانجە دروستبووە.

ئۆکشات لەسەر بنەمای ئەم بەڵگە هێنانەوەیە هەر لە سیستەمی سۆسیالیستەوە بگرە هەتا دەوڵەتی خۆشگوزەرانی (کە لەسەردەمی خۆیدا باوبووە) دەداتە بەر رەخنە، چونکە ئەم دەوڵەتانە هەندێ ئامانجیان بۆ کۆمەڵی مەدەنی خۆیان هەڵبژاردووە و هەوڵی خۆیان لەم پێناوەدا بەکاردەهێنن.

ئۆکشات سەرجەم دەوڵەتی مۆدێرن دەداتە بەر رەخنەیەکی توند و تیژ و بە زیندە خەونێك لەناو وشیاریدا باسی لێوەدەکات. دەوڵەتی مۆدێرن لە رەهەندە نیشتمانییەکەوە بگرە هەتا رەهەندە گەشە خوازییەکەی یەکگرتوویەکی لە ئامانجدا هەیە کە بوونی دەرەکی نییە و ناتوانێ راستییەکی دەرەکی بێت. ((دادپەروەری دابەشکراو)) کە ئەمڕۆ گەلێك لە دەوڵەتان بە دوایدا دەچن جدیترین هەڕەشەیە بۆ سەر ((کۆمەڵی مەدەنی)).





ئۆکشات دەڵێ کە کۆمەڵی مەدەنی بۆ مەبەستێکی تایبەتی دروستنەکراوە. لەم کۆمەڵەدا هەر کەسێك بە دوای مەبەستی تایبەتی خۆیدا دەگەڕێت. ئەگەر کۆمەڵی مەدەنی بۆ مەبەستێکی تایبەتی دروستکرابا لەم حاڵەتەدا دەبووە کۆمەڵێکی ئیعتباری کە بەگەیشتنی ئەو کۆمەڵەیە بە ئامانجی خۆی بەشێوەیەکی سروشتی هەڵدەوەشایەوە. بۆ وێنە کۆمپانیایەك کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەتی دروستکراوە بەگەیشتن بەو ئامانجە هیچ بەڵگەیەك بۆ مانەوەی نامێنێتەوە. کۆمەڵی مەدەنی بە یەکەی بنەڕەتی سیستەمی سیاسی دادەنرێت. دەوڵەت، یا ئەو شێوازەی کە ئێمە ئەمڕۆ بۆ بەرزترین کۆمەڵی مەدەنی دەیناسین، بەشێوەیەکی لۆژیکی لە تیۆری ئۆکشات دەبێ لەو ئەندامانە پێکبێت کە هەریەکەیان بە دوای شادمانی خۆیاندا دەگەڕێن لە کاتێکدا کە یاسا پێوەندییەکانی نێوانیان رێکدەخات. یاسا لەو شێوازەی کە ئۆکشات مەبەستیەتی بۆ ئەوە نییە کە ئامانجێك بەسەر کۆمەڵی مەدەنیدا بسەپێنێ، بۆ ئەوە نییە کە ئازادی ئەوان بەرتەسك بکاتەوە یا شتێك بەسەر ئەواندا بسەپێنێ.

یاسا تەنها هەلومەرجی گشتی هاتوچۆی ئازاد بۆ ئەندامانی کۆمەڵی مەدەنی دەستەبەر دەکات. ئەندامەکان لە ژێر ئەم هەلومەرجە یا لەژێر ئاڵای یاسادا ئازادانە لەگەڵ یەکتردا دەچنە ناو گرێبەست و رێککەوتنەوە (کە گوتمان دەکەونە ناو چوارچێوەی کۆمەڵە ئیعتبارییەکانەوە). حکوومەت تەنها ئەو رێسایانە جێبەجێدەکات کە ئەکتەرەکان پەسندیان کردووە نەك ئەوەی کە خۆی یاسایەك بۆ ئەکتەرەکان دابنێت. ئۆکشات لێرەدا دەگاتە هەمان ئامانجی حکوومەتە سنووردارە کلاسیکییەکان.

ئەو ئەندامانەی کە لەم کۆمەڵە مەدەنییەدا دەژین ئازادن چونکە بە کارکردنەوە خەریکن وکارکردنیش پێویستی بە پێوە خەریکبوونی هۆشمەندانە و هەڵبژاردن هەیە.





## نەریتی رەخنەی عەقڵانی

دەبێ تائێرە ئەوە روون بووبێتەوە کە ئۆکشات لە بری سیاسەتێکی بنیاتنراو لەسەر عەقڵگەرایی و سیاسەتێکی دامەزرێنەرانە بەرگری لە سیاسەتێکی بنیاتنراو لەسەر نەریت (کە پشت بە تەنها ناسینی مومکین واتە ناسینی کردەیی دەبەستێ) دەکات. لە لایەکی ترەوە ئۆکشات ئەم خاڵەش پەسنددەکات کە نەریت نەگۆڕنییە و لەبەردەم ئەگەری گۆڕاندایە. بە پەسندکردنی ئەم راستییە ئەم گرفتە و ئەم پرسیارە دێتە پێشمان کە ئێمە چۆن دەتوانین یەکتر خوێندنەوەیەك لە نێوان سیاسەتێکی دیاریکراو و نەریت دەستنیشانبکەین. لێرەدا هەندێ لە رەخنەگران گرنگترین تێزی ئۆکشات بەلێڵ دەبینن کە دەکرێ راڤە و لێکدانەوەی جورا و جۆری بۆ بکرێت. لەم بارەیەوە ئۆکشات نموونەیەکی هەیە کە رەخنەگران پەنجە لەسەر نادروستبوونی دادەنێن. ئۆکشات بۆ پاساو هێنانەوە بۆ مافی دەنگدانی ئافرەتان و گونجانی لەگەڵ نەریتدا بەم جۆرە بەڵگە دەهێنێتەوە کە چونکە ئافرەتان بەگەواهیدانی ئەزموون و بەکردەوە لە بوارەکانی تردا بوونەتە خاوەنی مافی دەنگدان ئەوا دەبێ لە بەرێوەبردنی وڵاتیشدا دان بە مافی دەنگدانیاندا بنرێت. ئەم بەڵگەهێنانەوەیە دەکرێ رەخنەی لێ بگیرێت. بەم جۆرە کە بپرسین ئەگەر پێویستی هاو ئاهەنگی لە نێوان دوو پرس واتە بوونی مافی دەنگدان لە هەندێ بوار و نەبوونی لە هەندێ بواری تر لە ئارادایە، بۆچی بۆ ئەم هاوئاهەنگییە نابێ لە بوارەکانی تر مافی دەنگدان لە ئافرەتەکان وەربگیرێتەوە[٤].

خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە تاوانبارکردنی عەقڵگەرایی بەناوی نەریتەوە لە لایەن ئۆکشات لەگەڵ ئەم رەخنە گرنگە بەرەورووەدەبێتەوە کە خودی عەقڵگەرایی لە رۆژئاوا بووەتە نەریتێك کە دەتوانین بە ناوی نەریتی عەقڵگەرایی باس لێوەبکەین. پۆپەر ئەم نەریتە بە رەخنەگرتنی عەقڵانی نەریت ناودەبات. پێویستە بگوترێ کە شیکردنەوە بە ناوبانگەکەی ڤیبەر لە عەقڵانی بوون باس لەوە دەکات کە ئەم رێباز



و تێڕوانینە لە رۆژئاوا بۆ خۆی بووەتە نەریتێك. خودی ئۆکشاتیش باس لە هەمەگیربوونی عەقڵگەرایی لە جیهانی مۆدێرندا کردووە و سکاڵای لێکردووە. کەوابوو دەتوانین عەقڵگەرایی نەك بە نکۆڵی لێکەری نەریت بەڵکو بە درێژە پێدەری لۆژیکی ئەو لە قەڵەمبدەین، و ئەگەر وەك ئۆکشات دەڵێ عەقڵگەرایی خراپ بێت ئەوا لەم حاڵەتەدا بە لانی کەمەوە یەکێك لە نەریتە رۆژئاواییەکان خراپەیە.

**یادداشتەکان:**

١- بیخوبارخ، متفکرین سیاسی معاصر، ترجمە منیر سادات مادرشاهی، تهران، نشر سفیر، ١٣٧٩، ص ١٤٧.

2- Robert Eccleshall, opcit, p. 52.

٣- حسین بشیریە، تاریخ اندیشە سیاسی درقرن بیستم، جلد دوم، لیبرالیسم و محافقە کاری، تهران، نشرنی، ١٣٨٢، ص ٢٧٧.

٤- مایکل لسناف، فیلسوفان سیاسی قرن بیستم، ترجمە خشایار دیهیمی، تهران، نشر کوچك، ١٣٧٨، ص ٢٠٠.